# داستانی یاوەران

بەشی پێنجەم

ئامادەکردنی

باوکی عبدالله

٢٠٠٠ ١٤٢٠



قال رسول الله ﷺ

## ( الجهاد ماض الى يوم القيامة )

## واته:
## جیهاد دەمێنێ تاكو ڕۆژی قیامەت

منتدى اقرأ الثقافي

*www.iqra.ahlamontada.com*

## (٨١)

# سـەلمانی فارسـی

## گەڕۆك بەدوای ڕاستی

ئەمجارەیان ڕوو دەکەینە وڵاتی فارس، باسی قارەمانێك دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی خۆی دادەنێ و ڕێزی لێدەنێ...

بەڵێ قارەمانێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی سەربازی پێدەکاو بیروڕاکەی پەسند دەکا، بەمە ئەم یاوەرە بەڕێزە گەورەترین ویسامی سەربازی لە مێژووی ئیسلام تۆمار دەکا... هەر لەم کاتەش پێغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی نیگاوە ڕایدەگەیەنێت کەوا سنووری دەوڵەتی ئیسلام هەتاکو کۆتایی سنوورەکانی وڵاتی فارس درێژ دەبێتەوە، هەروەك موسڵمانان لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەطاب خوا لێی ڕازی بێت- بە چاوی خۆیان بینیان چۆن شارەکان و کۆشكو تەلارو قەڵاکانیان کەوتە بەردەست...

ئەم ڕوداوەش لە ڕۆژی خەندەق بوو، لە ساڵی پێنجەمی کۆچی، کاتێك جولەکە ئەفرین لێکراوەکان نێردراوی خۆیان ڕەوانەی مەککە کرد بۆ ئەوەی بۆ جاری کۆتایی ڕەگو ڕیشەی دەوڵەتی ئیسلامی لەبن دەربهێنن...

ئەمەبوو پیلانی جەنگیان واداتا، کەوا سوپای قوڕەیش و غەگفان لە دەرەوە هێرش بێنن و، ئەوانیش لە ناوەوە هێرشیان بۆ بکەن، بۆ ئەوەی موسڵمانان بخەنە نێو دوو بەردی ئاش و بیانهاڕن، بەم جۆرە موسڵمانان لەناکو بینیان سوپایەکی بێژمارە لە سەربازو کەرەستەی جەنگی دەورەیان گرتن...

بیست و چوار هەزار شەڕکەر لەژێر سەرکردایەتی (ئەبوسوفیان و عینیەی کوڕی حصن) دەورەی شاری مەدینەیان دا بۆ ئەوەی کۆتیای بە موحەممەدو ئایینەکەی و یاوەرەکانی بهێنن.

ئەم سوپایەش تەنها بریتی نەبوو لە سوپای قوڕەیش، بەڵکو هەموو هۆزو ئەوانەی تیا بوو کەوا دەیابینی ئیسلام مەترسی هەیە لەسەریان.

ئەم هەوڵدانەشیان کۆتا کۆششیان بوو دوژمنانی ئیسلام هەوڵیان بۆدا..

بەم جۆرە موسڵمانان خۆیان لە مەترسیترین شوێن بینەیەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ یاوەرەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی ڕاوێژیان پێبکات..

لێرەدا پیاوێکی باڵابەرزی، پرچ درێژ هاتە پێشەوە کەوا جێگای ڕێزو خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

چووه سەر گردێکی بڵندو بە چاوە تیژەڵۆکانی سەیرێکی شاری مەدینەی گەمارۆدراو سوپا بێژمارەکەی کرد...بینی لە نێوان دوو بڵندایی دۆڵێکی فراوان هەیە، لەم شوێنە دەتوانن خۆیان تیا حەشار بدەن‌و پارێزگاری لە خۆیان بکەن...

لەبەرئەوەی (سەلمان) لە وڵاتی فارس فێری زۆر فێڵ‌و پیلانی سەربازی ببوو، چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەم پیلانە سەربازی‌یەی کەوا عەرەب لەمەوپێش لە جەنگەکانیان نایان بینیبوو... ئەمەش بریتی بوو لە خەندەقێك لە دەورەی شاری مەدینە.

ئەنجامی جەنگەکەش ئەوەبوو ماوەی مانگێک گەمارۆی شاریان دا بەبێ ئەوەی بتوانن پێ‌بنێنە ناو شار... تاکو خوای گەورە شەوێکیان ڕەشەبایەکی توندی بۆ هەڵکردن‌و خیوەتەکانیان لە ڕەگ‌و ڕیشەوە هەڵکەنا... ئەبو سوفیان فەرمانی بە سەربازەکانی خۆی کرد بە گەڕانەوەیان بۆ شاری مەککە...

لە کاتی هەڵکەندی خەندەق (سەلمان) شوێنی خۆی گرتبوو، لەگەڵ یاوەرەکانی چاڵیان هەڵدەکەند، پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵیان بوو بە بیورەکەی خۆڵی هەڵدەکەند، لە شوێنێك لەم شوێنانەی (سەلمان) لەگەڵ یاوەرەکانی کاری دەکرد، تووشی بەردێکی گەورە هاتن...

لەگەڵ ئەوەی سەلمان یاوەرێکی لەش بەهێز بوو ئازا بوو، بیورەکەی ڕاوەشاند بە بەردێك کەوت پڕوشکی ئاگرینی فڕێدا، بەڵام ماندووبوون بەرامبەر ئەم بەردە بێ‌هوودە بوو و، بە هەموویان نەیانتوانی لە شوێنی خۆی بجوڵێنن..

سەلمان چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ...

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سەلمان هاتن بۆ لای بەردەکە بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی بینینێت.. کاتێك بەردەکەی بینی، داوای بیورەکەی کرد، بە یاوەرکانی گووت کەمێك دوور بکەونەوە لە مەترس ووردە بەرد...

ناوی خوای لێ‌هێناو، بە هەردوو دەستە پیرۆزەکانی لەگەڵ بیورەکەی بڵند کردەوە بەهێزو توانای خۆی لە بەردەکەی‌دا، دەنگ‌و سەداو ڕوناکی‌یەکی بەهێزی لێ‌بڵند بوو...

(سەلمان) دەڵێت بینیم ڕووناکی دەورەی شاری مەدینەی ڕووناکی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ دەنگی لێ‌بڵند کردو فەرمووی:-

((الله اکبر... اعطیت مفاتیح فارس، ولقد اضاء لي منها قصور الحیرة، ومدائن کیسری، وأن امتي ظاهرة، علیها))...

واتە:- الله اکبر ... کلیەکانی ڕۆمم درا دەست‌و، کۆشکە سوورەکانم بۆ ڕووناك بۆوە، ئومەتی من بە سەریدا زاڵ دەبن.

پاشان بۆ جاری سێ‌یەم بیورەکەی وەشاندەوە، بە ئاسانی لەبن‌و بۆتکەوە هەڵیتەکاندو بەهۆی لێدانە بەهێزەکەی ڕووناکی لێ‌بڵندبوو، پێغەمبەر و یاوەرەکان لە

تەهلیلەیان داو، پێی ڕاگەیاندن کەوا کۆشکەکانی سوریا و صەنعای بینی و موسڵمانان پاش ماوەیەکی‌تر ئاڵای شکۆداری ئیسلامی لێ‌بەرز دەکەنەوە...

ئیتر بەم جۆرە خوای گەورە تەمەنی سەلمانی درێژ کردەوە تاکو ئەم ڕاستیانەی هەر هەمووی بە چاوی خۆی بینی، بینی چۆن میللەتەکەی لە ئاگرپەرستی و خاچپەرستیەت دەگەڕێنەوە و خۆیان بە باوەشی بەزەیی ئیسلام دادەدەن، ئینجا لێرەدا پرسیارێك هەیە ئایا سەلمان چۆن نازناوی (گەڕۆك بە دوای ڕاستی‌دا)ی لێ‌نراوە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ڕوو دەکەینە خودی سەلمان و با چیرۆکی ئەم وتەیەمان بۆ بگێڕێتەوە، ئایا چۆن توانی ئەم هەموو وڵاتە ببڕێ و بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ ؟!!!

سەلمان خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:-

من گەنجێکی فارس بووم لە خەڵکی (إصبهان)، لە گوندێك بەناوی (جەیّان)، باوکم گەورەی گوندەکە بوو، لە هەموویان پایەبەرزتر و دەوڵەمەندتر بوو...

من خۆشەویسترین دروستکراوی خوابووم لە لای ئەم لەم ڕۆژەی لەدایك بووم، سات لە دوای سات خۆشەویستی منی بۆ زیاتر دەبوو، منی لەماڵەوە وەکو ئافرەت بەند کردبوو لە ترسی ئەوەی نەوەکو ئازارێکم پێ‌بگات.

بەڕاستی بۆ ئاگرپەستی تێدەکۆشام، تاکو بە بەردەوامی بەرامبەر ئاگر دەماوەوە کەوا دەمانپەرست، هەروەها کاری ئاگریان پێ‌سپاردم بۆ ئەوەی بۆ کاتژمێرێکیش لە شەو و ڕۆژ نەکوژێتەوە.

باوکم زەوی‌وزارێکی زۆری هەبوو و بەروبومێکی زۆری دەهات، باوکم سەرپەرشتی کارەکانی دەکرد و بەروبوومەکەی کۆدەکردەوە...

جارێکیان باوکم خەریك بوو بە کارێك بۆ گوندێك، پێی گووتم:- ئەی کوڕم، هەروەك دەبینی چۆن بەم زەوی‌و زارە خەریکم، تۆ بڕۆ بۆ سەری‌و لە شوێنی من ئەم کارە بکە، دەچووم بە نیازی زەوی‌وزارەکە، کاتێك لە ڕێگادا بووم بە لای کەنیسەیەك لە کەنیسەی فەلەکان دا ڕۆیشتم، گوێم لە دەنگیان بوو لە ناو کەنیسەکەیان نوێژیان دەکرد بەمە سەرنجی ڕاکێشام.

لەگەڵ ئەوەی من هیچم نەدەزانی لە کاری فەلەکان و ئایینەکانی‌تر، لەبەرئەوەی باوکم نەیدەهێشت تێکەڵی خەڵك ببم، کاتێك گوێچم لە دەنگێکیان بوو و لێیان چوومە ژوورەوە بۆ ئەوەی بزانم چی‌دەکەن، کاتێك تێم ڕوانین نوێژەکانیان سەرنجی ڕاکێشام و حەزم لە ئایینەکەیان کرد، سوێند بەخوا وازم لێ‌نەهێنان تاکو ڕۆژئاوابوون نەچوومە سەر زەوی‌یەکەی باوکم...

پاشان پرسیارم لێ‌کردن گووتم:- ئایا سەرچاوەی ئەم ئایینە لە کوێیە؟ گووتیان: لە وڵاتی شامە.

کاتێك شەوم بەسەرداهات گەڕامەوە ماڵەوەو بە باوکم گەیشتم و پرسیاری لێ‌کردم چیم بۆ کردووە!! گووتم:- ئەی باوکە من بەلای خەڵکانێك دا تێپەڕیم لە کەنیسە نوێژیان دەکرد ئایینەکەیان سەرنجی ڕاکێشام ، ئەوا هەر لە لایان مامەوە تاکو ڕۆژئاوا بوو، باوکم زەندەقی لەم کارەم چوو و گووتی:-

ئەی کوڕم :- چاکە لەم ئایینە نیە، ئایینی تۆو باپیرانت لەم ئایینە چاکترە...

گووتم:- نەخێر-سوێند بەخوا- ئایینی ئەوان لە ئایینی ئێمە باشترە، باوکم لە قسەکانم ترسا، لەمە ترسا لە ئایینەکەم هەڵگەڕێمەوە لەبەرئەوە لە ماڵەوە بەندی کردم و زنجیرەی لە پێیەکانم خست...

کاتێك هەلم بۆ ڕەخسا ناردومە لای فەلەکان پێم گووتن:- ئەگەر کاروانێك ڕێککەوت بڕوات بۆ وڵاتی شام ئاگادارم بکەنەوە، ئەوەندەی نەبرد کاروانێك پەیدابوو دەڕۆیشت بۆ شام ئەوانیش وەڵامیان بۆ ڕەوانە کردم، فێڵێکم بینیەوە خۆم لە کۆتەکە کردەوەو، بە نهێنی لەگەڵیان بەڕێکەوتم بۆ وڵاتی شام...

کاتێك گەیشتم بە وڵاتی شام، گووتم:- کێ باشترین پیاوتانە لەم ئایینە؟ گووتیان:- شوانی کەنیسە (ئوسقۆف)، چوومە لای‌و گووتم:- من حەز دەکەم بێمەناو ئایینی فەلە، ئینجا حەز دەکەم بێمە لات‌و خزمەتت بکەم و لێت فێر ببم‌و خواپەرستیت لەگەڵ بکەم...

ئەویش گووتی:- وەرە بۆ لام، چوومە لای‌و خزمەتم کرد.

پاش ئەوەی لە لای مامەوە زانیم ئەم پیاوە پیاوێکی خراپە، فەرمان بە شوێنکەوتووەکانی دەکا بە بەخشینی خێرو صەدەقەو مزگێنی دانیان بە چاکەدانەوە، کاتێك شتێکیان پێ‌دەبەخشی بیدا لە ڕێگای خوا، ئەو بۆ خۆی گلی دەدایەو هیچ شتێکی لێ‌ی نەدەدا بە هەژاران تاکو حەوت گۆزەی گەورەی زێڕ کۆکردەوە، منیش زۆر قینم لێ‌ی هەڵدەگرت، کاتێك ئەوەم لێ‌ی بینی، پاشان ئەوەندەی نەبرد مرد، فەلەکان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بە خاکی بسپێرن پێم گووتن:-

هاوڕێکەتان پیاوێکی خراپ بوو فەرمانی بە ئێوە دەدا بە خێرو صەدەقە، کاتێك بۆتان دەهێنا بۆ خۆی گلی دەدایەوە، هیچ شتێکی لێ نەدەدا بە هەژارو موستەهەقان.

گووتیان:- پێمان نیشان بدە، شوێنەکەیان بینی و حەوت جەڕەی گەورە زێڕو زیویان دەرهێنا، کاتێك بینیان گووتیان:- سوێند بە خوا بەخاکی ناسپێرین، پاشان لە داریان داو بەردبارانیان کرد...

لە دواییدا ئەوەندی پێ‌نەچوو پیاوێکی تریان لە جێگەی دانا لای مامەوە، هیچ پیاوێکم نەبینی لە دونیا وەکو ئەو پیاوە وازی لە دونیا هێنابێ‌و، مەبەستی ڕۆژی دوایی بێت و، ئەوەندە بە خواپەرستی ماندوو بێت بە شەو و بە ڕۆژ، ئەم پیاوەم زۆر خۆشویست، ماوەیەك لەگەڵی مامەوە، کاتێك مردنی لێ نزیك بۆوە پێم گووت:- ئەی

فلان وەسیەتی کێ دەکەی و ئامۆژگاریم بکی بۆ ئەوەی لە دوای تۆ لەگەڵی بم؟ گووتی:- ئەی کورم ، کەس ناناسم وەکو من بێت تەنها پیاوێك نەبێت لە موسڵ، پیاوێکە نەدەگۆڕێ و نە خوار دەکاتەوە هەقی لە لایە.

کاتێك هاوڕێکەم مرد گەیشتمە پیاوەکە لە موسڵ، کاتێك چوومە لای مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوەو پێم گووت:-

فلانە کەس لە کاتی مردنی وەسیەتی کردم بکەم بە تۆو هەواڵی دایمێ کەوا تۆ پابەندی بەم ڕاستی‌یەی کەوا لەلای تۆیە، ئەویش گووتی:- لە لام بمێنەوە، منیش لە لای مامەوە لە باشترین بار ئەوم بینیەوە...

پاش ئەوەی ئەوندەی نەبرد ئەویش مرد، کاتێ مردنی بۆ ئامادەبوو پیچم گووت:- ئەی فلان بەڕاستی دەبینین خوا ئەم کارەی بۆ تۆ ناردووەو تۆ هەروەك دەزانی بە کارم، وەسیەتم بە کێ پێ دەکەی؟ فەرمانم پێ‌دەدەی بچم بۆ لای کێ؟ گووتی:- ئەی کورم، سوێند بە خوا بە هیچ پیاوێك نازانم لەسەر ئەوە بێت کە ئێمە لەسەرینە، تەنها پیاوێك نەبێت لە (نصیبین) ناوی فلانەو بیکەیێ...

کاتێك پیاوەکە بە خاك سپاردرا گەیشتم بە پیاوەکەی (نصیبین) هەواڵی خۆم پێ گەیاند لەگەڵ ئەوەی هاوڕێکەم فەرمانی پێکردووم، پێی گووتم: ٠ لەلای ئێمە بمێنەوە، منیش لەلا مامەوە، هەروەك هاوڕێیەکەی ترم تەنها چاکەم لێی بینیەوە، سوێند بەخوا ئەوەندەش لەلای ئەو نەمامەوە ئەویش ئەجەل گەیشتە سەری، کاتێك مردن لەسەری ئامادەبوو پێم گووت:- تۆ بەکاری من دەزانی وەسیەتم بە کێ پێ دەکەیت؟ گووتی:- ئەی کورم سوێند بەخوا نازانم یەکێك مابێت لەسەری کاری ئێمە تەنها پیاوێك نەبێت لە (عموریە) ناوی فلانە، پێی بگە، پێی گەیشتم و هەواڵی خۆم پێ ڕاگەیاند گووتی:- لەلام بمێنەوە، منیش لەلای مامەوە-سوێند بەخوا- ئەویش لەسەر ڕێگای هاوڕێکانی بوو کاتێك لەلای مامەوە، بووم بە خاوەنی مەڕومالات.

پاشان ئەوەندە لە لای ئەویش هەروەك هاوڕێکانی ئەجەلی تەواو بوو، کاتێك مردنی بۆ ئامادە بوو پێم گووت:- تۆ بەکاری من دەزانی وەسیەتم بە کێ پێ دەکەیت؟! فەرمانی چیم پێ‌دەکەیت بۆ ئەوەی بیکەم؟

گووتی:- ئەی کورم-سوێند بەخوا- بڕوا ناکەم لێرەدا یەکێك هەبێت لەسەر ڕووی زەوی مابێتەوە پابەند بێت بەوەی ئێمە لەسەرینە، بەڵام بەڕاستی زەمانێك نزیك بۆتەوە پێغەمبەرێك لە خاکی عەرەب دەربچێت و ئایینی ئیبراهیم زیندوو بکاتەوە پاشان لە خاکی خۆی کۆچ بکات بۆ خاکێکی بە خورما لە نێوان دوو شوێنی بە بەردو بەڵەك، هەندێك نیشانەی هەیەو بزر نابێت، ئەم پێغەمبەرە دیاری دەخوات و صەدەقە ناخوات و، لە نێوان هەردوو شانەکانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە، ئەگەر دەتوانیت بگەیت بەم وڵاتە بیکە.

پاشان ئەجەلی خوا بەجێگەیاند پاش ئەمیش ماوەیەك مامەوە لە (عموریە) تاكو چەند كەسێك لە بازرگانە عەرەبەكان لە هۆزی (كلب) بەوێدا تێپەڕین، پێم گووتن:- ئەگەر لەگەڵ خۆتان هەڵبگرن بۆ خاكی عەرەب ئەم مەڕو مانگایانەی خۆمتان پێدەبەخشم، گووتیان:- باشە هەڵتدەگرین، منیش مەڕو مانگاكانم پێیان بەخشی لەگەڵ خۆیان هەڵیان گرتم تاكو گەیشتینە (وادي القرى) لە نێوان مەدینەو شام ستەمیان لێكردمو منیان فرۆشتە پیاوێكی جولەكە، خزمەتم كرد، پاشان ئەوەندەی نەبرد كوڕە مامێكی سەردانی كرد لە (بني قريظة) منی كڕیەوە، منی گواستەوە بۆ (يثرب) ئەم دارخورمایانەی هاوڕێكەم بۆی باس كردبووم ناسیمەوە، لەگەڵ ئەم جولەكەیە مامەوە، پێغەمبەر ﷺ لەم كاتەدا بانگ هێژی میللەتەكەی خۆی دەكرد، بەلام نەمتوانی بیناسمەوە لەبەرئەوەی خەریك كرابووم بەداوی بەندایەتی...

پاشان ئەوەندەی نەبرد پێغەمبەر ﷺ كۆچی‌كرد بۆ (يثرب)، سوێند بەخوا لە سەرەوەی دارخورمایەك بووم كارم بۆ گەورەكەم دەكرد، گەورەكەم لەژێر دارەكە دانیشتبوو كوڕە مامەكەی هاتە لای و پێی گووت:- خوا (بَني قَيْلَة) لەناو ببات، سوێند بەخوا ئێستا كۆبوونەوە لە (قِباء)، بۆ پیاوێك ئەمڕۆ هاتۆتە لایان لە شاری مەككە وا بانگ هێژ دەكات كەوا پێغەمبەرە.

هەركە گوێم لەم قسانە بوو هەروەك یەكێك دەستم لێبووەشێنێ و وەكو ئەوەی تام بێتێ و زۆر بە توندی شێوام تاكو ترسام بكەومە سەر گەورەكەم، بە خێرایی هاتمە خوارەوە لەسەر دارخورماكە گووتمە پیاوەكە:- چی دەڵێیت؟!

هەواڵەكەم بۆ دووبارە بكەرەوە... گەورەكەم لێم تووڕە بوو و شەقازللەیەكی بە توندی لێدامو، پێی گووتم:- تۆ كارت چی‌یە بەمە؟! بگەڕێوە شوێنی خۆت كەوا كاری تیا دەكەیت.

كاتێك ئێوارە داهات هەندێك خورمام هەڵگرت كەوا كۆم كردبۆوە، ڕووم كردە ئەم شوێنەی پێغەمبەر ﷺ لێی دابەزی بوون لێی چوومە ژوورەوەو، پێم گووت:- هەروەك پێم ڕاگەیاندراوە تۆ پیاوێكی چاكیت، هەندێك یاوەری غەریبت لەگەڵ دایە پێویستن، ئەمە شتێكە لەلام بۆ صەدەقەیە بینیم ئێوە مەستەحەق ترن لە خەڵكی‌تر، پاشان بۆم بردو، بە یاوەرەكانی گووت:- بخۆن... دەستی خۆی گرت و نەیخوارد...

لە دلی خۆم گووتم:- ئەمەیان یەك...

پاشان ڕۆیشتم هەندێك خورمای تر كۆكردەوە، پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە جێگیر بوو چوومەوە لای پێم گووت:- من دەبینم تۆ صەدەقە ناخۆیت ئەمە دیاری‌یەكە پێم گەورە كردویت، لێی خواردو فەرمانی بە یاوەرەكانی كرد لەگەلی خواردیان...

لەدڵی خۆم گووتم:- ئەمەیان دوو... پاشان چوومەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا لە گۆڕستانی (غەرقەد) بوو یەکێك لە یاوەرەکانی بەخاك دەسپارد، بینم دانیشتووەو دوو شاڵی لەسەر شانی‌یە، سەلام لێ‌ی کرد، پاشان بۆی سوڕامەوە تەماشای پشتی بکەم بۆ ئەوەی ئەم مۆرە ببیتم کەوا هاوڕێکەم لە (عموریە) بۆی باس کردبووم... کاتێك منی بینی تەماشای پشتی دەکەم لە نیازەکەم گەیشت کراسەکەی لەسەر پشتی خۆی لابرد، تەماشام کرد مۆرەکەم بینی، ناسیمەوە پڕم دایە و ماچی بکەم و گریام، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی چیتە؟!

منیش ئەو چیرۆکەم بۆ گێڕایەوە، سەری پێ سووڕما، حەزی کرد یاوەرەکانیشی گوێیان لێم بێت، گوێیان بۆ گرتم، سەریان سووڕما بە سەرسووڕمانێکی سەیر، زۆر زۆر پێ‌ی کەیف خۆش بوون...

بەم ووتە شیرینە ڕووناکانە، سەلمانی فارسی باسی داستانی سەیری خۆی کرد لە پێناو گەڕان بە دوای ڕاستی‌دا ئەم ئایینە ڕاستەی خوا دەیگەیەنێت پێمان... پاش ئەم ووتانە موسڵمان بووم، بەڵام مەخابن داوی بەندایەتی نەیتوانی بەدرو ئوحد ببینێت...

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- خۆت بکڕەوە لە گەورەکەت تاکو ئازادت بکات ئەویش خۆی کڕیەوە پێغەمبەر فەرمانی بە یاوەرەکانی کرد هاوکاریم بکەن، خودای گەورە ئازادی کردم، وەك موسڵمانێکی ئازاد ژیام، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی خەندەق‌و هەموو دیمەنەکانی ترم بینی..

بەڵام پاش ئەوەی سەلمان هاتە ناو کۆمەڵی موسڵمانان ئایا چ پیاوێکی لێ‌دەرچوو؟

موسڵمانێکی چاکەکارو لەخواترس... لە خواترسان‌و ژیری‌و هەڵس‌وکەوتی هەر لە ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب خوا لێ‌ی ڕازی بێت- دەرچوو.

ڕۆژێك سەلمان لەگەڵ (ابو درداء) لە یەك ماڵ دەبن، (ابو درداء)-خوا لێ‌ی ڕازی بێت- بەشەو شەونخوونی‌و بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو... سەلمان چەند زیادەڕەویەکی لە خواپەرستی لێ بینی بەم شێوەیە.

ڕۆژێکیان (سەلمان) دەیویست ڕۆژووی پێ‌نەگرێ، ڕۆژووی سووننەت بوو..

(ابو درداء) بە گلەیی‌یەوە گووتی:- (ئایا قەدەغەم دەکەیت لەوەی بۆ خوا بەڕۆژوو نەبم‌و، نوێژی بۆ نەکەم)...؟!

سەلمان بەم وتانە وەڵامی دایەوە:-

(چاوەکانت مافیان لەسەر تۆ هەیەو، خێزانت مافی لەسەر تۆ هەیە... بەڕۆژوو ببەو بەڕۆژوو مەبە... نوێژ بکەو بخەوە)...

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی پێکەیشت فەرمووی:- ((لقد اشبعَ سَلمَانُ علمـاً))... واتە:- بەڕاستی سەلمان لە زانست تێربووە.

ڕۆژی خەندەق، ئەنصارەکان وەستان و گووتیان:- سەلمان لە ئێمەیە، موهاجیرەکان گووتیان:- بەڵکو سەلمان لە ئێمەیە...

پێغەمبەر بانگیکردن بەم ووتەیە:- (سَلْمانُ مِنّا آلَ البَيْت)..

واتە:- سەلمان لە ئێمەیە و لە بنەماڵەی ئێمەیە...

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالب-خوا لێی ڕازی بێت- بە لوقمانی حەکیم ناوی دەبرد پاش مردنی پرسیاریان دەربارەی کرد گووتی:-

(ئەمە پیاوێکە لە ئێمەیەو لە بنەماڵەی ئێمەیە-کێتان هەیەو وەکو لوقمانی حەکیم...)؟

(یەکەم جار زانیاری هەبوو و، لە دواییش زانستی هەبوو، پەرتووکی سەرەتاو پەرتووکی کۆتایی خوێندبۆوە، لە دەریایەك بوو وشکی نەدەکرد.

سەلمان لەلای هەموو یاوەرەکان شوێنی بەرز و بەڕێزی هەبوو... لە سەردەمی خەلیفایەتی عومەری کوڕی خەطاب بە سەردان هاتە مەدینە، عومەر کارێکی لەگەڵ کرد، لەگەڵ کەسیتر نەیکرد بوو، یاوەرەکانی کۆکردەوەو پێی گووتن:-

(با دەرچین بۆ پێشوازی سەلمان...)!!

بەڵێ سەلمان وەکو موسڵمانێکی ئازادو موجاهیدو خواپەرست لەگەڵ پێغەمبەر ژیا... هەروەها لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکرو عومەریش ژیا، پاشان خەلیفە (عثمان) کەوا لە سەردەمی ئەم کۆچیدواییکرد... لە هەموو ئەم سالانە ئالای ئیسلام لەسەر ولاتان دەشەکایەوەو، زێڕو سامان لە هەموو لایەکەوە بە دەسکەوت ڕووی لە مەدینە دەکرد، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك دابەش دەکرا... لێپرسراوەتی بۆ فەرمانڕوایەتی لەسەر هەموو ئاستێك زۆر بوو...

بەلام بابزانین (سەلمان) لەم پچڕینەوەو ڕاکێش ڕاکێشە لە کوێ بوو؟ ئایا لە ڕۆژانی خۆشیو دەوڵەمەندیو لە کوێت دەبینیەوە..؟!

برایانی بەڕوادرا چاوی خۆتان زۆر بە جوانی بکەنەوە، ئایا نابینن پیرێکی بەڕێز دانیشتووە لێرە لەژێر سێبەری دارێك گەلای خورما دەهونێتەوە سەبەتەو کەلوپەل دروست دەکات...؟

دەبێت ئەمە سەلمان بێت...؟!!

جوان جوان تەماشای بکەن...

کراسێکی کورتی لەبەرە لە سەرەوەی قومپانیەکانی و تاکو بڵێیت پیرێکی نورانی بە هەیبەتە... پیاوێك کاتی خۆی لەناو نیعمەت و خۆشی و شارستانیەتی گەورە بووە لە ژیانی نەیزانیەوە کارکردن مانای چیە؟! ئەم پیاوە لە بەرهەمی دەستی خۆی دەخوات هەروەك دەڵێت:- (سەبەتەکم دەکڕی بە درهەمێك، کارم پێی دەکردو، پاشان دەمفرۆشتەوە بە سێ درهەم، درهەمێکم دەگێڕایەوەو، درهەمێکم دەبەخشیە ماڵ و

منداڵم و، ئەوی‌ترم دەبخشی لە ڕێی خوا، ... ئەگەر عومەری کوڕی خەطابیش قەدەغەم بکات لەم کارە وازی لێ‌ناهێنم).

ئێستاکە ئێمە باسی پیاوێك دەکەین لە وڵاتی فارس لە بنەماڵەیەکی گەورەو دەوڵەمەند، لەگەڵ ئەمەش لە لێپرسراوەتی هەڵدێت و دەڵێت:-

(ئەگەر دەتوانیت خۆڵ بخۆ بەڵام مەبە بە براگەورە لەسەر دوو کەس، ئەوا بیکە...).

سەعدی کوڕی (ابی وقاص-خوا لێی ڕازی بێت- کاتی نەخۆشی سەردانی سەلمان دەکات و، سەلمان دەگرێت سەعد پێی دەڵێت:- چی دەتگرێنێت ئەی باوکی عبدالله ....، پێغەمبەری خوا ﷺ مرد و لە تۆ ڕازی بوو... سەلمان وەڵامی دایەوە:-

(سوێند بەخوا نە لە ترسی مردن دەگریێم و نە بۆ ژیان، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکی پێ‌گووتین فەرمووی:- بەشی یەکێك لە ئێوە لە دونیا وەکو خۆراکی ڕێبوارێکە، ئەوە ئێستا ئەم کەل‌وپەلە لە دەورم دەبینن)!!!

سەعد دەڵێت:- تەماشام کرد، بێجگە لە تەشتێك و مەسینەیەك هیچی‌ترم نەبینی، پێم گووت:- ئەی باوکی عبدالله ئامۆژگاریەکمان بدەرێ لێت وەربگرین، گووتی:-

(ئەی سەعد... یادی خوا بکە لە کاتێك تووشی خەمێك بوویت... لە فەرمان دا بە ئەگەر فەرمانت دا... لە کاتی دابەش کردن ئەگەر بووی بە دابەشکەر...)...

بەڵێ لەهەڵسوکەوت لە ئیمامی عومەر دەچوو، زەمانێك کرا بە فەرمانڕەوا لەسەر (مەدائین) ئەمەش لەسەر داوای خۆی نەبوو بەڵکو لەسەری فەرزکرابوو... لەگەڵ ئەمەش بەقەدەر موویەك لەم پیاوە گۆڕانکاری ڕووی نەدا... بەڵکو هەر لە کاری خۆی خواردی و کاری سەبەتەی دەکرد...

ڕۆژێکیان، بە ڕێگادا دەڕۆیشت پیاوێکی تووش بوو لە وڵاتی شام دەهات باری خورما و هەنجیری پێ‌بوو..

ئەم بارە ئەم پیاوەی زۆر ماندوو کردبوو، تاکو پیاوێکی بینیەوە وای زانی لە خەڵکە ڕەشۆکی و هەژارەکانە، هەتا داوای لێبکات بارەکەی لەسەر کۆڵی دابنێ، پاشان کاتێك گەیشتە شوێنی خۆی شتێکی پێ ببەخشێت...

دەستی بۆ پیاوەکە بڵند کرد ئەویش هاتە لای، شامیەکە پێی گووت:- ئەم بارەم بۆ هەڵبگرە، ئەویش بۆی هەڵگرت و لەگەڵی ڕۆیشت...

کاتێك لە ڕێگا دەڕۆیشتن گەیشتنە کۆمەڵێك خەڵك، سەلامیان لێ‌کردن، ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو گووتیان:-

سەلام لە ئەمیریش بێت.

شامیەکە پرسیاری لە دەروونی خۆی‌کرد... مەبەستیان چ ئەمیرێکە... سەلام لە ئەمیریش ؟! زیاتر سەری سوڕما کاتێك هەندێك لەمانە بینیان ڕووی لە (سەلمان) کردو دەیانگووت:- لە تۆ ئەی ئەمیر...!!!

شامیەکە زانی ئەمە ئەمیری مەدائن (سەلمانی فارسی)یە، ئەمەی لەدەست چوو، زمانی تێک ئالأو ووشەی شەرمەزاری و لێبووردنی دەربڕی، نزیک بۆوە بارەکەی لێبکاتەوە، بەلأم سەلمان سەری بەرز کردەوەو قەبوولی نەکردو گووتی:- نەخێر... تاکو دەیگەیێنم بە شوێنی خۆی)...

ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی چووە مالی، بینی هەویر دەشێلێت، پرسیاری لێکرد:-

- کوانێ خزمەتکار...؟

وەلأمی دایەوە:- (بۆ پێویستی‌یەك ڕەوانەمان کردووە، حەزمان نەکرد دوو کاری لەسەر کۆبکەینەوە).

ئینجا با بزانین مالی فەرمانڕەوا لای مەدائن چۆنە؟

کاتێك سەلمان دەیوست خانووسەك دروست بکات، پرسیاری لە وەستاکە کرد چۆنی دروست دەکەیت؟

بەلأم هەرچی وەستاکە بوو زۆر ژیر بوو، دەیزانی سەلمان چۆن وازی لە دونیا هێناوە... وەلأمی دایەوەو گووتی:- (مەترسە... خانوویەك بتپارێزێ لە گەرما و لە سەرما، ئەگەر وەستایت سەرت بە بنمیچی بکەوێت و، ئەگەر پال کەویت پێیەکانت بە دیوار بکەوێت)...

سەلمان پێی گووت:- (بەلێ بەم جۆرە دروستی بکە).

سەلمان بە هیچ شتێك بە مالی دونیا دلی خۆش نەدەبوو هەتا بۆ ساتێکیش، تەنها و تەنها شتێك نەبێت دلی پێی خۆش دەبوو، خێزانەکەشی پێی ئاگادار کردبۆوەو بۆی شاردبۆوە، لەکاتی کۆتایی ژیانی، لەم بەیانی‌یەی کەوا گیانیان کێشا، بانگی کردە خێزانەکەی:- (شاردراوەکەم بۆ بهێنە کەوا شاردۆتەوە).

ئەویش بۆی هێنا، کەوا لەناو دەستەسرێك (مسك) هەبوو، لە ڕۆژی فەتحی (جلولاء) بەدەستی کەوتبوو پاراستبووی تاکو ڕۆژی مردنی...

پاشان داوای پەرداخێك ئاوی کردو میسەکەکەی لەناو کرد، پاشان بەدەستی خۆی تواندیەوەو بە خێزانەکەی گووت:-

(بەدەوم دا بیڕشێنە، ئێستا چەند دروستکراوێکی خوا دێن، خواردن ناخۆن، بەلکو حەز لە بۆنی خۆش دەکەن).

کاتێك ئەمەم کرد گووتی:- (دەرگام لەسەر داخەو دابەزە)... فەرمانەکەم بەجێگەیاند...

پاش ماوەیەك چوومەوە لای، بینیم گیانی پاکی بە پەروەردگار سپاردووە...

سەلام لە سەلمانی فارسی هەر لەو ڕۆژەی بە دوای هەق گەڕاوە تاکو ڕۆژی زیندووبوونەوەی...

پەروەردگارا لە ڕۆژی حەشر لەگەل سەلمان و هاوچەشنانی کۆمان بکەیتەوە-آمین.

(٨٢)

# أبوذر الغفاري

## سـەرکردەی بەرهەڵسـتکاران و دوژمنی سـامان

ناسنامەی یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ (ابوذر الغفاري) بەم جۆرەیە:-

موسـلمانێکی دونیانەویسـت، ملکـەچو خواپەرسـت، هـەڵگرو بەرزکـەرەوەی ئـاڵای ئیسلامو، سەرنخوون کەرەوەی ئاڵای بێباوەڕی... یەکەم کەس بوو سڵاوی لە پێغەمبەر کرد بە سڵاوی ئیسلام، لە گوتنی هەق گوێی نەدەدا بە لۆمەی لۆمەکاران.

چاوسورکردنەوەو ستەمی دەسەڵاتداران نەیدەترساند...

خزمەتی پێغەمبـەری کردو، فێری بنچینـەکانی ئیسـلام بـوو، سـیفەتی مشـەخۆری دەخستە دواوە، لە ڕۆیشتن و دانیشتن هـاوڕێی پێغەمبـەر بووو، لـە وەرگرتـن و سـوود وەرگرتن لـێی ئامادەبوو...

(ابوذر الغفاری) ناوی( (ابوذر جندب کوڕی جنادە کوڕی قیس کوڕی عمـرو کوڕی مليل کوڕی صـغير کوڕی حرام الغفاری) لە هۆزی الغفار بوو...

دایکی (رملـە کچی الوقیقە) بوو لە هۆزی غفـار...

(ابوذر الغفاری) لە پێشەنگی موسلمانە سەرەتاکان یەکەم کەس بوو لـە نێـو کۆمـەڵێك لە قورەیشی مەککە موسلمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد...

(ابـوذر الغفـاری) لـەنێو هـۆزی غفـار پـەروەردە بـوو کـەوا پیشـەیان ڕێگـری بـوو، قوربەسەری ئەو کەسەی دەکەوتە دەست ئەمانە لەم کاروانانەی بەلایاندا دەڕۆیشت بـەڵام (ابوذر) شوێنکەوتووی ئایینی (ابراهيم) بـوو خـودای تـاکی دەپەرسـتو دوور بـوو لـە پەروەردەی ئەوان...

هـەروەك لـێی دەگێڕنـەوە گووتیـەتی:- پێش چوار سالە پێغەمبەرایـەت موحەممـەد خوام پەرستووە.

(ابوذر)-خوا لـێی ڕازی بێت- گوێ بیست بوو بە بانگی ئیسلام، کەوا ئـاینێك بـوو داوای یەکتاپەرستی خـواو دژایـەتی بێباوەڕی دەکـرد و ئـەم بانگەدژایـەتی بێبـاوەڕی دەکرد وئەم بانگە قەزاز قەدەر گەیاندی بە دەروونی (ابوذر) و دەروونی ڕووناککردەوە.

(ابوذر) دانیشتبوو بیری لەم کارە نوێیە دەکردەوە... بانگهێشتن؟ ئایین؟ ئیسـلام ؟ دەبێت ئەمکار چی بێت مەککەی خەریك کردبێت لەم ساتو کاتەدا...

ئیتر بەردەوام بیری دەکردەوە تاکو براکەی دەگەڕێتەوە.

براکەی گەڕایەوە پێی گووت:- بینیم فـەرمانی بـە ڕەوشـتی چاك دەکـردو، قسـەیەکی دەکرد شیعر نەبوو.

(ابوذر) گووتی:- دڵم ئاوی نەخواردەوە بەمەی مەبەستم بوو! دووبارە بیری لەم کارەی پێغەمبەر ﷺ کردەوە وای بۆ چوو زۆر پێویستە بکات بە دیداری ئەم زاتە پیرۆزە و ئەم بانگە پاکە ئایینە نوێیە، بڕیاریدا بڕوات بۆ مەککە لەم بانگە بکۆڵێتەوە.

چەند ڕۆژێکی پێچوو تاکو گەیشتە مەککە لەگەڵ ئەمەشدا لە لای کەس باسی نیازو مەبەستی خۆی نەکرد، چونکە ئەگەر قورەیش بیانزانیبایە هەلابەهەلایان دەکرد پێش ئەوەی بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا ڕێگای هەق و هیدایەتی پێنیشان ئەدات...

(ابوذر) باسی چیرۆکی بوونی خۆی دەکا دەڵێت:-

گەیشتمە مەککە و چوومە ناو مزگەوت(بیت الحرام) لێی پاڵ کەوتم عەلی کوڕی ئەبوطالب خوا لێی ڕازی بێت- منی بینی و گووتی:- دەڵێی ئەم پیاوە غەریبە؟ گووتم:- بەڵێ گووتی:- بابچینەوە ماڵەوە، لەگەڵی چوومە ماڵەوە نەپرسیاری لێکردم و نە پرسیاری شتێکم لێ‌ی کرد دەڵێت:- کاتێك بۆ بەیانی هەڵسام ڕۆیشتمەوە شوێنی خۆم ئەو ڕۆژەش لەم شوێنە مامەوە تاکو شەوم بەسەرداهات، ڕۆیشتم لێی کەوتم. ئیمامی عەلی بەلامدا تێپەڕی و گووتی:-

ئێستاکە کاتی ئەم پیاوەیە جێگای خۆی بناسێت!

لەگەڵ چونە ماڵەوە نەپرسیارم لێ‌ی کردو نە پرسیاری لێکردم.

تاکو ڕۆژی سێیەم ئەم کارەم دووبارە کردەوە.

پاشان پێی گووتم :- ئایا پێم ناڵێیت چی تۆی هێناوە بۆ ئە وڵاتە؟ گووتم ئەگەر بەڵێن و پەیمانم بدەیتێ ڕێگام پێ نیشان بدەیت پێت دەڵێم چی پاڵی پێوەنام بۆ ئەم کارە، پێم گووت:- من هاتووم کارم بە موحەممەد ﷺ هەیە حەزدەکەم بە دیداری و دەمەوێت لەڕاستی ئایینەکەی بگەم.

ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- هەواڵی دامێ ئەم پێغەمبەرەو ئەوەی لەگەڵە خۆی هێناویەتی هەقەو پێغەمبەری خوایە ﷺ پاشان پێ‌ی گووتم:-

کاتێك بەیانیت کردەوە بەدوام کەوە ئەگەر شتێکم بینی ترسی هەبوو لەسەرتۆ بە ئاگات دەهێنم، ئەگەر ڕۆیشتیشم بەدوام کەوە تاکو دەچمە شوێنەکە:-

دەڵێت:- بەدوایدا ڕۆیشتم تاو لەگەڵی چوومە ژوورەوەو گووتم:-

السلام علیکم ، وەڵامی سەلامی دامەوە، من بووم بە یەکەم کەس کەوا سەلامم کرد بە سەلامی ئیسلامی پاشان پێم گووت:- ئەوەی دەیڵێیت بیڵێ:-

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم:- ئەی برای عەرەب من شاعیر نیم تاکو بۆت بڵێم بەڵکو ئەوە قورئانە بە نیگا بۆم هاتووە.

(ابوذر) ئەوەندی نەبرد ئەم بانگە بە دڵیا چووە خوارەوەو گیان و ویژدانی پڕکرد لەم خوێندنەوە جوان و ڕەوانە، بانگی لێهەڵساو ووتی:-

(اشهد أن لا اله الا الله وأن محمداً عبد الله ورسوله)

بەم جۆرە یەك كەس لە ژمارەی موسڵمانان زیان بوو، بەڵام كێشێكی یەكجار زۆری پێدا.

دەگێڕنەوە كەوا پێنجەم كەسە موسڵمان بووە...

لەم دۆخەشدا موسڵمانان بەرەنگاری زۆر بەڵاو ئازارو ئەشكەنجەی قورەیش دەبوونەوە بەڵام بە لەخواترسان ئارامیان دەگرت...

(ابوذر) باوەشی لە ئیسلام دا دەمارەكانی ئاویان خواردەوە بەم بانگهێشتنە ڕاستە سینگی جۆش درا بو ئەم ئاینە پتەوە...

(فَمَن یرد الله أن یهدیه یشرح صدره للاسلام)

یەكەم پێكەگەیشتن و دیاری پێغەمبەر ﷺ و (ابوذر) بەم جۆرە بوو لە دەوروپشتی شاری مەككە:- پێغەمبەر ﷺ بە زەردەخەنە پرسیاری لە (ابوذر) كردو فەرمووی :-

لە كوێ هاتووی ئەی برای عەرەب؟

(ابوذر) وەڵامی دایەوە ووتی:- لە غەفار.

پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر زەدەخەنەی بردەوە دڵی خۆش بوو روخساری بە كەیف و خۆشی گەشایەوە وە فەرمووی ( إن الله یهدي من یشاء)...

واتە:- خودا هیدایەتی ئەو كەسە ئەدات كەوا حەزی پێدەكات.

لەبەرئەوەی هۆزی غیفار ناسرابوون بە چەتەو ڕێگری ئیننجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:- ئەی (ابوذر) لەناو هۆزەكەت بمێنەوە تاكو ئاشكرابوونی ئاین.

بەڵام سروشتی شۆڕشگێڕی (ابوذر) نەیتوانی نەرمی و هێمنی ڕابگرێت، بڕیاریدا موسڵمان بوونی خۆی بۆ ئەم ئایینە هەقە ئاشكرا بكات... بە پێغەمبەری گووت:- (بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لە نێو كۆمەڵەكانیان دەنگی خۆم بەرز دەكەمەوە).

پێغەمبەری بە بەزەیی، بەزەیی پیاهاتەوە داوای ئارام گرتن و خۆگرتنی لێكرد بەڵام ابوذر لەم ساتەی مسوڵمانبوونی پیاوێكی تر لێدەچوو ترس نەیتوانی جێگای خۆی لە دەروونی بكاتەوە، سوور بوو لەسەر ئاشكراكردنی موسڵمان بوونی و پێغەمبەریش وازی لێهێناو دوعای پاراستنی بۆ لە خوا كرد.

(ابوذر) ڕووی لە كەعبە كرد كەوا لەسەر ئەم دەروونە شۆڕشگێڕیەی جاران بوو، هەرچی بێباوەڕان بوون كۆمەڵەیان كرد قسەیان دەكرد.

لەناكو گوێیان لە دەنگێك بوو هاواری كرد :-

(اشهد ان لا اله الا الله وان محمداً عبده و رسوله)

بێباوەڕەكان شێت و هاربوون و هاواریان كرد:- ئەم پیاوە ئایینی خۆی گۆڕیوە، ئەم پیاوە ئایینی خۆی گۆڕیوە....

کۆمەڵەیان لەسەر کرد پاشان پەلاماریان داو لێیان دا، تاکو لە هۆش خۆ چوو و کەوت، کاتێك بەخۆی هاتەوە ئەم بانگە شیرینەی دووبارە کردەوە، ئەوانیش دووبارە لێیان دا.

عەباس کوڕی عبدالمطلب ریزەکانیانی بڕیو، هەر لە پیاوەکەیان دەدا تاکو هاواری لەسەر کردن و پێی گووتن:-

قوڕتان بەسەر ئایا نازانن ئەم پیاوە لە غیفارەو ڕێگای بازرگانیانە بۆ شام؟ لێرەدا بە ئاگاهاتنەوەو بەریان کردەوەو وازیان لێ هێنا (ابوذر) بە ناڵەو ئازار گەڕایەوە لای پێغەمبەر، پێغەمبەری ئازیزﷺ پێی فەرموو:- ئایا ئاگادارم نەکردیتەوە ئەی (ابوذر).

بەڵام دڵی (ابوذر) داکەوت بەم ئازار چەشتنە لە ڕێگای خوا.

پاشان پێغەمبەر ﷺداوای لێکرد بگەڕێتەوە ناو کەسوکاریو لە نێوانیان بمێنێتەوە تاکو کاتی ئاشکراکردنی ئیسلام دێت.

یاوەری بەڕێز (ابوذر) گوێڕایەڵی ئەم فەرمانە بوو، موسڵمانبوونی (ابوذر) بوو بە یادی گەورەترین یاوەری بەڕێزو بەرزترین پیاو لە قارەمانەکانی....

پاشان (ابوذر)-خوا لێی ڕازی بێت- گەڕایەوە ناو هۆزەکەی غیفار دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەو فێرکردنی ئایینی نوێ لە نێو خەڵك دا، بەردەوام بانگی خەڵکی کرد بۆ ئیسلام تاکو ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکەی ئیسلام بوون و، ڕووی کردە هۆزی دراوسێکانی بانگیکردن تاکو هۆزی (اسلم) موسڵمان بوون.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت (ابوذر) گەورەترین نموونەو سەرمەشقە بۆ ئێمە کەوا بە هیچ جۆرێك ڕێگا نادرێت موسڵمان لێی پاڵبداتەوەو خۆی ماندوو نەکات بە بانگهێشتن و ڕێنمایی خەڵك بۆ سەر ئیسلامی مەزن، بەڵکو پێویستە هەست بە لێپرسراویەتی گەورە بکات بەرامبەر ئەم بانگهێشتنەو گوێ نەدات بە ئازاری بێباوەڕان و لۆمەی دووڕوان.

(ابوذر الغفاری) پاش ئەوەی گەورەترین کاری بانگهێشتنی کرد بۆ ئیسلام خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی ئەم لە هۆزەکانی (غیفارو اسلم) بوون بە موسڵمان ئینجا بیری کردەوە بکات بە پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی ببێت بە موجاهیدێکی دڵسۆزو گوێڕایەڵ لەژێر دەستی ئەم زاتە مەزنە ڕۆژێك لە ڕۆژان پاش کۆچ کردنی پێغەمبەر و یاوەران بۆ مەدینە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یاوەرەکانی دانیشتبوون لە دوورەوە بینیان تۆز بەری ئاسمانی گرتووەو، وا نیشان دەدات خەڵکانێك بۆ شاری مەدینە دێن لەبەرئەوە تۆزەکە زۆر بوو ترسیان لێنیشت کەوا ژمارەیەکی زۆری دوژمن بن بەسەر مەیدەندا بدەن، شمشێرەکانیان هەڵکێشاو خۆیان بۆ ئامادەکرد. چاوەڕێیان دەکرد نزیك ببنەوە، کاتێك نزیك بوونەوە گوێیان لە جاڕی (تەکبیر) بوو ئەم دەنگە هەموو دەنگەکانی بڕیبوو، بینیان هەردوو هۆزی (غیفار و اسلم) و ابوذر لە پێشەوەیان دەڕوات، پێغەمبەر ﷺ بە

یادی هاتەوە و زەردەخەنەی بردەوە، پێی فەرموو:- ابو نملە؟ وەڵامی دایەوە ابوذر، پێغەمبەر فەرمووی:- بەڵێ بەڵێ ابوذر.

پاشان تەماشای هەردوو هۆزەکەی کردو فەرمووی:-

( ما أقلت الغبراء ولا أضلت الخضراء اصدق لهجة من أبي ذر)

واتە:- ئەوەی زەوی هەڵیگرتوەو ئەوەی ئاسمان سێبەری لێکردووە ڕاستگۆتر نیە لە زمانی (ابوذر). بەم جۆرە (ابوذر) بەشدار هەموو جەنگەکانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، تەنها لە جەنگی بەدرو ئوحد و خەندەق نەبێت لەبەر دواکەوتنی لەکۆچ کردن بۆ مەدینە، هەروەها لە جەنگی (بني مصطلق) پێغەمبەر ﷺ لەسەر مەدینەی دانا...

ئینجا لێرەدا با لەم فەرموودەیە بکۆڵینەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی (ابوذر) فەرموویەتی:- (یمشی وحده و یموت وحده ویبعث وحده).

واتە:- بە تەنها دەڕوا، بە تەنهایی دەمرێ‌و، بە تەنهایی زیندوو دەکرێتەوە، ئینجا لێرەدا ئەمە سەرەتای باسەکەمان دەبێت تاکو کۆتایی....

لە جەنگی تەبوك زۆر لە دەروون نزمەکان بەدواکەوتن بۆ دەرچوون بۆ جەنگی وڵاتی ڕۆم لەبەر ئەوەی ڕەشبین بوون لە سەرکەوتن، لە کاتی ماڵئاوایی دووڕووەکان بە دواکەوتن لە پێغەمبەر ﷺ خەڵك دەیانگووتە پێغەمبەری خوا ﷺ:- فڵان کەس بەدواکەوت ئەویش دەیفەرموو:- وازی لێبهێنن ئەگەر خێری پێوە بێت خوا دەیانگەیەنێتەوە پێتان وە ئەگەر خێری پێوە نەبێت ئەوا ڕزگارتان دەکا لێی...

پاشان (ابوذر) بزر دەبێت و نایبیننەوە بە پێغەمبەریان گووت ئەویش هەمان فەرموودەی پێفەرموون....

لەم کاتەدا بەتاو هات بە ڕێگای جەنگ، بۆ ئەوەی بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ووڵاخەکەی بە هۆی لاوازی و ناخۆشی ڕێگا نەیتوانی ڕێگاکە ببڕێت...

(ابوذر) چاری نەماجۆرکی خواردنەکەی لەسەر پشتی خۆی هەڵگرت‌و بە ماندووبوون‌و شەکەتەوە بە خێرایی ڕێگای بڕی بۆ ئەوەی بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

تۆز بەرز بۆوە موسڵمانان تەماشای پێشەوەی خۆیان کرد، پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی:- (ابوذر)ە.

پێغەمبەر ﷺ کەیف خۆش بوو و پێشوازی لە (ابوذر)ی ماندوو شەکەت کرد...

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری هۆی دواکەوتنی لێکرد ئەویش مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە پێغەمبەری بە بەزەیی تەماشای کردو فەرمووی : (رحم الله اباذر یمشي وحده ویموت وحده و یبعث وحده).

پاشان فەرمووی:-

ئەو کەسانەی بەدواکەوتن تۆ لە ناویان لە هەموویان بەڕێزتر بووی لە لای من بەڕاستی خودا لە گوناهەکانت خۆش بوو، بە هەر هەنگاوێك چاکەیەکی بۆ نووسی...

هەروەها ئەوانەی بەدواکەوتن سێ گەورە یاوەری تریش بوون: (کەعب کوڕی مالك و، هلال کوڕی امیە و ، مراره کوڕی الربیع). بە پەشیمان بوونەوەیەکی بێ وێنە پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوە لای خودا و خوای گەورەش لێیان خۆش بوو و، فەرموودەی خوایان دەربەق هاتە خوارەوە:-

﴿ لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ۞ وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لاَ مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ (التوبة ١١٨)

جەنگی تەبوك کۆتایی جەنگ بوو پێغەمبەر ﷺ تێیدا جەنگا تەبوك نزیکەی حەفت صەد کیلۆمەتر لە شاری مەدینە دوور بوو و، تێیدا جەنگی ڕۆمیان کرد ژمارەی موسڵمانان لەم جەنگە لە دەوری سی هەزار کەس دەبوو...

ڕۆژێك (ابوذر الغفاری) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو پێغەمبەر ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد، تۆ چۆن دەبیت ئەگەر بینیت ئەمیرەکان بە دوای دەسکەوت دەکەون؟

(ابوذر الغفاری) ووتی:- کەواتە شمشێر بەرەو ڕوویان بەرز دەکەمەوە...

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی بردوە فەرمووی:- اصبر حتی تلقانی....

واتە:- ئارام بگرە تاکو پێم دەگەیت، بەڵێ، (ابوذر) ئامۆژگاریەکی مەزنی لە پێغەمبەری ئازیز ﷺ وەرگرت لە کاتێکدا ئومەتی ئیسلام دوچاری ماڵی دونیا دەبن بەم جۆرە لە شێوەی پرسیارو وەڵامێك چارەسەری بۆ (ابوذر) دانا....

(ابوذر) گوێی لەم ئامۆژگاریە بوو بە بیرە تیژەکەی هەڵیگرت و پارێزگاری لێ کرد، پاش ئەوەی چەند ڕۆژو ساڵی پێچوو پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ ئاوایی لە دونیا کرد (ابوذر) لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان دڵتەنگ و خەمگین بوو...

(ئەبوبەکری صدیق) جڵەوی خەلافەتی گرت، (ابوذر) بەزەیی بە حاڵی موسڵمانان دەهاتەوە بەڵام (ئەبوبەکری صدیق) بە توندی گرت بوو بە باشترین فەرمانڕەوا، یازدە لیوای ئامادەکرد بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان، بەرەنگار هەموو بێ هێزی خۆبەدەست دانەوەو سەرشۆڕیەکی کرد، خوا سینگی ئەم و سینگی یاوەرەکانی جۆش دا بۆ ئەم جەنگە...

ئیسلام هێزی گەڕاوە، ئەمەش بە هۆی دڵنیایی یان بوو بۆ دەوڵەتی ئیسلام.

یاوەری بەڕێز (ابوذر) دەورێکی باڵای بینی لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان و جەنگی ئوسامە، کەوا رووی لە فەلەستین کرد بۆ جەنگی ڕۆم پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری

خوا ﷺ (ابوذر) به هەموو هەستێکەوە لە فەرمانڕەوایی موسڵمان ڕادەما، بەڵام بینی (ئەبوبەکری صدیق) فەرمانڕەوای موسڵمان و خواپەرستو دادوەرو مل کەچ دەرچوو بۆ فەرمانی خوا... ئەمیش بە هەموو هێزو توانایەکیەوە لە ئەبوبەکر نزیك دەبۆوەو یارمەتی دەداوە لایەنگیری دەکرد... پاش ماڵئاوایی ئەبوبەکر ئەمجارەیان جڵەوی خەلافەت کەوتە بەردەستی(فاروق)... (عومەری کوڕی خەطاب )یش توانی زۆر بە توندی فەرمان بکاو بە دادوەری، کۆتایی بەم فەتحانە هێنا کەوا خەلیفەی پێشوو دەستی پێکردبوو...

چاوی (ابوذر) ڕوون بۆوە بە فەرمانڕەوایەتی (فاروق) هەروەك پێشتر ڕوون ببۆوە بە (صدیق) بەڵام ڕۆژانی (فاروق)یش بەسەرچوو پاش دە ساڵ لە فەرمانڕەوایەتی پێغەمبەر ﷺ تاکو فەرمانڕەوایەتی (فاروق)....

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەطاب داینابوو لە دیوانی فەرمانڕەوایەتی لە شام کاتێك عومەریش لێدارو شەهید بوو، ڕووزەردی ئاژاوە سەری دەرهێنا بەڵام خەلیفەی سێیەمیش (عثمان کوڕی عەفان) خوا لێی ڕازی بێت- کاتێك جڵەوی خەلیفابەتی وەرگرت کاروباری زۆر بە چاکی بەڕێوەبرد، کاری دەکرد لەسەر سەرخستنی بێهێزو دەوڵەمەند کردنی هەژاران...

فتوحاتی ئیسلامی ڕووبەری گەورەتر بوو دیاردەی سامانو ڕابواردن بە شێوەیەکی سنووردار لە نێو موسڵمانان بە دیارکەوت لە مەدینەو، لە شام بە شێوەیەکی فرەوانتر و زیادەڕەوی لێکرا...

(ابوذر) ئەمەی بە چاوی خۆی بینی گلۆپی سوور لە ئیمانەکەی پێبوو لە دەروونی خۆی پرسیەوەو بەرەو دواوە گەڕایەوە کەوا یادگاری هاوڕێیەتی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەیاد هێنایەوە، گەڕایەوە ئەم ئامۆژگاریە مەزنەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنیاری کرد:- أصبر حتی تلقاني...

پێغەمبەری مەزن ﷺ فەرمانی پێکرد لەسەر ئەمە تاکو مردن... پێغەمبەر قەدەغەی کرد لەسەر بەکارهێنانی شمشێر بەڵام قەدەغەی نەکرد لەسەر بەکارهێنانی ووشە....

کەواتە زمانی بەکارخست دژی ئەوانەی لوقمی سامان ببوون لەگەڵ ڕابواردن بەم جۆرە (ابوذر) بە ئاشکرا بیروڕای خۆی ئاشکرا کرد لە شام بەم وتارە:-

(ئەی کۆمەڵی دەوڵەمەندان:- یارمەتی هەژاران بدەن، مزگێنی بدەن بەم کەسانەی زێڕو زیو دادەکەن و نایبەخشن لە ڕێگای خودا، بە ئاسنی سۆرکراوە لە ئاگر نێڕەوان و پشتو پێشیان داغ دەکرێت.

ئەی داکەری سامان:- بزانە سێ شەریك لە ماڵەوە هەیە:- قەدەر فەرمانت پێناکات چاکەو شەڕی ببیەت بە فەوتان یان مردن، میراتگر چاوەڕوان دەکات بمریت پاشان

وەربگرێ و باس نەکرێت و تۆ سێیەمیانی، ئەگەر دەتوانی مەبە بە یەك کەوتووی سێیەم و لە ئەمە مەبە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ﴾ (سورة آل عمران ٩٢)

ئەی داکەری سامان:- نازانی هەر رۆژێك بەندەکان بەیانی دەکەنەوە ئەوا دوو فریشتەی بۆ دێنە خوارەوە یەکێکیان دەڵێت:- پەروەردگار ئەوەی دەیبەخشێت پاداشتی لەسەر بدەوە، ئەوی تر دەڵێت:- ئەوەی نایبەخشێت لێی وەرگریەوە..

دەروونی گوێ گرەکان لە هەژاران بەم وتارە گڕی گرت لە شام، هەروەها جەماوەرێك لە دەوری کۆبوونەوە لە لایەنگری بیروڕاکەیان کرد، بە دوای فراوانکردنی یەکسانی کۆمەڵایەتی...

موعاویەی فەرمان ڕەوای شام گوێ بیست بوو بە هەواڵی ئەم جوڵانەوەیە، ویستی (ابوذر) لە ڕاستی ئەم بانگە تاقیبکاتەوە بۆ ئەوەی بیبینێت تا چ ڕادەیەك لەم قسەی دەیکات ڕاست دەڵێ و چۆن لە دەروونی خۆی دەیسەلمێنێت...

بانگی پیاوێکی کردو هەزار دیناری دایە دەست و پێی گووت:- برۆ لای (ابوذر) پێی ببەخشە، پاشان دوای سێ رۆژ برۆوە لای پێی بڵێ ئەم ماڵە ماڵی تۆ نەبوو من هەڵەم کردووەو بۆم بگێڕەوە...

منیش کردم... (ابوذر) ماڵەکەی وەرگرت و، پاش سێ رۆژ پیاوەکە گەڕاوە لایو داوای کردەوە (ابوذر) بە پیاوەکەی گووت:-

(بە موعاویە ڕابگەیەنە ئەم ماڵەمان بەخشیە سەر هەژاران، ئەگەر بوەستێت تاکو سێ رۆژیتر بۆی کۆبکەینەوە)

بەم جۆرە موعاویە بۆی دەرکەوت بانگەکەی (ابوذر) بە قسەو کردەوە ڕاست دەکات لە کارەکەیو نازانێت درۆو فرتوفێڵ مانای چییە...

بەم جۆرە (ابوذر) وای بۆچوو پێویستە لەسەر هەموو ساماندارێك ئەوەی زیادە لە لای بیبەخشێت، داکردن و کۆکردنەوەی سامانی بە شتێکی حەرام دەزانی، بەڵکو پێویستە لەسەر پیاوە سامانداره‌کان سامانەکانیان لە ڕێگای چاکەو قازانجی گشتی ببەخشن. بەڵگەشی فەرموودەی خوای گەورەیە دەفەرموێت:-

﴿ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ(٣٤)يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَـذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة)

هەروەها فەرموودەی خوا:-

﴿ وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ ﴾ (البقرة ٢١٩)

﴿ آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ﴾ (الحديد ٧)

(ابوذر) به ڕاستگۆیی و، بیرتیژی و، دووربینی و، پیلان دروستی بەناوبانگ بوو.
هەروەها ئەم ڕێرەوە ئیسلامی یەی لای (ابوذر) بیروبۆچوونی خۆی نەبوو، بەڵکو ئەم ڕێبازێك بوو وەریگرتبوو لە مامۆستاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەرچاوەی ئیسلام، بە گوێرەی تێگەیشتنی تایبەتی خۆی.
جارێکیان (ابوذر) لە موعاویە هەڵسایەوە پاش ئەوەی بینی کۆشکێکی گەورەی دروست کردووە ناوی لێناوە (الخضراء) پێی گووت:-
(ئەگەر ئەوە بە ماڵی موسڵمانان بێت خیانەتەو ئەگەر بە سامانی خۆت بێت ئەمە زیادەڕەوی یە، ئەی موعاویە).
((بەڕاستی دەوڵەمەندت دەوڵەمەندتر کردو، هەژارانت هەژارتر کرد).
ئینجا بە هۆی ئەم ڕێڕەوە ئیسلامیە پتەوە هەندێك لە گۆمان لێکراوە خوانەناسەکان پێیان گووت:- توندڕەو، بەلاَم ئایا ئەمە دەبێت چ توندڕەویەك بێت؟ لەبەرئەوەی لە سەردەمی صدیق و فاروق بەمپەڕی ڕازیبوون لێی ڕازی بوون، لەبەرئەوەی دادوەری لە وولاَت بلاَوەی کردبوو..
بەلاَم کاتێك (ابوذر) بینی دەوڵەمەند زۆر بوون و هەژار ژمارەیان زۆرتر بوو پاش فاروق، (ابوذر) هەڵسایەوە و بڕیاری بەرگری دا...
بەڵێ ئیتر (ابوذر) ئەم شتە بێشەرعیانەی بینی ناتوانێ بێدەنگ بێت و لە ستەمی ستەمکاران دەترسێت و نە لە لۆمەی لۆمەکاران.
(ابوذر) لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر تاکو بڵێیت دڵی خۆش بوو هەموو توانای خۆی لە جیهادی ڕێگای خوا پیادە دەکرد.
ئینجا لێرەدا دەبێت ئەوا بزانین ئەوانەی (ابوذر)یان تاوانبار کرد بە توندڕەوی بەڕاستی زیادە ڕەویان کرد لەم تاوانبارکردنە.
(ابوذر) لەبەرئەوەی نەیدەزانی ترس چی یە، بە ئاشکرا لێپرسینەوەی دەکرد لەگەڵ موعاویە سەبارەت بە سامانەکانی... بە تایبەتی سەبارەت بەو کۆشکەی دروستی کردبوو لە مەککەو لە کۆشکەکانی لە شام...
پاشان ڕووی لە دانیشتووەکان کرد، لەم یاوەرانەی لە دەوروبەری موعاویە کۆببونەوە کۆشك و تەلاریان دروست کردبوو...
پاشان هاواری لەسەرکردن و گووتی:- ئایا ئێوە نەبوون لە دەوروبەری پێغەمبەر بوون و قورئانی بۆ دەهاتە خوارەوە...؟
هەرخۆی وەلاَمی پرسیارەکەی دایەوەو گووتی:- بەڵێ ئێوە بوون کاتێك قورئانی بۆ دەهاتە خوارەوە، بەشداری هەموو دیمانەکانتان دەکرد لەگەڵی...
پاشان گەڕایەوەو گووتی:- ئایا ئێوە ئەم ئایەتەی خوای گەورەتان نەبینیووە

﴿ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ ..تا كۆتايى ئايەتى فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة) معاويه ڕێگاكەی پێگۆڕی‌و گووتی:-

ئەم ئایەتە لەسەر (اهل الكتاب) هاتۆتە خوارەوە...

(ابوذر) هاواریكرد:- نەخێر... لەسەر ئێمەو ئەوان هاتۆتە خوارەوە...

بەم جۆرە (ابوذر) ئامۆژگاری معاویەی دەكرد وازبهێنن لە كۆشك‌و تەلارو بگەڕێنەوە سەر شاڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها بە ئەندازەی بژێوی ڕۆژانە سامان دابكەن...

ئیتر سروودی (ابوذر) لە ماڵان‌و ڕێگاكان ئەمەبوو:-

( بشر الكانزين بمكاو من نار يوم القيامة)...

موعاویە هەستی بە مەترسی دەكرد، ئەم ووشانەی (ابوذر) ترساندی‌و، بەڵام هەر ڕێزی (ابوذر)ی دەگرت‌و، دەستی خراپەی بۆ درێژ نەدەكردو، یەكسەر بۆ خەلیفە عثمان-خوا لێی ڕازی بێت- نووسی‌و گووتی:-

((بەڕاستی (ابوذر) خەڵكی تێك داوە لە شام))...

(عثمان)یش بۆ (ابوذر)ی نووسی‌و داوای كرد بێت بۆ مەدینە.

پاش ئەوەی (ابوذر) گەیشتە مەدینە، لە نێوان ئەم‌و ئیمانی عثمان گفتوگۆیەكی درێژ ڕوویدا، ئیمامی عثمان بە نیازپاكی و ڕاستگۆیی (ابوذر)ی دەزانی‌و جەماوەرێكی زۆریش پشتگیری لێدەكرد، ئینجا لەبەر مەترسی بانگەكەی بڕیاریدا لە مەدینە لە تەكیدا بمێنێتەوە بە (ابوذر)ی گووت:-

(لە تەك من بمێنەوە، سامان بە ئێرە دادێ‌و دەڕوا)

(ابوذر) وەڵامی دایەوەو گووتی:- ( لا حاجة لنا في دنياكم)

واتە :-پێویستیمان بە دونیای ئێوە نیە... بەڵێ پێویستی بە دونیای خەڵك نیە... چونكە یەكێكە لەم خواپەرستانەی كەوا دەگەڕێت لە سامانی ڕوح، دونیایان خۆش دەوێت بۆ بەخشین نەوەكو مشەخۆری‌و وەرگرتن....

ئەوا (ابوذر)ە داوا لە خەلیفە (عثمان) دەكات ڕێگای پێبدات بە دەرچوون بۆ بیابانی (الربذة) دەبینن (ابوذر) هەر بە بەرهەڵستكار مایەوە بەرانبەر ساماندارو دەسەڵاتدارەكان و دەستپاك بوو بەرانبەر خواو پێغەمبەرەكەی‌و، هەروەها گوێڕایەڵ بوو بۆ ئامۆژگاریەكانی پێغەمبەرەكەی ﷺ كەوا شمشێر بەرەو ڕوویان هەڵنەكێشێت، هەروەك بڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەموو نهێنیەكانی دەزانی بە تایبەتی چارەنوسی (ابوذر) و نهێنیەكانی...

ئەوەبوو ئەم ئامۆژگاریە بەنرخەی پێدا دەبینین (ابوذر) بەهیچ جۆرێك مەبەستی ئاژاوەو پشتێوی نەبوو بۆ ئەوەی دژی خەلیفە هەڵسێتەوە، ڕۆژێك هاتنە لای بۆ ئەوەی ئاڵای شۆڕش دژی خەلیفە بڵند بكات ئەویش بەتوندی وەڵامی دانەوە ووتی:-

(سوێند بەخوا ئەگەر عثمان لە درێژترین دار لە دارم بداتو، یان لە چیایەك، گوێڕایەڵی دەکەمو بۆیمل کەچ دەبم و ئارام دەگرم و ئەم پاداشتەم لەخوا دەوێتو، دەبینم ئەمە خێرێکە بۆ من... ئەگەر لەم سەری دونیا بۆ ئەم سەری دونیا بمبات گوێڕایەڵی دەکەمو بۆی مل کەچ دەبمو ئارام دەگرمو ئەم پاداشتەم لەخوا دەوێتو، دەبینم ئەمە خێرێکە بۆ من... وە ئەگەر بمگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆم گوێڕایەڵی دەکەمو بۆی مل کەچ دەبم و ئارام دەگرمو ئەم پاداشتەشم لە خوا دەوێتو، دەبینم ئەمەش خێرێکە بۆ من...

(ابوذر) ژیانی هەموو بۆ ئەوە تەرخان کرد کەوا بەچاوە تیژەکەی و بیر ژیرەکەی تەماشای هەڵەی دەسەڵاتداران و سامانی دەکرد، لەبەرئەوەی سامان و دەسەڵات مرۆڤ دەبات بۆ دونیای ئاژاوەکانی، هەروەها (ابوذر) لەوە دەترسا برایەکانی ئەوانەی هەڵگری ئالای ئیسلام بوو شوێنکەوتووی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوو دەیفەرموو:-

((.... انها أمانة، وانها يوم القيامة خزي وندامة، ... الامن اخذها بحقها، وادي الذي عليه فيها))

واتە:- ئەم راسپاردەیەو، ریسوایی و پەشیمانییە لە ڕۆژی دوایی، تەنها ئەو کەسە نەبێت شایەنی ئەم مافە نەبێت، ئەوەی پێڕاسپاردرایە بەجێی گەیەنێت...

کاتێك (ابوذر) هەندێك فەرمانڕەوای دونیا ویستی بەچاوی خۆی بینی بەرانبەریان زۆر ڕەشبین بوو بە تەواوی وازی لە پەیوەندی لەگەڵ فەرمان ڕەواکانی تریش هێنا، کەوا جێگەی خێریان پێوە دیار بوو...

هەروەها ڕۆژێك دەکاتە (ابو موسای ئەشعەری)، ئەبو موسای ئەشعەری لە کەیف خۆشیان و خۆشەویستی بۆ (ابوذر) باڵەکانی بۆ دەکاتەوە باوەش لە (ابوذر) دەداو دەڵێت:- (مرحبا اباذر... مرحبا باخي)

بەڵام (ابوذر) پاڵی پێوە دەنێتو دەڵێت:-

(من برای تۆ نیم... بەڵکو ئەو کاتە برای تۆ بووم پێش ئەوەی ببیت بە فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدار)

ڕۆژێکیتر دەگاتە ئەبو هورەیرە پاڵ بە ئەمیش وەدەنێتو پێی دەڵێت:- (لێم دورکەوە ئایا نەبووی بە دەسەڵاتدار، خانوبەرت دروست نەکردو، مەڕو ماڵاتو کشتوکاڵت پەیدا نەکرووە).

ئەبو هورەیرەش بەرگری لە خۆی دەکاتو ئەم هەموو دیعایەو پڕوپاگەندانە بەدرۆ دەخاتەوە بەبێ بنچینە لەسەری کراوە...

(ابوذر) ماوەیەك لە (الزبدة) مایەوە خواپەرستی کرد...

ڕۆژێکیان ئەوەندە دەروونی خۆی ماندووکرد بەهۆی راوەستانی بەرامبەر ئیمامی عثمان و موعاویە، ئێش‌وئازار لەسەر جەستەی زۆر بوو خێزانەکەی خزمەتی دەکرد...

تای قەزاوقەدەر بۆی هات و (ابوذر) لەدوا هەناسەی مردن بوو، سەری بەرزکردەوە بینی خێزانەکەی بۆی دەگریێت پێی گووت:- بۆچی دەگرییت؟

ئەویش گووتی:- چۆن نەگرییم تۆ دەمریت لە چۆلایی و کەس نیە بە خاکت بسپێری و هیچ جلێکم لا نیە پێی کفت بکەم...

(ابوذر) پێی گووت:- مەگری مزگێنیت بدەمێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە بە چەند کەسێکی فەرمووە منیش لەگەڵیان بووم:-

(ليموتن رجل منكم بفلاة من الأرض فتشهده عصابة من المؤمنين). واتە:- یەکێك لە ئێوە لە چۆلایی دەمرێت کۆمەڵێك لە بڕواداران دەیبینن...

جا ئەم کۆمەڵی کەسیان نەماوە ئەوا لە شار یان لە گوند مردووە ئەوە منم لە چۆلایی دەمرم، سوێند بەخوا نە درۆم کردووەو نە درۆم لەگەڵ کراوە، تەماشای ڕێگا بکە....

خێزانەکەی گووتی:- بەڕاستی حاجیەکان هەموویان ڕۆیشتوون...

خێزانەکەی جار جارە دەچووە سەر تەپۆلکەیەك و تەماشای دووری دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە سەری بۆ خزمەت کردنی، ئەمەی چەند جاران دووبارە کردەوە، پاشان تەماشای کرد خەڵکانێك وا بەرەو ڕوویان دێن ئەویش دەستی بۆ بڵندکردن تاکو بینیان و هاتن بۆ لایان و پاشان گووتیان:-

ئەی بەندی خوا چیتە؟

ئەویش گووتی پیاوێکە لە موسڵمانان دەمرێ و کفنی بکەن؟ گووتیان:-

ئەمە کێیە؟ گووتی:-(ابوذر) یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ ...

بە پەلە چوونە سەری لەمانە (عبداللەی کوڕی مەسعود)یشیان لەگەڵ بوو، چوونە لای و پێی گووتن:-

مزگێنیتان بدەمێ، هەمان فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێندنەوە، پاشان پێی گووتن:- ئێوە گوێتان لێیە ئەگەر من کفنم هەبوایە یاخود لە لای خێزانم بوایە داوام لە ئێوە نەدەکرد... ئێوە گوێتان لێیە! سوێندتان دەدەم بە خواو ئیسلام هەر کەسێك ئەمیر بێت یان عەریف بێت یان نەقیب بێت یاخود پۆستەچی بێت با کفنم نەکات، ئەم کۆمەڵە هەر هەموویان لێپرسراوەتیان وەرگرتبوو تەنها ئەنصاریەك نەبێت گووتی:-

ئەی مامە: من کفنت دەکەمو لێپرسراوەتیم نەکردووە، لەم کراسەی بەرم کە دایکم بەدەستی خۆی چنیتی کفنت دەکەم...

(ابوذر) گووتی:- تۆ کفنم بکە، ئەنصاریەکە کفنی کردوو (عبداللەی کوڕی مەسعود)یش نوێژی لەسەر کرد پاشان (عبداللەی کوڕی مەسعود)-خوا لێی ڕازی بێت- دەستی بە گریان کردو گووتی:- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرمووە:- (يمشي وحده و يموت وحده و يبعث وحده).

ئێمەش دەڵێین:-

ڕەحمەتی خوا لە (ابوذر) کەوا بە تەنها ڕۆیشت و بە تەنها زیندوو دەکرێتەوە...

(٨٣)

# عبداللەی کوڕی مەسعود

## موجاهید و نووسـەری نیگاو موفـتی و گـەورەی قورئان خوێنـان

لە یەکێك لە پارەنەکان لە شاری مەککەی پیرۆز، مێردمنداڵێك مەڕی دەلەوەڕاند بۆ یەکێك لـە دەوڵەمـەندەکانی قورەیـش، پێغەمبـەری خـوا ﷺ چووە لای و یـاوەری بـەڕێز ئەبوبـەکری صـدیقیشی لەگـەڵ بـوو خـوا لـێی ڕازی بێـت– ، داوای شـیریان لـێ‌یکرد بەڵام دەستپاکی ئەم منداڵە پیرۆزو لەبەرئەوەی ئەمەی بەردەستی ڕاسپاردەبوو، ڕێگـای پێ‌تەدا لەم ڕاسپاردەیە شتێکیان پێ‌بدات، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ زۆر دڵی خۆش بوو بە دەستپاکی ئەم مێرد منداڵەو پێ‌ی فەرموو:–

کەواتە مەڕێکمان بدەرێ لەمەو پێش گوانەکانی شیری نەهاتبێ واتە: بەرخ بێ‌و تازو بوبێ بە مەڕ و جووت نـەبووبێ ئـەویش داواکاریەکـەی جێ‌بـەجێ‌کردو ئـەوەی ویستیان بۆی هێنان، پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بە گوانەکانی داهێناو لەبەر خـۆی نـزای کـرد، گوانەکانی پڕبوون لە شیر، ئەبوبەکری صـدیق–خوا لـێ‌ی ڕازی بێـت– جامێکی هێنـاو شیرەکەی دۆشیە ناو جامەکە، ئینجا ئەبوبەکرو مێرد منداڵەکە شیریان تێدا خواردەوە، پاشـان پێغەمبـەر ﷺ خواردیـەوە تـاکو تـێر بـوون، دەسـتی پـیرۆزی بـە گوانـەکانی داهێناوەو، بە مەڕەکەی فەرموو:– بۆیەك وەرەوە، گوانەکانی وەکو جاران پوچ بوونەوە– پاشـان پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ هاوڕێکەی ملی ڕێگایـان گرتەبـەر... ئـەم بابەتـەی باسمـان کرد لە سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعجیزە دەژمێردرێت واتە مرۆڤ بەرامبـەر ئـەم کارە داماوو دەستەوەستانە...

ئـەم گـەنجە تـازە پێگەیشـتووە کـاتێك ئـەم کـارەی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بینـی سەرسـوڕمان بـوو خـۆی گـەیاندە پێغەمبـەر ﷺ و هاوڕێکـەی، داواو پرسـیاری لـە پێغەمبـەری مـەزن ﷺ کـردو گووتـی:– ئـەم کـارەم فـێر بکـە کـە خـۆت لـە سـەریتی، پێغەمبـەری ئازیز ﷺ پـێ‌ی فـەرموو: ((انك غـلام معلـم)) واتـە:– تـۆ مـێرد منداڵێچکـی فێرکراویت، ئەویش موسڵمان بوو بە موسڵمانێکی چاك‌و بێ‌هاوتا و بێ‌وێنە.

ئینجا لێرەدا ئەم مێرد منداڵە دەبێتە داستانی ئەم جارەمان ئەم مێرد منداڵەش قارەمانی بەڕێزو یاوەری مەزن عبداللەی کوڕی مەسعود کوڕی غافیل کوڕی حەبیبەو کوڕی لە هۆزی (بني هوذیل)ە....

دایکی (أم عبد) کچی بەندە (ود) کوڕی سەوداء کوڕی قەریم کوڕی هوذیل...

نازناوی عبداللەی کوڕی مەسعود (باوکی عبدالرحمن)بوو... یـەکێك بـوو لـە هـەرە پاکەکانی هۆزەکەی خۆی....

عبدالله‌ی كوڕی مه‌سعود-خوا لێ‌ی ڕازی بێت- له‌ژێر ده‌ستی دایك و باوكێكی هه‌ژار په‌روه‌رده بوو یه‌كێك بوون له‌ چه‌وساوه‌كان كه‌وا خۆیان ده‌پاراست به‌ هۆزه‌ به‌هێزه‌كان له‌ ده‌ست درێژی هۆزه‌كانی‌تر.

كاتێك ئه‌م مێرد منداڵه‌ تۆزێك چاوی بۆوه‌، له‌ سه‌ره‌تادا بوو به‌ شوانی مه‌ڕ بۆ عوقبه‌ی كوڕی ابي موعیط...

وا دیاره‌ ئه‌م هه‌ژاریه‌ی تێیدا په‌روه‌رده‌ بوو كاری كرده‌ سه‌ر گه‌شه‌ی هه‌ڵینه‌دا، له‌به‌رئه‌وه‌ عبدالله‌ پیاوێكی بچووك و كورته‌باڵا بوو، كاتێك هه‌ڵده‌ستاوه‌ باڵای به‌قه‌ده‌ر پیاوێكی دانیشتوو بوو و ڕه‌نگی پێستی زۆر به‌لای ئه‌سمه‌ردا بوو... به‌ڵام كورتی باڵای و لاوازی لاشه‌ی له‌ هێزو توانای كه‌م نه‌كرده‌وه‌ كێشی به‌قه‌د كێشی زێڕ بوو و ئیسلامی ئازیز به‌ هۆی له‌خواترسانه‌كه‌ی و یاوه‌ریه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و جیهاده‌كانی به‌رزی كرده‌وه‌ بۆ ڕێزی زانا موجاهیده‌ پاكه‌كان... له‌به‌رئه‌وه‌ی كێشانه‌ی ئیسلام به‌ سامان و به‌ژنوباڵا و ڕووكه‌شه‌كه‌ی نیه‌ به‌ڵكو ئیسلام ته‌ماشای كرده‌وان ده‌كاو هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌ری پێشه‌وا ﷺ ده‌فه‌رموویت:-

(خوای گه‌وره‌ ته‌ماشای شێوه‌و جه‌سته‌تان ناكات به‌ڵكو ته‌ماشای ناو دڵتان ده‌كات).

بانگه‌وازی ئیسلام تازه‌ ده‌یویست له‌ شاری مه‌ككه‌ بڵاوه‌ بكات، موسڵمانان به‌ نهێنی‌و به‌ كه‌می ده‌هاتن بۆ ناو ئیسلام، وه‌ ئه‌وه‌ی ده‌هاته‌ ناو ئیسلام به‌ره‌نگاری زۆر ئازارو ئه‌شكه‌نه‌و به‌لا ده‌بۆوه‌...

له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش عبدالله‌ی كوڕی مه‌سعود یه‌كێك بوو له‌ هه‌ژاره‌ چه‌وساوه‌كان ئه‌م هه‌ژاریه‌ی قه‌ده‌غه‌ی نه‌كرد بۆ هاتنی بۆ ناو ئیسلام پاش ئه‌وه‌ی دڵی قه‌ناعه‌تی هێنا به‌ڕاستی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پاش ئه‌م پێگه‌یشتنه‌ مێژوویی‌یه‌ی بینی...

به‌م جۆره‌ كه‌سایه‌تی كوڕی مه‌سعود گۆڕا بۆ كه‌سایه‌تیه‌كی ئیجابی‌و بوونی خۆی و ئاماده‌یی بۆ ناو ئیسلام ڕاگه‌یاند، له‌گه‌ڵ ئه‌م بارودۆخه‌ كۆمه‌ڵایه‌تیه‌ی له‌ناوی دا ده‌ژیا، ئیتر كوڕی مه‌سعود به‌ پیر بانگه‌كه‌ی ئیسلام هات‌و به‌ یه‌كێك له‌ مسوڵمانه‌ سه‌ره‌تا و پێشه‌نگه‌كان ده‌ژمێردرێت كه‌وا په‌له‌یان كرد بۆ گوێڕایه‌ڵی پێغه‌مبه‌ر و ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌.

عبدالله‌ی كوڕی مه‌سعود-خوا لێ‌ی ڕازی بێت- له‌ناو یاوه‌ره‌كان به‌وه‌ ده‌ناسرێت كه‌وا بڕواداریكی ئیمان به‌هێزو به‌ غیره‌ت بووه‌ له‌سه‌ر هه‌ق‌و، تاكو ده‌ڵێن به‌ یه‌كه‌مین كه‌س ده‌ژمێردرێت كه‌وا قورئانی به‌ ئاشكرا له‌ مه‌ككه‌ خوێندۆته‌وه‌ پاش پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ...

هه‌ندێك له‌ یاوه‌ره‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ڕۆژێك كۆده‌بنه‌وه‌و ده‌ڵێن:-

سوێند به‌خوا تاكو ئێستا قوڕه‌یش گوێ‌یان له‌ پیاوێك نه‌بووه‌ قورئان به‌ ئاشكرا بخوێنێته‌وه‌، كێ هه‌یه‌ بۆیان بخوێنێته‌وه‌؟

عبدالله گووتی:- من....

یاوەرەکان گووتیان:- ئێمە لەتۆ دەترسێین، بەڵکو پیاوێکمان دەوێت هۆزێکی هەبێت بیپارێزێت لەمانە ئەگەر مەبەستیان بوو...

عبدالله گووتی:- وازم لێ بهێنن خوا لەمانە دەمپارێزێت...

ڕۆیشت تاکو قورەیش کۆمەڵەیان کرد، ئەویش بە دەنگێکی بەرز گووتی:-

((الرحمن علم القرآن، خوێندیەوەو دەنگی بەرز کردەوە تاکو قورەیش بینیان و ستەمکارەکان دەیانگووت:-

کوڕی (ام عبد) چی دەڵێت؟ پاشان گووتیان ئەمە ئەوە دەخوێنێتەوە کە بۆ موحەممەد هاتووە.

پەلاماریان داو لە دەموچاوی پیرۆزیان دا ئەویش تەماشای نەدەکردن و لە خوێندنەوەی خۆی بەردەوام بوو تاکو خوێن لە دەموچاوی هاتە خوارەوە ئەویش ئەوەندەی خوێندەوە کەوا خوا حەزی پێکرد، پاشان گەڕایەوە لای هاوڕێکانی و پێیان گووت:- ئەمەبوو لەسەرە تۆ لێی دەترساین...

ئەویش گووتی:- سوێند بەخوا تا ئێستا دوژمنانی خوا لەبەر چاوم ئەوەندە سوكو ڕیسوا نەبووە، ئەگەر حەز دەکەن دووبارە بچمەوە سەریان..

ئەوانیش گووتیان:-

ئەمەت بەسە، ئەوەی ئەوان پێیان ناخۆش بوو بە بەر گوێت دان.

ئینجا ئەوە بوو عبداللەی کوڕی مەسعود بڕواداری بەهێزی خاوەن دڵی چەسپا، کەوا گوێنەدا بەوەی چی بەسەر دێت لە پێناوی خوا لەوەی پێیان کرد لە لێدان و ئازارو ئەشکەنجە، بەڵکو دڵی بەمە خۆش دەبوو کەوا پلەی بەرز دەبێتەوە لە لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ....

ئیتر پاش ئەوەی قورەیش بە موسڵمان بوونی عبداللەی کوڕی مەسعودیان زانی- خوا لێی ڕازی بێت- ئەبوجەهلی نەفرەت لێکراو لەگەڵ باقی موسڵمانە چەوساوەکانیتر ئازاریدان... موسڵمانانیش زۆر بە ئازاریانە ئارامیان گرت لەسەر ئەم ئازارە هەرچی عبداللەی کوڕی مەسعود بوو لەبەرئەوەی پیاوێکی بچوك و لاواز بوو، ئەم ئازارو ئەشکەنجە بێوێنەیە کاری لێکرد... هەرکە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بە هیجرەت بۆ حەبەشە، عبدالله پەلەی کرد بۆ ڕۆیشتن بۆ حەبەشە لەگەڵ ئەوەی ئەم گەشتە پڕ بوو لە مەترسی و ناخۆشی و ماندووبوون، بەڵام ئەم بەرگەی ئەوانەی هەموو گرت لە پێناوی خوا...

کاتێك گەیشتنە حەبەشە بەخێرهاتنێکی چاك کران لە لایەن پادشای حەبەشە، موسڵمانان زۆر کەیف خۆش بوون بەمە پاش ئەوەی خۆیان وەکو بەندەیەکی خوا بە

ئازادی بینیەوە، کەوا کەس ئازاریان نادات و نایان چەوسێنێتەوە، بە دڵنیایی و ئارامی ژیانیان بردەسەر هیچ خەمێکیان نەبوو تەنها دووریان نەبێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ

پاش ئەوەی عبدالله و موهاجیرەکان سۆزو پەرۆشیان بۆ مەککە هەڵسا گەڕانەوە بۆ شاری مەککە، بۆ ئەوەی بگەنەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و لەگەڵ ئەم ژیان ببەنەسەر....

بەڵام ئەوەندەی نەبرد دووبارە عبداللەو هاوڕێکانی کەوتنەوە بەر ئازارو ئەشکەنجەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانیان بردەسەر...

پاشان عبدالله-خوا لێی ڕازی بێت- کۆچیکرد بۆ شاری مەدینە یەکەمین پایتەختی دەوڵەتی ئیسلام...

پاش ئەوەی لە مەدینە جێگیر بوون پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان عبدالله و موعاذی کوڕی جەبەل-خوا لێیان ڕازی بێت-

ئینجا لەم ڕۆژەی عبدالله بوو بە موسڵمان ئەم مێردمنداڵە بەختەوەرە لە شوانی مەڕان گواستیەوە بۆ خزمەتکردنی ئادەمیزاد، عبداللەی کوڕی مەسعود بە جۆرێکی وا بە پێغەمبەری خوا ﷺ وەنوسا هەروەك سێبەر لەگەڵ خاوەنەکی، لە سەفەرو لە ماڵدا لە گەڵی بوو، لەدوای دەڕۆیشت لە ماڵەوەو لە دەرەوەی ماڵەوە، ئەگەر خەوی لێکەوتبا بانگی دەکرد، کاتێك خۆی دەشوشت جلی بۆ دەهێناو، ئەگەر نیازی دەرەوەی هەبوایە پێڵاوەکانی بۆ دەهێناو، کاتێك دەهاتەوە لە پێی دەکردەوە، گۆپاڵ و سیواکی بۆ هەڵدەگرت، دەرگای بۆ دەکردەوە کاتێك نیازی ژوری خۆی هەبوایە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێدابوو بێتە لای هەرکاتێك حەز بکات، لە هەموو نهێنیەکانی بگات بە بێ ئەوەی پێی ناخۆش بێت و لە دڵی گران بێت، تاکو وای لێهات نازناوی خاوەن نهێنی پێغەمبەری خوایان لێنا...

عبداللەی کوڕی مەسعود لە ماڵی پێغەمبەری خوا پەروەردە بوو هیدایەتی ئەوی وەررت و هەڵسوکەوتی ئەوی هەڵگرت، شوێنکەوتووی هەموو ڕەوشتەکانی ئەم بوو، تاکو دەربارەی دەیان گووت:- نزیکترین کەسە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شێوەو ڕەوشت .... ئەمە بووە هۆی شوێنێکی تایبەتی لەدڵی پێغەمبەری پێشەوا بکاتەوە تاکو لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی:-

رضيت لامتي ما رضى لها ابن ام عبد، و سخطت لها ما سخط ابن ام عبد، يعني عبدالله بن مسعود...

واتە:- لە ئومەتم ڕازیم کەوا کوڕی (أم عبد) لێیان ڕازیە، لێیان ناڕازیم لەوەی کوڕی(أم عبد) لێیان ڕازی نیە واتە:- عبداللەی کوڕی مەسعود...

هەروەها دەفەرمووێت:- تمسكو بعهد ابن ام عبد، واهتدوا بهدي عمار بن ياسر..

واتە:- دەست بگرن بە پەیمانی کوڕی (أم عبد)، ئەم ڕێگایە بگرن کەوا عەممار کوڕی یاسر گرتوویەتی...

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لایەنی عبداللەی کوڕی مەسعودی دەگرت بەرامبەر ئەو کەسەی دەیویست هەقی بخوات یان گاڵتەی پێبکات.

هەروەك ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عبداللەی کوڕی مەسعود بەسەر دارخورما بکەوێت و هەندێ خورمای بۆ لێبکاتەوە، هاوڕێکانی لاقە باریکەیکانیان بینی پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- بە چی پێدەکەنن، سوێند بە خوا پێیەکانی عبدالله لە تەرازووی خوا گرانترە لە چیای ئوحد...

کاتێك پێغەمبەری پێشەوا هاتە مەدینە هەندێك خەڵکی بینی عبداللەی کوڕی مەسعود دەچەوسێننەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

إن الله لا يقترس قوماً لا يعطي الضعيف منهم حقه ....

واتە:- خودا میللەتێك پیرۆز ناكات كەوا مافی بێهێزەكانیان نەدەن...

پاش ئەووەی خوای گەورە جیهادی فەرز کرد لەسەر موسڵمانان بۆ بەرگریکردن لە ئایینەکەیان، بەرەنگاری دوژمنەکانیان بوونەوە لە پایتەختی ئیسلام مەدینەی پیرۆز....

عبداللەی کوڕی مەسعود بەشداری هەموو دیمانەکانی کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، دەورێکی بێوێنەی بینی لە جەنگی بەدری گەورە، گەیشتە سەر ڕۆحی ئەبو جەهل(عەمروی کوڕی هیشام)، بەشدار کوشتنی ئەم ستەمکارە گەورەی کرد لەگەڵ دوو گەنجە موسڵمانەکە، بەڵام کوڕی مەسعود زووتر گەیشتە سەری عبداللەی کوڕی مەسعود دەڵێت:-

ڕۆژی بەدر چوومە لای پێغەمبەر ﷺ گووتم ئەی پێغەمبەری خوا !! من (ئەبو جەهل)م کوشت.

بەو خوایەی هیچی تر نیە سوێندی پێبدەم ئایا کوشتت؟ گووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی:- با بڕۆین ببینین. وە دەڵێت:- لەگەڵی ڕۆیشتن تاکو لەسەر سەری وەستام، فەرمووی:- سوپاس بۆ ئەم خوایەی تۆی ڕیسوا کرد ئەی ئەبوجەهل، ئەمە فیرعەونی ئەم ئومەتەیە، پاشان پێغەمبەری خوا شمشێرە غەنیمەکەیدا بەمن.

بەم جۆرە کوڕی مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- دەورێکی گرنگی هەبوو لە جەنگەکانی بەدرو خەندەقو لە پەیمانی رضوان و فەتحی مەککەو جەنگی حونەین...

ڕۆژێکیان عبدالله دانیشتبوو دەپاڕایەوە لەبەر خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- داوابکە پێت ببەخشرێ، گووتی:- چیم پێببەخشرێ پاشان گووتی:-

پەروەردگار من داوای ئیمانێك دەکەم لە تۆ هەڵمەنەگێڕێتەوە و خۆشیەك بڕانەوەی نەبێتو، هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەت موحەممەد لە بەرزترین بەهشتی نەبڕاوە.

بەڵێ خوای گەورە خۆشیەکی پێبەخشی لە دونیا تا دوا هەناسەی بڕانەوەی نەبوو ئەمیش زانستی قورئان بوو هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی دەفەرموویت:-

قورئان لە چوار کەس وەرگرن:- لە عبداللهی کوڕی مەسعود و، موعاذی کوڕی جەبەل و، ابی کوڕی کەعب و سالم بەندەی ئازادکراوە ئەبو حوذەیفە....

لە فەرمودەیەکی (صحیح)ی‌تر پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:-

هەرکەسێك حەز دەکات قورئانی بۆ بخوێنێتەوە بە تەڕی هەروەك تازە هاتبێتە خوارەوە با بیخوێنێتەوە لەسەر خوێندنەوەی کوڕی (أم عبد)...

هەروەها لە تەواوی‌و ژیری عبدالله پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:-

ئەگەر یەکێك بکەم بە ئەمیر بەبێ ڕاوێژکردن فەرمانم بە عبداللهی کوڕی مەسعود دەکرد...

عبداللهی کوڕی مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- بە یەکەمین نووسەری نیگا دەژمێردرێت، کەوا حەفتا سورەتی لە دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە بە ڕاستی ئەمەش بەخششێکی ترەو کەس پێی نەگەیشتووە...

هەروەها پاش کۆچی دوایی شانازی جیهان ﷺ عبدالله گەورەترین ڕێزی لێگیراوە لە لایەن ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر-خوا لێیان ڕازی بێت- هەروەك کاتێك ئیمامی عومەر چەند پێشەوایەکی ڕەوانەی کوفە کرد خەڵك فێرە ئایین بکەن عبداللهی کوڕی مەسعودی هەڵبژارد و نامەیەکی نووسی‌و بۆی ناردن تێیدا گووتی:-

((من عەمماری کوڕی یاسرم بە ئەمیر بۆ ڕەوانە کردوون، عبداللهی کوڕی مەسعود وەکو مامۆستایەك‌و شالیارێك (وزیر)، ئەمانە لە یاوەرە پاکەکانی یاوەرانی پێغەمبەری خوان ﷺ لە دوایان بڕۆن و گوێ لە قسەکانیان بگرن‌و گوێڕایەڵیان بکەن...

بەم جۆرە عبداللهی کوڕی مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- جێگای بڕوایەکی مەزن بوو لە دەرونی موسڵمانان... پیاوێك هاتە لای ئیمامی عومەر لە عەرەفات، گووتی:-

من لە کوفە هاتوومە لات، پیاوێکم تێیدا جێهێشتووە قورئان لەناو دڵیەوە دەخوێنێتەوە.

ئیمامی عومەر گووتی:- خاکت بەسەر ئەمە کێیە؟ ( لەبەرئەوەی ئیمامی عومەر زۆر ڕقی لە بەسەردا هەڵگووتن دەبۆوە).

پیاوەکە گووتی:- عبداللهی کوڕی مەسعود.

عەلقەمە دەڵێت:- ئیمامی عومەر زەردەخەنەی بردەوەو گووتی:-

(سوێند بەخوا هیچ کەسم نەزانیوە شایەنی ئەمە بێت بێجگە لە کوڕی (أمّ عبد).

زەیدی کوڕی وەهەب-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:-

من لە لای ئیمامی عومەر دانیشتبووم پیاوێکی بچووکی لاواز هاتە لامان، عومەر تەماشای کرد و ڕووی پیرۆزی گەش بۆوە پاشان گووتی:- پڕە لە زانست، سێ جاران

ئەمەی گوتووەوە... تە، اشام کرد عبداللەی کوڕی مەسعودە، بەڕاستی عبداللەی کوڕی مەسعود شایەتی ئەم مافە بوو... لە خەلافەتی ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- خەڵکانێك لە لای باسی عبداللەی کوڕی مەسعودیان کرد لەگەڵ هەندێك لە وتەکانی پاشان پێین داهەڵگووت و گوتیان:-

(ئەی ئەمیری بڕواداران، هیچ پیاوێکمان نەبینی وەك ئەو بە ڕەوشت بێ و بە نەرمی خەڵك فێری ئاین بکات و، وە هیچ کۆڕێکیشمان نەبینی جوانتر بێت و قەڵەباڵغ تر بێت و زیاتر لەخواترسیانی هەبێت لە عبداللەی کوڕی مەسعود، عەلی گووتی:- بۆ خوا پێتان دەڵێم ئەمە ڕاستیە لەناو دڵتان؟ گووتیان:- بەڵێ، ئەویش گووتی:-

(پەروەردگارا من تۆ دەکەم بە شاهێد کەوا ئەوان چی دەڵێن منیش ئەمەی ئەوان دەڵێم و چاکتریش:-

قورئانی خوێندەوە حەڵاڵی تێیدا حەڵاڵ کرد و حەرامی تێیدا حەرام کرد شەرع ناسێك بوو لە ئاین و، زانا بوو لە سوننەت.

ئەمەش بیروڕای گەورەترینی یاوەرانی پێغەمبەری خوا بوون دەربارەی عبداللەی کوڕی مەسعود.

عبداللەی کوڕی مەسعود ئەوەندە شارەزا بوو لە قورئان تاکو دەیزانی هەموو ئایەتەکانی قورئان کەی هاتۆتە خوارەوە لە کوێ هاتۆتە خوارەوە، هەروەها شارەزاترینی فەرموودە ناسەکان بوو لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی لە ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی و ئیتر گێڕاوەتەوە... هەروەها کوڕەکەی عبدالرحمن و ابوعبیدە و برازاکەی عبداللەی کوڕی عوتبەو خێزانەکەی زەینەبی ثەقەفی و ئیتر ...

هەروەها بە یەکێك لە موفتیەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دەژمێردرێت کە ئەمانەش حەفت یاوەر ناسرابوون بە شەرع ناس و دەست پاکی و لەخواترس، ئەمانەش:-

(عومەری کوڕی خەطاب و، عەلی کوڕی ابو طالب و، عائیشە و، عبداللەی کوڕی مەسعود و، زەیدی کوڕی ثابت و، موعاذی کوڕی جەبەل و، عبداللەی کوڕی عومەر) بوون...

ئەوەی جێگای سەرسوڕمان نیە پاش عبداللەی کوڕی مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- شەرع ناس و زاناو فەرموودەناس و پێشەوا بوو... بەڵام لەگەڵ زانست داوای ئەمەش دەکات کاری پێبکەیت بە قسەو کردەوە.

عەلقەمە دەگێڕێتەوە دەڵێت:- کوڕی مەسعود دەڵێت:-

(تَعلّموا العِلمَ فإذا عَلِمتُم فاعْمَلوا)

واتە:- زانست فێربن ئەگەر فێریشی بوون کاری پێبکەن..

عەدی کوڕی عەدی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:- عبداللەی کوڕی مەسعود دەڵێت:-

( وَيْلٌ لِمَنْ لا يَعْلَمْ وَلَو شاءَ اللهُ لَعَلَمَهُ، وَ وَيْلٌ لِمَنْ يَعلَمْ ثُمّ لا يَعْمَلْ).
واته:- خاك بەسەر ئەو كەسەی فێر نابێت، وە ئەگەر خوا حەز بكات فێر دەبێت، وە خاك بەسەر ئەو كەسەی فێر دەبێت پاشان كاری پێ ناكات....
عبدالرحمن كوڕی زەید دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-
هیچ شەرع ناسێكم نەبینی وەكو عبداللەی كوڕی مەسعود كەم بەڕۆژوو بێت پێیان گووت:-
بۆچی زۆر بەڕۆژوو نابیت؟
گووتی:- من نوێژم بەسەر ڕۆژوو هەڵبژاردووە، ئەگەر بەڕۆژوو بم بۆ نوێژ بێ‌هێز دەبم...
(ئەمەش لەبەرئەوە بوو هەروەكو گووتمان پیاوێكی لاواز و گەشەی بێ هێز بوو...)
لەگەڵ ئەمەش هەموو دووشەممەو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو.
ئەم ووتەو پەندە بەنرخانەش هەندێك نموونەی ئەم یاوەرە بەڕێزەن، دەفەرمووێت:-
( لا يَبْلُغ عَبدٌ حقيقة الإيمان حَتى بِنَزوَتِهِ، وَلا يَحِلّ بِذَروَتِهِ حَتّى يكون الفقر أحبّ اليهِ مِنَ الغَنيّ،والتواضع أحَبّ إلَيهِ مَتَ الشَرَف،وَحَتّى يَكونَ حامِدُهُ و ذامّهُ سواء عِنْدَهُ).
واته:- بەندە ناگان بە ڕاستی ئیمان تاكو نەگات بە لوتكەی، ناگات بە لوتكەی تاكو هەژاری لەلا خۆشەویستر نەبێت لە دەوڵەمەندیو، سادەیی لەلا خۆشەویستر نەبێت لە گەورەییو، تاكو پێدا هەڵگووتنو لۆمەكردنی لەلا وەكو یەك نەبێت.
هەروەها دەڵێت:-
(انّما الدنيا كالثّعب ذهب صَفْوُهُ و بَقِيَ كَدرُهُ...) واته:- دونیا وەكو ئاوی بارانە بە دۆڵێك بڕوات ئاوە پاكەكەی دەڕواو پاشماوەكەی دەمێنێتەوە...
مونذر دەگێڕێتەوە دەڵێت عبداللەی كوڕی مەسعود دەڵێت:-
(إنّكُم تَرَونَ الكافِرَ مِنْ اصَحّ النّاس جِسْماً و امْرَضِهِم قَلْباً، وَتَلْقَونَ مِنْ اصَحّ النّاسِ قلْباً وامرَضِهِم جِسْماً).
واته:- ئێوە بێباوەڕ دەبینن ساغترین جەستەی هەیە و نەخۆشترین دڵی هەیەو، بە بڕوادار دەگەن دڵی لە هەموو كەسێك ساغ ترەو جەستەی لە هەموو كەس بێ‌تەندروستی‌ترە...
پیاوێك هاتە لای عبداللەی كوڕی مەسعود گووتی:- ئامۆژگاریم بكە ئەی باوكی عبدالرحمن، ئەویش گووتی:-
( لِيَسعْكَ بيتُكَ، وَاكفُفْ لِسانَكَ، وَابْكِ عَلى خَطيئَتِكَ).
واته:- ماڵت فراوان بكەو، زمانت بگرەو، لەسەر گوناهەكانت بگری...
بەڵی ئەمە بوو قارەمانی مەزنمان عبداللەی كوڕی مەسعود پیاوێكی لاواز شوانی مەككەو، چەوساوە پێش ئیسلام، پاشان ئیسلام بەرزی كردەوەو هێنایە ئاستی یاوەرە

گەورەکان و موهاجیرە موجاهیدەکان، خوای گەورە عبداللەی کوڕی مەسعودو هاوچەشنانی بەرزکردەو ئەبوجەهل و هاوچەشنانی ریسواو سەرنگووم کرد... ئەم عبدالله لاوازو بێهێزە، پێیە باریك و لاوازەکانی لە تەرازووی خوا گرانتر بوو لە چیای ئو حد هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداین...

ئەمەش کورتەیەك بوو لە ژیانی ئەم قارەمانە مەزنەو ژیانی پڕە لە پەندو ئامۆژگاری ووتەکانی جێگای ئەوەن ببن بە پێشەنگ و جێگای کارکردنی موسڵمانان ووتەکانی هەروەك ئەستێرە رووناکی دەدەنەوە...

پاش شەست و هەندێك ساڵ عبداللەی کوڕی مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- گەیشت بە پەروەردگاری و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی، لە شاری مەدینەی پیرۆز لە ساڵی سی و دووی کۆچی خەلیفەی سێیەم عثمان کوڕی عەففان یان عەماری کوڕی یاسر-خوا لێیان ڕازی بێت- نوێژیان لەسەر کردون لە گۆڕستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا پاش ژیانێکی پڕ لە خێرو بەرەکەت رەحمەتی خوا لە کوڕی مەسعودو، خوا پاداشتی چاکەکانی بداتەوەو، ئێمەش بگەیەنێت بەم پیاوە چاکە -آمین یا ربّ العالمین-..

# (٨٤)

# طــەلحەی کوڕی عبیداللەی تەمیمی

## هەڵۆی ڕۆژی ئوحــد

طـەلحـەی کـوڕی عبیـداللەی تـەمیمی لەگـەڵ کـاروانێك لـە کاروانـەکانی بازرگـانی قوڕەیش دەڕۆیشت بۆ وڵاتی شام، کاتێك کاروانەکە گەیشتە شاری (بوصـرا) لە سوریا، پیـاوە مـاقوڵانی بازرگـانی قوڕەیـش ڕوویـان کـردە بـازاڕە قەڵەباڵغـەکان دەیـانکڕیو دەیانفرۆشت.

لەگەڵ ئەوەی طـەلحە گەنجێکی بە تەمەن بچووك بوو وەکو ئەوان شارەزایی نەبوو لە بازرگانی، بەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا خـاوەنی بیـرێکی تیـژو ڕووناکبیـر بـوو پێشـبڕکێی ئەوانی دەکرد، بەڵکو لە زۆربەی کارەکان لەوان زیرەکتر بوو.

کاتێك طـەلحە دەهاتو دەچوو لـە بازاڕەکان کەوا شـەپۆلـی نوێنـەرکانیان لـە هـەمو لایەك شالاوی بۆ دەهێنا، کـارێکی بەسـەر هـات بـە تەنـها ڕێـڕەوی ژیـانی بـە تـەواوی ئەگۆڕی...

بەڵکو بووە مزگێنی دەرێك بە گۆڕینی سەرتاپای ڕێڕەوی مێژوو...

ئینجا با لێرەدا ئەم چیرۆکە کارلێکەرە بۆ خودی طـەلحە لێگەڕێین.

طـەلحە-خوا لـێی ڕازی بێت- دەڵێت:-

کاتێك ئێمە لە بازاڕی (بوسرا) بووین، ڕاهیبێکی لەلەکان بانگی خەڵکی دەکرد:-

ئەی کۆمەڵی بازرگانان، پرسیار لە خەڵکی کۆمەڵی ئەم وەرزە دەکەم، ئایا یـەکێکتان لەگەڵە خەڵکی حەرەم (مەککە) بێت؟

من لـێی نزیك بووم ڕووم تێکردو گووتم:-

بەڵێ من خەڵکی حەرەمم.

گووتی:- ئایا (ئەحمەد) لە نێوتان بەدیار کەوتووە؟

گووتم:- (ئەحمەد) کێیە؟!

گووتی:- کوڕی عبداللە کوڕی عبدالمطلب...

ئەمەیە ناوبانگی کەوا پەیدا دەبێتو... کۆتایی پێغەمبەرەکانە...

لە خـاکی ئێوە لـە حەرەم پەیدا دەبێتو، کۆچ دەکاتو بۆ خـاکێکی خـاوەن بـەردی ڕەشو بە خورماو بە ئاوێك ئاوی لـێهەڵدەقوڵێت...

ئەی گەنجە ئاگادارت دەکەمەوە پێی بگەیت...

طـەلحە دەڵێت:- قسەکانی کەوتە ناو دڵمو، گەڕامەوە لای وشـترەکەم بـارم تێکنـاو، کاروانەکانم لە دوای خۆم جێهێشت، بەپەلە گەیشتمەوە مەککە.

کاتێك گەیشتمەوە مەککە،بە کەسوکارم گووت:-

ئایا شتێك ڕووی داوە لە دوای ئێمە لە مەککە؟ گوتیان:- بەڵێ محمدی کوڕی عبدالله دەڵێت من پێغەمبەرم، کوڕی ابو قوحافەش (ابوبکر) بە دوای کەوتووە.
طەلحە گووتی:-
من دەمزانی ئەبوبەکر، پیاوێکی هێمن‌و لەسەرەخۆ و خۆشەویستە... هەروەها بازرگانێکی بە ئیستیقامەو ڕەوشتەو، ئێمە خۆشمان دەوێت‌و، حەز بە دیدەنی دەکەین بە هۆی هەواڵی دەربارەی قورەیش و ئاگاداری لە بنەماڵەکانیان.
چوومە لای‌و پێم گووت:-
ئایا ئەمە ڕاستە موحەممەدی کوڕی عبدالله بووە بە پێغەمبەرو، تۆش دوای کەوتوویت؟!
ئەویش گووتی:- بەڵێ... هەواڵی چۆنیەتی پێغەمبەرایەتی بۆ گێڕامەوەو داوای لێکردم منیش لەگەڵی ببم بە موسڵمان، منیش هەواڵی ڕاهیبەکەم پێگەیاند، پێی سەریسوڕما و گووتی:-
(با بە یەکەوە بڕۆین‌و بۆ لای موحەممەد هەواڵی تۆی پێ بگەیەنین‌و، گوێی لە تۆ بێت چی دەڵێت‌و... بۆ ئەوەی بێیتە ناو ئاینی خوا...
طەلحە دەڵێت:-
لەگەڵی چوومە لای موحەممەد ئەویش ئیسلامی پێشنیار کردم هەندێکی لە قورئان بۆ خوێندمەوەو، مزگێنی پێدام بە باشترین شت لە دونیا و قیامەت...
خودا سینگی جۆش دام بۆ ئیسلامو، منیش چیرۆکی ڕاهیبی بوصرام بۆ گێڕایەوە.
ئەویش زۆر پێی دڵ خۆش بوو، خۆشی لەبەر دەم‌وچاوی بەدیارکەوت...
پاشان لەژێر دەستی شاهێدی شەهادەی (اشهد ان لا اله الاّ الله وان محمداً رسول الله)/ بڕیار دا...
من چوارەمینی ئەم سی‌کەسە بووم موسڵمان بووم بە دەستی ئەبوبەکر...
موسڵمان بوونی ئەم گەنجە قورەیشی‌یە هەروەکو خێرایی بروسك گەیشت بە نزیك‌و کەسوکارەکانی...
دایکی لە هەموو کەس زیاتر دڵی تەنگ بوو بە موسڵمان بوونی، چونکە دایکی هیوای وابوو ئەم گەوراتی میللەتەکەی بکات بە هۆی ئەم سفەتە بەرزانەی لێی بەدیار کەوت بوو.

*　　*　　*

میللەتەکەی هەوڵو کۆششیان کرد بۆ ئەوەی لە ئایینەکەی هەڵیگێڕنەوە بەڵام طەلحەیان بینی وەکو شاخێکی سەرکەش لە شوێنی خۆی جوڵە ناکات.

بەڵام کاتێك نائومێد بوون لەوەی بە خۆشی واز ناهێنێت پەنایان برد بۆ ئازارو ئەشکەنجەو ریسواکردنی هەروەك-مەسعود کوڕی خەراش- دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

کاتێك صەفاو مەروەمان دەکرد، بینیمان خەڵکێکی زۆر بە دوای گەنجێك کەوتوون دەستەکانی بە ملی بەسترابنەوەو،بە دوای‌دا غر دەدەن‌و، پاڵ بە پشتی وەدەنێن‌و، لە سەری دەدەن...

ئافرەتێکی پیریش لە دوایان جوێن دەداو هاواری لەسەر دەکات...

گووتم :- مەسەلەی ئەم گەنجە چی‌یە؟!

گووتیان:- ئەمە (طەلحە کوڕی عبیداللە)یە، لە ئایینەکەی هەڵگەڕایتەوەو، بە دوای مێرد منداڵێکی (بەنی هاشم) کەوتووە...

گووتم:- ئەی ئەم پیرە چی‌یە بەدوایەوە؟

گووتیان:- ئەمە صەعبەی کچی حەضرەمی)یە دایکی ئەم گەنجەیە...

پاشان نەوفل کوڕی خوەیلد ناسراو بە شێری قورەیش، هەڵسا طەلحە کوڕی عبیداللەی بەستاوە بە پەتێك، ئەبوبەکری صەدیقیشی لەگەڵی بەستایەوەو، بە بەستراوەیی بە یەکەوە دایە دەست بەرەڵایەکانی مەککە، بۆ ئەوەی ئەشکەنجەترین ئازاری بدەن...

لەبەر ئەمە طەلحەی کوڕی عبیداللە و ئەبوبەکری صەدیق ناسراون بە هاوشانی یەکتر...

پاشان رۆژگار رۆیشت‌و، رووداو هات‌و، طەلحەی کوڕی عبیداللە لەگەڵ رۆژگار قایم تر دەبوو و، بەڵای گەورەترو مەزنتری لە رێگای خودا بەسەردا دەکەوت‌و، ئەویش زیاتر خزمەتی ئیسلام و موسڵمانانی دەکرد، تاکو موسڵمانان نازناوی شەهیدی زیندوومان لێ‌ناو پێغەمبەر ﷺ بانگی دەکرد بە طەلحەی خەیرو، طەلحەی سەخی‌و طەلحەی بەخشەر...

ئەم نازناوانەش هیچ نازناوێکیان لە ئەوی‌تریان پلەوپایەی کەمتر نەبوو.

* * *

بەڵام داستانی ناسرانی بە شەهیدی زیندوو ئەمەیە رۆژی ئوحد کاتێك موسڵمانان شکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنها یازدەکەس لە پیاوانی ئەنصارو طەلحەی کوڕی عبیداللە لە موهاجیران لەگەڵی مانەوە...و ئەوانی لەگەڵی بوون هەر دەکشان

(سەردەکەوتن) بۆ سەرچیا، کۆمەڵێك لە هاوبەش پەیداکەرانی گەیشتن بە مەبەستی کوشتنی...

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- کێ ئەمانەمان لەسەر لادەبات بۆ ئەوەی ببێت بە هاوڕێم لە بەهەشت؟

طـەلحە گووتی:- من ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- نەخێر، لە شوێنی خۆت بە.

پیاوێك لە ئەنصارەکان گووتی:- من ئەی پێغەمبەری خوا...

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- بەڵێ، تۆ...

ئەنصاریەکە جەنگیکرد تاکو شەهیدبوو، پاشان پێغەمبەر و ئەوانی لەگەڵی بوون زیاتر هەڵکشان( سەرکەوتن) بۆ سەر چیایەکەو دوژمنە هاوبەش پەیداکەرەکانی گەیشتنێ و، فەرمووی:- هیچ پیاوێك نیە بۆ ئەوانە؟!

طـەلحە گووتی:- من ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- نەخێر، لە شوێنی خۆت بە.

پیاوێك لە ئەنصارەکان گووتی:- من ئەی پێغەمبەری خوا...

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- بەڵێ، تۆ، پاشان ئەنصاریەکە شەڕی کرد تاکو ئەمیش شەهید بوو.

پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوون لە سەرکەوتنی بۆ سەر چیایەکە، هاوبەش پەیداکەرەکان گەیشتن پێیان، بەم جۆرە ئەم قسانەی دەگووتەوەو، طـەلحەش دەیگووت:- من ئەی پێغەمبەری خوا ، پێغەمبەریش ڕێگای پێنەدەداو، ڕێگای پیاوە ئەنصاریەکانی ئەدا تاکو هەموویان شەهید بوون، کەسی لەگەڵ نەمایەوە تەنها طـەلحە نەبێت هاوبەش پەیداکەرەکان گەیشتنە سەریان، بە طـەلحەی فەرموو:- ئێستا، بەڵێ...

پێغەمبەر ﷺ ددانی پیرۆزی پێشەوەی شکاو نێوچەوانی پیرۆزی بریندار بوو، لێوەکانی تەقینو، خوێن بە دەموچاویدا دەهاتە خوارەوەو، تووشی ماندووبوونێکی لە تاقەت بڕ ببوو، طـەلحە-خوا لێی ڕازی بێت- دەهاتو دەچوو بەسەر هاوبەش پەیداکەران تاکو لەسەر پێغەمبەری خوایان لابدات پاشان دەگەڕایەوە پێغەمبەر کەمێك هەڵیگرت لە چیایەکەو، پاشان لەسەر زەوی دایناو، سەر لە نوێ ڕووی کردەوە هاوبەش پەیداکەران .

ئەو کارەی دووبارە کردەوە تاکو هاوبەش پەیداکەران وازیان لێهێنان...

ئەبوبەکر دەڵێت:- منو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕراح ئەو کاتە دوور بووین لە پێغەمبەری خوا کاتێك گەیشتینە سەری بە مەبەستی فریاکەوتن، فەرمووی:-

من جێبهێڵنو بگەن بە هاوڕێکەتان-مەبەستی طـەلحە- بوو...

طـەلحە ئەم کاتە خوێن لە لەشی دەهات، حەفتاو هەندێك برینی لـە لـەش دا بوو لە لێدانی شمشێر یان لێدانی ڕم یان لێدانی تیر...

هـەروەها دەسـتێکی-ناولـەپی- بڕابـۆوەو، کـەوتبووە نـاو چـاڵێك‌و لـە هـۆش خـۆ چووبوو...

پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئەم کارەساتە دەیفەرموو:-

( مَنْ سرّهُ انْ يَنْظُرَ الى رَجُلٍ يَمشي على الأرض، قَدْ قَضَى نَحْبَهُ فَلْيَنْظُر الى طَلْحَه بِن عُبَيْدُالله).

واتە:- هەر کەسێك حەز دەکات تەماشای پیاوێك بکات دەڕوا لەسەر زەوی، بەڕاستی خوا خۆشی دەوێت و بۆ خۆی دەباتەوە با تەماشای طـەلحەی کوڕی عبیدالله بکات.

ئەگەر ئەبوبەکری صدیق-خوا لـێی ڕازی بێـت- باسـی جـەنگی ئوحدیـان کردبـا دەیگووت:- ئەم ڕۆژە هەر هەموو بۆ طـەلحە بوو.

* * *

بـەڵام نازنـاوی طـەلحـەی خـەیرو طـەلحـەی سـەخی‌و سـەدەها چیـڕۆك هەیـە نموونەمان بۆ ئەمە طـەلحە بازرگانێکی مەزن‌و خاوەن سامانێکی زۆر بوو، ڕۆژێکیان هـەندێك سامانی لـە (حضـرموت) بۆ دێت نرخەکەی حـەفت سـەد هـەزار درهـەم دەبێـت شەوی بەسەر هات خەم‌و پەژارە دایگرت...

خێزانەکەی ام کلثوم کچی‌ئەبوبەکری صدیق لـێی دەچێتە ژوورەوەو پێی دەڵێت:-

چیتـە ئەی باوکی موحەممەد؟!!

لەوانەیە لە لایەن ئێمە قسەیەکی خراپـت بیستبێت!!

گووتی:- نەخێر، تۆ باشترین خێزانی پیاوی موسڵمانیت... بەڵام ئەم شەوە بیـرم کردەوەو گووتم:-

پیاو چ گومانێك دەبا بە پـەروەردگاری ئەگـەر بێ‌و بخـەوێت‌و ئـەم سامانەش لـەماڵی بێت...؟!!

خێزانەکەی گووتی:- بۆچی خەمی لێ‌دەخۆیت؟!

ئەی کوانێ ئەو پێویست‌و هەژارانەی لە میللەتەکەت‌و نزیکەکانت؟!

کاتێك بەیانیت کردەوەدابەشی بکە بەسەریاندا، ئەویش گووتی:-

خوا ڕەحمەت پێ‌بکات، تۆ ڕێگای ڕاستت گرتووەو کچی پیاوێکی ڕاستە ڕێگایت..

کـاتێك بـەیانی هـات سامانەکەی لـەناو پـەڕۆو جـامێکی گـەورە کردو، دابەشـی کـرد بەسەر هەژارەکانی موهاجیرو ئەنصار...

هەروەها نموونەیەکی تریش لەسەر سەخاوەتی ئەم یاوەرە خۆشەویستە پیاوێك هاتە لای طەلحەی کوڕی عبیداللە داوای بەخشینی لێکرد باسی ئەم خزمایەتیەی کرد کەوا پێکەوەیان دەبەستێتەوە، طەلحەش پێی گووت:- ئەم خزمایەتیە یەکێك لەمەوپێش باسی بۆ کردووم.

زەویەکم هەیە عوسمانی کوڕی عەففان بە سێسەد هەزار داویەتی بەمن...

ئەگەر حەز دەکەیت بۆ خۆت بێت وە ئەگەر حەز دەکەیت بۆت دەفرۆشم بە سێسەد هەزارو نرخەکەت پێدەبەخشم...

پیاوەکە گووتی:- بەڵکو نرخەکەم دەوێت، ئەویش نرخەکەی پێبەخشی...

ئینجا ئەم نازناوانەی بەخشرا بە طەلحە لێی پیرۆز بێتو ببێت بە چرا گۆڕەکەی بۆ ڕووناك کاتەوە تاکو ڕۆژی دوایی -انشاء الله- ئێمەش بە دیداری دەگەین...

لێرەدا دێینە سەر باسی ئەم فیتنەیەی دوای شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان-خوا لێی ڕازی بێت- کۆتایی بە ژیانی دەهێنێت.

لێرەدا پاش ئەمەی جولەکەو تازە موسڵمان و دووڕووە قین لە دڵەکان کەوا دوژمنی شاراوەی یاوەرو بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون هەڵسان بە گێرانی ئاژاوەو فیتنە بۆ لاوازکردنی خەلافەتی ئیسلامی، ئەوەبوو طەلحەش وەکو پیرورای سەرتاپای یاوەرە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ لایەنگیری ئەم موسڵمانانەی کرد کەوا بەڵگەدار بوون بەرامبەر ئیمامی عوسمانو داوای چاککردنیان دەکرد...

ئینجا لێرەدا پرسیارێك هەیە ئایا طەلحە دەبێت ڕازی بێت بە کوشتنی ئیمامی عوسمان؟

وەڵامەکەی نەخێر...

ئەگەر هاتوو بیزانیبایە ئەم ئاژاوەچیە قین لە دڵانە کۆتایی دێنن بە شەهیدکردنی ئیمامی عوسمان بەم جۆرە دەست درێژیە بێویژدانانە بە هیچ جۆرێك لایەنگیری ئەم کارەی نەدەکرد، بەڵام ئەم لە سەرەتادا بە نیازی ئاگادار کردنەوە، لایەگیری کردن.

پاش شەهیدکردنی ئیمامی عوسمان-خوا لێی ڕازی بێت- ئەوەندی پێنەچوو موسڵمانان لە شاری مەدینە بەیعەتیان دا بە ئیمامی عەلی یەکێك لەوانەی ڕازی بوو بە ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- طەلحە و زوبەیر بوون، تاکو هەردووکیان ڕێگایان پێدرا بەنیازی ڕۆیشتنیان بۆ مەککە بۆ عومرە...

پاشان لە مەککە ڕووی کردە بەسرا، لە کاتێك هێزێکی زۆر کۆکرابۆوە بۆ سەندنەوەی تۆڵەی ئیمامی عوسمان...

هەروەها ڕوداوی (الجَمَل) هەردوو چین، چینی داواکار بە خوێنی عوسمانو چینەکەیتر لایەنگیری ئیمامی عەلی بوون...

ئیمامی عەلی -خوا لێی ڕازی بێت- هەر کاتێك بیری لەم کارەساتەدەکردەوە کەوا ئیسلام و موسڵمانان بە هۆی ئەم دووبەرەکی یە ترسناکە تووشی بوونە، خەمی زیاتر دەبوو و، فرمێسکی بۆ هەڵەڕشت، بەم جۆرە تووشی گێژاوێکی خەمگین ببوو...

بەناوی ئەوەی خەلیفەی موسڵمانان بوو نەیدەتوانی و، مافی ئەم نەبوو چاوپۆشی لە هەر هەڵگەڕانەوەیەك بکرێت لەسەر دەوڵەت، یاخود هەر دەست درێژیەکی چەکدار بکرێت لەسەر میری...

هەروەها کاتێك هەڵدەستا بە کوژاندنەوەی ئەم جۆرە هەڵگەڕانەوە، لەسەر پێویست بوو بەرەنگاری براو هاوڕێکانی و شوێنکەوتووانی ئایین و پێغەمبەرەکەی ببێتەوە، ئەوانەی بە درێژایی ژیانیان لەگەڵی شەڕیان کرد لەگەڵ سوپای هاوبەش پەیداکەران، بە یەکەوە لەژێر ئاڵای یەکتاپەرستی جەنگی خزم و نزیکەکانی خۆیان کردووە ببوون بە برای یەك بەڵکو برای پشتی.

ئینجا دەبێت ئەمە چ گێژاوێك بێت؟ چ بەڵایەکی گەورە بێت؟

ئینجا بۆ ڕزگاربوون لەم گێژاوەو، پاراستنی خوێنی موسڵمانان ئیمامی عەلی هیچ ڕێگایەك نەما پەنای بۆ نەباو هیچ تکایەك نەما پەیوەندی پێ نەکات....

بەڵام ئەم تازە موسڵمانەی کەوا هاتبوونە ناو ئیسلام بە هۆی فەتح کردنەوە لە سەردەمی ئیمامی عومەر بوون بە ئاگری ئەم ئاژاوەیە و هەتا دەهات ئاگرەکەیان گەرم دەکردو ئاژاوەکەیان گەورە دەکرد...

ئیمامی عەلی زۆر گریا کاتێك بینی دایکی بڕوادارن -عائیشە- لەناو کەژاوەکەی لە سەرەتای سوپاکەیەو هاتووە بۆ جەنگ کردن...

کاتێك لە ناوەندی سوپاکە طەلحە و زوبەیری بینی -هەردوو حەواری پێغەمبەری خوا...

بانگی کرد طەلحە و زوبەیر بۆی دەربچن، دەرچوون تاکو لموزی وڵاخەکەیان بە یەکتر کەت بە طەلحەی گووت:-

(ئەی طەلحە، ئایا بە خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوو جەنگ بکەیت و، خێزانەکەی خۆشت لەماڵەوە شاردۆتەوە...؟)..

پاشان گووتیە زوبەیر:- ئەی زوبەیر:-

(سوێندت بە خوا دەدەم، ئەم ڕۆژەت بەیاددا دێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلات دا تێپەڕی و منیش لە فلانە جێگا بووم، پێغەمبەر پێی فەرمووی:- ئەی زوبەیر، ئایا (عەلی)ت خۆش ناوێت؟

گووتت:- من کوڕەخاڵ و ئامۆزای خۆم خۆش نەوێت، لەگەڵ ئەوەش یەك ئاینین...؟؟

بە تۆی فەرموو:-

ئەی زوبەیر، بەڵام سوێند بە خوا تۆ جەنگی لەگەڵ دەکەیت و تۆش ستەمکاریت)...!!

زوبەیر-خوا لێی ڕازی بێت- فەرمووی:- بەڵێ ئێستا بە یادم دا دێتەوە، من لە یادم کردبوو، سوێند بە خوا شەڕت لەگەڵ ناکەم...

زوبەیر و طـەلحە لەم جەنگە خۆبەخۆییە گەڕانەوەو بەشداری جەنگیان نەکرد...

لەم جەنگە بە تەواوی دڵیان هەڵقەناو بڕوایی‌یان پێ‌ی نەما، کاتێك بینیان بە چاوی خۆیان (عەمماری کوڕی یاسر) جەنگ دەکات لە ڕیزی ئیمامی عەلی، فەرموودەی پێغەمبەری خوایان ﷺ بە یاددا هاتەوە بۆ عەممار:-

(تقتُلكَ الفئة الباغية)...

واتە:-چینێکی یاخی‌بوو دەتکوژن... ئینجا ئەگەر عەممار لەم جەنگە بەشداربوو و کوژرا کەواتە طـەلحە بەشداری جەنگێکی ناهەق‌و یاخی‌بووی کردووە...

طـەلحە و زوبەیر لەم جەنگە کێشایانەوە، بەڵام سەد ئاخ‌و مەخابن ژیانیان کرد بەنرخی کێشانەوەکەو، ئاخیری ژیانیان خێر بوو و پلەی شەهادەتیان وەدەست هێنا.

هەرچی زوبەیر بوو پیاوێك بە ناوی (عەمری کوڕی جرموز) بە نهێنی لە نوێژدا تیرۆری کرد...!!!

بەڵام هەرچی طـەلحە بوو (مەڕوانی کوڕی حەکەم) تیرێکی بۆ هاوێشت‌و کۆتایی بە ژیانی پڕ خێر بەرەکەت‌و جیهاد لە پێناوی خوای هێنا...

ئەوەبوو پێش دەستپێکردنی جەنگەکە لەبەر سۆزو خۆشەویستیان بۆ ئیمامی عوسمان-خوا لێی ڕازی بێت- بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە طـەلحە دەیگووت:-

(اللهم خُذ مني لعثمان اليوم حتى ترضى)...

واتە:- پەروەردگارا لەم خێزانەی هەمە، ئەمڕۆکە لێم وەربگرە تاکو ڕازی دەبی.

طـەلحە و زوبەیر ئەو کاتەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئیمامی عەلی ڕاستیان بینیەوە خاکی جەنگیان جێهێشت‌و شەهادەت بوو بە زەخیرەیان...

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو:-

(( هذا ممّن قَضَى نَحْبَهُ، وَمَنْ سَرَّهُ ان يرى شَهيداً يمشي على الأرض فلْيَنْظُر الى طـلحة))...؟؟

واتە:- ئەوە یەکێکە لەمانەی خوا خۆشی دەوێت و بۆ خۆی دەباتەوەو، هەر کەسێك حەز دەکات تەماشای شەهیدێك بکات لەسەر زەوی دەڕوات، با تەماشای طـەلحە بکات...

بەم جۆرە شەهید کۆتایی بە ژیانی هات‌و، ڕووداوی جەمەل کۆتایی پێ‌هات‌و... دایکی بڕواداران-عائیشە-خوا لێی ڕازی بێت- بۆی ڕوون بۆوە پەلەی لە کارەکەی کردووەو ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- بە هەموو شێوەیەکی جوان‌و ڕێز لێنراو عائیشەی دایکی بەڕێ کردەوە بۆ شاری مەدینە..

کاتێك ئیمامی عەلی تەماشای شەهیدەکانی جەنگیکرد لە لایەنگیرانی خۆیو دژەکانی، ئەوەبوو نوێژی لەسەر کردن...

کاتێك تەواو بوو لە بەخاك سپاردنی طەلحە و زوبەیر ماڵئاوایی لێکردن بەم ووشە بەپێزانە کۆتایی بەم ووشانە هات:- من تکاکارم لە خودا منو طەلحە و زوبەیرو عوسمان لەوانە بین خوار دەرهەقی فەرموونە:-

﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ ﴾ (الحديد ٤٧)

پاشان بە دڵێکی پاكو خەمگینەوە ئیمام گووتی:-

(بەم گوێیانەی خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرموویەتی:-

((طلحه و زبير، جاريَ في الجنة))..

واتە :- طەلحە و زوبەیر هاوسێمن لە بەهەشت..

خوای گەورە لە حەواریو یاوەری پێغەمبەری خوا طەلحەی کوڕی عبیدالله تەمیمی ڕازی بێتو با ئێمەش ئەم تەرزە پیاوانە بکەین بە سەرمەشقو بۆ پەند وەرگرتن و ئامۆژگاریە بە سوودەکانیان ... آمین.



# زوبەیری کوڕی عەوام

(هەموو پێغەمبەرێك حەواری هەبووەو حەواری من زوبەیرە) پێغەمبەری خوا ﷺ

## (٨٥)

# زوبەیری کوڕی عەوام

### هەر پێغەمبەرێك حەواری هەبووەو حـەواری مـن زوبەیرە

پێغەمبەری خوا ﷺ

(صـفیه)ی دایکی زوبەیر دەستی دەدا شوڕکێکی دارخورما پەلاماری دەهێنا سەر زوبەیر، هاواری لەسەر دەکرد کەوا ورە ڕوخاو نەبێت بەرامبەر کارەسات، زوبەیریش بە دەستەکانی پارێزگاری لە خۆی دەکرد بەبێ ئەوەی بگرێیتو ئاخ‌وئۆف بکات چونکە دەیزانی ئەگەر ئەم کارە بکات ئەوا دایکی زیاتر دەیداتە بەر شوڕکانو زیاتر لـێ‌ی توڕە دەبێت...

ئینجا هەرە لەم ساتەوە زوبەیر بڕیاری‌دا سەرشۆڕ نەکات بۆ هیچ مرۆڤێك هەرچەندە بە هێزو تواناش بێت.

(صـفیه) بەرەبەر دادەمرکایەوە زازی لە لێدانی زوبەیر دەهێنا، بەم جۆرە پەروەردەی زوبەیری دەکرد لەسەر ناخۆشی‌و کارەسات، تاکو وابکات خەڵك ناچار ببێت دان بهێنن بە ئازایەتی‌و بەهێزی کوڕەکەی‌و حیسابی بۆ بکەن...

ڕۆژێکیـان زوبـەیر هـات بۆ لای دایکی ئـەویش لـە باوەشـی کـرد‌و تێرتێر مـاچی‌کرد، لەبەرئەوەی شەڕی لەگەڵ هاوشانێکی خۆی کردبوو قاچی شکاندبوو و بە زەوی‌دا دابوو.

زوبەیر لەگەڵ بچووکی تەمەنی توانی ڕێزی خۆی بسـەلمێنێن بەسـەر هـەموو خـەڵکی (مەککە)و قوڕەیشیەکان ناچار بکات ڕێزی لـێ‌بنێن بە هۆی ئازایەتیەکەیـەوە و هـەزارەها حیسابی بۆ بکەن... زوبەیر لەگەڵ ئەم ئازایەتیەی هەیبوو جێگاو شوێنێکی بریقەداری هەبوو کەوا لە بنەماڵەیەك پیـرۆز و ڕێز لـێ‌گیراو بوو لە لایەنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتیەوە، باوکی (عەوام کوڕی خوەیلید)برای(خەدیجەی کچی خوەیلید) بوو خێزانی پێغەمبەر ﷺ کەوا گەورەی ئافرەتانی قوڕەیش بوو لە بنەماڵەو ڕەوشتو سامان‌و جوانیدا...

دایکی (صـفیەی کچی عبدالمطلب) لـە ڕەچەڵەیـەکی نـەوەی هاشـم بـوو، خوشـکی گـەورەی شـەهیدان (حـەمزە) ی مـامی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئـەو ئافرەتـەی لـە ڕۆژی خەندەق پەلاماری بردە سەر ئەم جولەکـە ناپاکـەی نیـازی خراپـەی هـەبوو بـەلایان دا تێپەڕی، لە کاتێکدا یاوەرەکان هەر هەموویان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ خەریك بوون بە کاری جەنگ ئەوەبوو لە ئەنجامدا توانی جولەکە نەفرین لێکراوەکە بە دۆزەخ شاد بکات.

بـاوکی زوبـەیر دارتـاش بـوو، بـەڵام ئـەم پیشـەیە زوبـەیر خـوی پێـوە نـەگرت، بـەڵکو حەزی بە گۆشت فرۆشی دەکرد دوکانێکی کردەوەو تێیدا کاری دەکرد، کەل‌وپەلـەکانی بریتی بوو لە چەقۆ و بازرگانی‌کردن بە گۆشتو خوێن...

ڕۆژێکیان هاوڕێکەی ئەبوبەکر-خوا لێی ڕازی بێت- دێت بۆ لای و باسی کارێکی زۆر گەورەی لەلا دەکات و زوبەیریش بە هەموو هەست و نەستێکەوە گوێی بۆ شل دەکات، بەم جۆرە زوبەیر هەست دەکات بە کاردانەوەی قسەکانی کەوا شتێك لە ویژدانی دەخولێتەوەو، موژرك بە لەشیدا دەهێنێت و، بەم هۆیەوە خوێن لە شادەمارەکانی دەجولێنێت و لە تاوان گەرم دادێت خەریکە دەمارەکان بتەقێنێت...

پاشان لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکر ڕێك دەکەوێت کەوا لە کاتی نیوەشەودا بە یەك بگەن و بە یەکەوە بچن بۆ لای (محمد کوڕی عبدالله) واتە کوڕی خاڵ و مێردی پلکی بۆ ئەوەی لەژێر دەستی موسڵمان بێت...

زوبەیر کاتەکانی ڕۆژی بە کڕین و فرۆشتن بەسەر دەبرد و لەگەڵ ئەمەشدا لە جیهانێکی تر مەلەی دەکرد دوور لە بوونی خەڵك، هەر کە ڕۆژ تەواو بوو شەو داهات زوبەیر هەستی دەکرد کەوا وەکو بڵێیت کابوسێك لە خەم و خەفەت بەرۆکی بەرداو ڕەویەو، بە پەلە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەندامەکانی لەشی تێکچوو بوو و، جل و بەرگی ئیش کردنی گۆڕی، بەڵام... هەتا ئێستا دڵەکوتێ و لێدانی لەش بەرۆکی بەرنەداوە لەگەڵ ئەوەی زیاتریش لە خەڵك موحەممەد دەناسی و بەهۆی خزمایەتیەوە پەیوەندی پێی هەیەو لێی نزیکە...

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گومانی تیا نیە خۆی ئامادە دەکات بۆ کارێکی زۆر مەزن... زوبەیر لەم کاتەدا تەمەنی لە شازدە ساڵان تێپەڕی نەدەکرد پیاوێکی ڕەشتاڵە و بەژن و باڵا مام ناوەندی نیشانەی ئازایەتی و قارەمانیەتی لە ڕوخساری بەدی دەکرا...

زوبەیر لەماڵ چووە دەرەوە بەبێ ئەوەی خەڵك لە نیازی بگەن و چووە لای ئیمامی ئەبوبەکر، پاشان بە یەك ڕۆیشتن بۆ لای محەممەد ﷺ کەوا زۆر بە گەرم و گوڕی بەخێرهاتنیان کرا.

زوبەیر موسڵمان بوو و بڕوای هێنا بە یەکتاپەرستی و بە پەیامی موحەممەد، زوبەیریش لەوانە نەبوو موسڵمان بوونەکەی بشارێتەوە بەبێ ئەوەی ترس و بیم بیگرێتەوە.

مامی نەوفل بە موسڵمان بوونی زوبەیری زانی بانگی ماڵەوەی کرد لە سەرەتادا قسەی نەرمی لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە لە ئایینەکەی و، هەرچی زوبەیر بوو سوور بوو لەسەر ڕێگاکەی و بڕیاریدا کۆڵ نەدات...

ئەوەبوو مامی، زوبەیر بەستایەوە لەناو حەسیرێك لولیداو پاشان بە دوکەڵ فانگیدا بۆ ئەوەی هەناسەی تەنگ بێت و زیاتر ئازاری بدات، هەروەها خواردن و خواردنەوەشی لێقەدەغەکرد، بەم جۆرە زیادەڕەوی کرد لە ئازاردان و ئەشکەنجە، بەڵام ئەم جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیە کاری لە زوبەیر نەدەکرد...

لەبەرئەوەی زوبەیر ئەوەندە بێهێز نەبوو بگات بە پلەی خۆبەدەست دانەوە تەنها ئەوە نەبێت ڕێزی لە مامی دەناو دەستی بۆ درێژ نەدەکرد بۆ هیچ تۆڵەیەك و ئیتر ئارامی گرت لەسەر ئەم ئازارانەی پێی دەکەوت لەژێر دەستی...

ئەر کە مامی زانی ئازارو ئەشکەنجە دادی زوبەیر نادات لێی نائومێد بوو لە گەڕانەوی بۆ کۆمەڵی هاوبەش پەیداکەران لە بەندکردن ، ئەوەبوو ئازادی کردو ئیتر خۆی لێ بێئاگا کرد، پاش ئەوەی زوبەیر پێی دەگووت:-

( لا... والله لاأعود للكفر أبداً)...

واتە:- (نەخێر، سوێند بە خوا، بە هیچ جۆرێك ناگەڕێمەوە بۆ کوفر)..

بەم جۆرە زوبەیر لەسەر ڕێگای ئیسلام بەردەوام بوو.. لەگەڵ موسڵمانان کۆچی کرد بۆ حەبەشە...

لە حەبەشە ڕووداوێك ڕوویدا زوبەیر پاڵەوانی ئەم داستانە بوو، کەوا چینێك لە ناحەزەکانی نەجاشی دەیانویست دەست بگرن بەسەر دەسەڵات و نەجاشی ناچار بکەن بۆیان مل کەچ ببێت، ئیتر هەردوو چینە ناکۆکەکە دوژمنایەتیان گەیشتە سنووری شەڕکردن، هەرچی موسڵمانە کۆچکردووەکان بوو حەزیان لە مانەوەی نەجاشی دەکرد لەبەرئەوەی ڕێزی لێنابوون و چاودێری میوانداری دەکردن و دەیپاراستن..

بەڵام حەز کردنەکەیان نەگەیشتبووە ئەم سنوورەی بێنە ناو شەڕ دژی دوژمنەکانی نەجاشی، مانەوە و تەماشای ئەنجامی شەڕەکەیان دەکرد...

لە شەوێکی تاریك دا کەوا جەنگ گەرم ببوو لە نێوان هەردوو چینە شەڕکەرەکە موسڵمانان هەستیان بە ناخۆشی دەکرد لە خوا دەپاڕانەوە خوای گەورە سەرکەوتن بنێرێت بۆ هاوڕێکەیان، لەم کاتانەدا یەکێکیان گووتی:- کێ هەیە لە ئێمە هەواڵی جەنگمان بۆ بهێنێت؟

ئەوەبوو سوارچاکی لەخۆبردوو و قارەمان زوبەیر خۆی تەرخان کرد بۆ ئەم کارە، ئەوەبوو دوو مەسکەیان بۆ پڕ لە هەوا کرد و خستیە بن هەنگڵی و خۆی هاوێشتە ناو ئاوی (نیل)ەوە تاکو گەیشتە گۆڕەپانی جەنگەکە، بەم جۆرە تەماشای شەڕو پێکدادانەکەی دەکرد لە کاتێکدا خۆی حەشار دابوو لە نێو کەلاوەیەك، خۆی شاردبۆوە لە تاریکی شەوە زەنگ دا، کاتێك جەنگەکە کۆتایی هات، زوبەیر بە ئەسپایی بە پەلەوە گەڕایەوە، کەوا مزگێنی سەرکەوتنی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو هەواڵی ئەم سەرکەوتنە مەزنەی بە موسڵمانە چەوساوەکان دا..

پاش ئەوەی موسڵمانەکان لە حەبەشە گوێ بیست بوون بە موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خەطاب و حەمزەی کوڕی عبدالمطلب -خوا لێی ڕازی بێت- گەڕانەوە مەککە، بەڵام کاتێك گەڕانەوە بینیان قوڕەیش هەروەك جارانی پێشوو لەسەر لاملی هەڵوێستە توندەکانیان و لەگەڵ ستەم کردنیان لە موسڵمانان...

زوبەیر گەڕایەوە سەر کارەکەی و دوکانەکەی...

ڕۆژێکیان زوبەیر گوێی لە هەواڵێك دەبێت ویژدانی دەهەژێنێتەوەو زۆر ڕقی هەڵدەستێت هەواڵدەرکان هەواڵی کوژرانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنن، زوبەیر کارەکەی بەجێ‌دەهێڵێت و شمشێرەکەی هەڵدەگرێت، دەڕوا بەرەو سەرووی مەککەو هاواری لێ‌هەڵدەستێ قەڵەبالغی‌خەڵك دەبڕێت و تاکو دەگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ساغ و سەلامەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شێوەیەی زوبەیری لا سەیر بوو و پرسیاری لێ‌کرد:-

-ئەی زوبەیر چیتە؟

ئەویش گووتی:- وا هەواڵم پێ‌گەیشت کە تۆ لێدراوی...

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کردو لەگەڵ دوعاکردن بۆ شمشێرەکەی... ڕۆژ بە ڕۆژ زوبەیر بەهێز دەبوو زیاتر شێت و شەیدای ئیسلام دەبوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە موسڵمانان دا بە کۆچ کردن بۆ مەدینە زوبەیری کوڕی عەوام لەگەڵ کۆچکردووەکان بۆی دەرچوو لە شوێنێك خستیان بەناوی (العصبة) لە (قباء) لە نزیك مەدینە...

بەم جۆرە زوبەیر بە گواستنەوەی لە مەککە بۆ مەدینە قۆناغێکی نوێ لە ژیانی دەستی پێکرد کەوا خۆی ئامادەکرد بۆ جیهادی ڕێگای خوا، بوو بە سوارچاکێك لە سوارچاکانی موسڵمانان کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوپەڕی بڕوایی متمانەی پێ‌دەکرد، ئەمەش سەیر نیە بە هۆی ئەم کارە چاکانە پێغەمبەری خوا ﷺ پاداشتی بداتەوە بە بەخشینی چەند ڕووبەرێك لە زەوی‌زار و ڕازی بێت لە هەڵسوکەوتەکانی...

ئەگەر گۆڕەپانی بەدر ژمارەیەك لە گەورە یاوەرانی ئازاو سوارچاکانی تێدا بەدی بکرێت، ئەوا زوبەیری کوڕی عەوام بە هۆی بڕوا بە هۆی بڕواییە بەهێزەکەیەوە تێیدا دەبینرا بەم دوو سیفەتەوە:-

یەکەمیان:- زوبەیر-خوا لێی ڕازی بێت- (عەمامە)یەکی زەردی لەسەری خۆی ئاڵاندبوو لەلای ڕاستی سوپای موسڵمانان بوو، لەم ڕۆژەدا فریشتەکان لە شێوەی ئەم (عەمامە) زەردە دەهاتنە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

(لَقَدْ نَزَلَتِ المَلائِكَةُ عَلى سِيما الزبير).

واتە:- بەڕاستی فریشتەکان لەسەر شێوەی زوبەیر دێنە خوارەوە.

دووەمیان:- زوبەیر توانی لەم ڕۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لە بێ‌باوەڕەکان بکوژێت و شمشێرەکان بە غەنیمەت بگرێت و، دوو برینی گەورەی لە لەشی بکەوێت، یەکێك لەمانی بە دەستی ئەوا کوژرا بریتی بوون لە :- مامی (ئەوفەل کوڕی خوەیلید) و (عوبەیدەی کوڕی سەعیدی کەڕی عاصی کوڕی ئومەیە)..

لە ڕۆژی (ئوحد)دا زوبەیر یەکێك بوو لەمانەی وەکو شێر لە شوێنی چەسپاو بەرگریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شمشێر و ڕم تیری دوژمن پاراستیان و پەیمانی مردنیان لەگەڵ بەستا...

پێغەمبەر ﷺ لە کاتی جەنگ دا بینی پیاوێك لە بێباوەڕان ڕاست و چەپ کەوتۆتە ناو موسڵمانان و دەیانکوژێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:-

- ئەی زوبەیر بۆی هەڵسە.

زوبەیر بۆ ئەوەی دەستی بیگاتێ چووە سەر گردێك و خۆی بۆ ئامادەکرد و پاشان خۆی بۆ پیاوەکە هاوێشت لەسەر گردەکە خلۆر بوونەوە تاکو کەوتنە سەر زەوی، زوبەیر کەوتە سەر سینگی پیاوەکەو کوشتی...

هەموو جەنگ و دیمانەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بینی، پتر لە هەموویان جێگای زوبەیر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە هەموو جەنگ و دیمانەکان دیار بووە، لەبەرئەوەی سوارچاکێکی زۆر بە جەرگ بووە و هیوای موسڵمانان بوو.

لە (قریظة) گواستیەوە بۆ خەیبەر پاشان بۆ فەتحی مەککە یان بۆحونەین.

لە ڕۆژی حونەین زوبەیر بە ئاشکرا ڕمەکەی لەسەر ملی خۆی دانابوو و، پەڕۆکێکی سووری لە نێوچەوانی خۆی ئاڵاندبوو، گۆڕەپانی جەنگ لەژێر پێی دەلەرزی و سوارچاکان لەژێر دەستی هەڵدەهاتن، یەکێك لە بێباوەڕان گووتی:-

(ئەمە زوبەیری کوڕی عەوامە، سوێند بە لات دەمانگاتێ ئینجا بچەسپێن، زوبەیر بەردەوام لە بێباوەڕەکانی دەدا تاکو شوێنی خۆیانیان پێ بەجێدەهێشتن...

بەم جۆرە ئەمە کاری زوبەیر بوو لە جەنگەکان دەگەڕا بە دوای مردن و مردن لەبەری هەڵدەهات، هیچ شوێنێك نەمابوو لە لەشی شوێنەواری تیرو ڕم و شمشێری پێوە دیار نەبێت و ویشامی شەڕەفی جەنگی پێوە هەڵنەواسرێ لە پێناوی جەنگ لە ڕێگای خوداو بەرزکردنەوەی ووشەی بەکتاپەرستی و لەناوبردنی ووشەی بێبڕوایی...

زوبەیر ئەوەندە بەدوای شەهادەت دەگەڕا تەنانەت هیواخوا بوو بۆ کوڕەکانی بۆ ئەوەی شەهید بن لە ڕێگای خوا، هەروەك ناوی کوڕەکانی بەناوی یاوەرە شەهیدەکان لێنابوو.

عبداللەی کوڕی زوبەیر-بەناوی یاوەری شەهید عبداللەی کوڕی جەحش و، مونذر بەناوی یاوەری شەهید مونذری کوڕی عەمرو عورزوە بەناوی یاوەری شەهید عوروەی کوڕی عەمرو ، حەمزە بەناوی یاوەری شەهید حەمزەی کوڕی عبدالمطلب، جەعفەر بەناوی یاوەری شەهید جەعفەری کوڕی عبدالمطلب، موصعەب بەناوی یاوەری شەهید موصعەبی کوڕی عومەیر و، خالید بەناوی یاوەری شەهید خالیدی کوڕی سەعید.

زوبەیر بەهۆی ئەم کردەوە چاکانەی بۆ خودا پێغەمبەری خوا ﷺ مزگێنی بەهەشتی لەسەر دونیا پێداو، یەکێك بوو لەمانەی دەستەی ڕاوێژی لە هەردوو باڵی سیاسی و عەسکەری پێکدەهێنا بۆ خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکری صدیق...

ئەوەبوو گەورەترین ئاستی نیشان دا لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان تاکو هۆزەکان گەڕانەوە ژێر ئاڵای ئیسلام.

کاتێك خەلیفە صدیق سوپای بەڕێکرد بۆ فەتحی شام، زوبەیر یەکێك بوو لە سەرکردەکانی کەوا مەزنترین بەشی بەدەست هێنا لە سەرکەوتن لە جەنگی یەرمووك، کەوا لێپرسراوەتی یەکێك لە لیواکانی وەرگرت ژمارەی خۆی لە هەزارکەس دەدا ئەوەبوو لە کاتێك موسڵمانان تاسا بوون لە زۆری سوپای دوژمن، زوبەیر کوڕی شیرینەکەی عبداللهی لە پێشەوەی خۆی داناو بە وڵاخەکەی ڕیزیدوژمنانی بڕی تاکو گەیشتە کۆتایی ئەوەبوو برینداربوو بە برینێکی قوڵ...

زوبەیر لەگەڵ عومەری کوڕی خەطاب گەڕایەوە مەدینە پاش ئەوەی توانیان بچنە ناو قودس و بە ڕێکەوتن فەتحی بکەن...

پاش ئەوەی عەمری کوڕی عاص ڕووی کردە میسر بۆ فەتح کردنی زۆر لە ناوچەو شارەکانی رزگارکرد، بینی ژمارەی سەربازەکانی سێهەزارو پێنج صەد سەربازە بەشی ئەوە ناکات بۆ بەردەوام بوونی لە فەتح کردنی هەموو میسر چونکە هەر شوێنێکی فەتح کردبا دەبوایە کۆمەڵێك لە موجاهیدانی لەم شوێنە جێهێشتبا، داوای لە ئیمامی عومەر کرد فریای بکەوێت ئەویش زوبەیری کوڕی عەوامی لەسەر دوازدە هەزار موجاهید بۆ ڕەوانە کرد کەوا گەورە یاوەرانی نموونەی (مقداد کوڕی اسود)و (عبادە کوڕی صامت) و (مسلمە کوڕی مخلّد) و (خارجە کوڕی حوذافە)ی لەگەڵ بوو.

زوبەیر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تاکو گەیشت بە سوپای موسڵمانان ئابڵۆقەی قەڵای (بابلیون)یان دا بەڵام دەستە وەستان بوو لە ڕزگارکردنی لەبەرئەوەی زۆر بە بەهێزیو مەحکەمی دروست کرابوو بەهۆی بورجە بەرزەکانی، پێش ئەوانیش زۆر لە هێرش بەرەکان نەیانتوانی بوو بچنە ناو ئەو قەڵایە...

ئەوەبوو ئەم گەمارۆیە حەفت مانگی برد، زوبەیر بیری کردەوە کەوا نەگرتنی ئەم قەڵایە نائومێدیو مەلەل لە دڵی موجاهیدەکان دروست دەکات، ئەم کارە پێویستی بە هێرش بردن هەیە، لە کۆبوونەوەیەکی عەسکەری لەگەڵ سەرکردە سەربازیەکان زوبەیر گووتی:-

(من گیانی خۆم دەبەخشمە خودا، تکام وایە خوای گەورە سەرکەوتن بنێرێ بۆ موسڵمانان بۆ گرتنی ئەم قەڵایە) پاشان پیلانی خۆی پێشنیاری هەموویان کرد هەندێکیان ئەم پیلانەیان وەرنەگرت، بەڵام زوبەیر سوور بوو لەسەر بەجێگەیاندنی پیلانەکانیو لە کۆبوونەوەکە چووە دەرەوە...

پاشان بانگی موجاهیدەکانی خۆی کردو،داوای ئامادەباشی لێکردن...
پاش ئەوەی تاریکی شەو زگیداو ڕووی زەوی ڕەش کرد، خۆیو سەربازەکانی قاندرمەیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی پێی بەسەر قەڵایەکە بکەون لە لای بازاڕی (حمّام) باشان بە ئەسپاییوهێمنیو بەسەر قەڵاکە سەرکەوتن...
هەروەها ووشەی نهێنی لە نێوان ئەمو موجاهیدەکانی (تەکبیر) لێدان بوو بە دەنگێکی بەرز، هەر کە موجاهیدان گوێیان لە جاڕی (الله اکبر) بوو بە یەك دەنگ بەسەر قەڵاکە سەرکەوتن بە هۆی قاندرمەکانیان ئەوەبوو هەر یەکێك لە موجاهیدەکان دەیویست لە پێش براکەی بگاتەسەر قوڵاکە بۆ ئەوەی ناوی خۆی لە لیستی سەرکەوتووان تۆمار بکات.
ڕۆمەکان لەناکاو بینیان سەر قەڵاکە پڕ بووە لە سەربازەکانی موسڵمانان، لەدەستیان دەرچوو، نەیانتوانی شەڕ بکەنو یەکسەر پاشەکشەیان کرد، ئەم قەڵا سەختە بە یارمەتی خوا بە هۆی پیاوێکی بڕوادار بەناوی زوبەیری کوڕی عەوام ڕزگار کرا، ئەم قەڵایەش لە گرنگی فەتح کردنی هیچی وای کەمتر نەبوو لە جەنگی یەرموكو جەنگی قادسیە، کەوا ورەی ڕۆم تێیدا نەماو ڕۆم لە میسر پەرتو بڵاو بوون...
زوبەیر لە میسر گەڕایەوە بۆ مەدینەو تێیدا جێنشین بوو، کاتێك عومەری کوڕی خەطاب شەهید کرا جڵەوی خەلافەتیدا دەست شەش کەسان، تێیدا یەکێکیان هەڵبژێرن، زوبەیر یەکێك بوو لەم پاڵێوراوانە، ئەوەبوو ئیمامی عثمان هەڵبژێرراو زوبەیر موبایەعەی کرد، بەڵام لە دواییدا هەندێك هەڵسوکەوتی ئیمامی عثمان بینی پێویستی بە ئامۆژگاری هەیە.
کاتێك ئاژاوە گەیشتە پلەی کوڵان، هەندێك کەس ئابڵۆقەی ماڵی ئیمامی عیمان یان دادەیانویست بیکوژن زوبەیر کوڕەکەی خۆی عبداللەی نارد بۆ ئەوەی بەرگری لێبکاتو لە شەڕی ئاژاوە بیپارێزێت، بەڵام قەزاوقەدەری خوا دابەزیو ئیمامی عثمان شەهید کرا.
کاتێك خەڵك موبایەعەیان دا بە ئیمامی عەلی بۆ خەلافەت لە سەرەتادا زوبەیر ڕازی نەبوو لەبەرئەوەی خۆی بە شیاوتر دەزانی بەڵام لە دواییدا بە نادڵی لەگەڵ خەڵك خۆی بینیەوە و موبایەعەی ئیمامی عەلی دا...
زوبەیر وای لە ئیمامی عەلی چاوەڕوان دەکرد تۆڵەی بستێنێتەوە لە بکوژەکانی ئیمامی عثمان و ئەویش بکات بە دەسەڵاتدار لەسەر ولایەتێك لە ویلایەتەکان، بەڵام ئیمامی عەلی هیچ هەنگاوێکی لەم کارانە نەهاوێشت، ئەویش ئەمەی لە دڵی خۆی هێشتەوە بۆ ڕێکەوتنی هەلێك بۆ ئەوەی لە مەدینە بچێتە دەرەوە، یەکەم جار بەیعەکە هەڵوەشێنێتەوە پاشان خەڵك هان بداتو دژی ئیمامی عەلی.

ڕۆژێکیان زوبەیر هاتە لای ئیمامی عەلی داوای ڕوخسەتی لێبکات بۆ ڕۆیشتنی بۆ شاری مەککە بە مەبەستی بەجێهێنانی (عومرە) هەروەها طـەلحەی کوڕی عبیداللە ی لەگەڵ بوو هاوڕێ بوو لە بیروڕاکانی، ئیمامی عەلی ڕێگای پێدان و پێی گووتن:-

(واللە ما أرادا العُمْرَةَ، وَلكِنْ أرادا الغَدْرَةَ) واتە:- سوێند بە خوا مەبەستتان عومرە نیە، بەڵکو مەبەستتان هەڵوەشاندنەوەی بەیعەیە...

زوبەیر و طـەلحە لە مەککە مانەوە عائیشەی دایکی بڕواداارانیشیان لەگەڵ بوو...

بەڕاستی دەروونی زوبەیر بەندی دەسەڵات و گەورەیی بوو ئەمەش بە هیچ جۆرێك لەنگی نیە بۆ ئەم، بەڵکو لەنگی ئەو کاتەیە مەبەستی ئەم دەسەڵاتداریە ڕێگایەك بێت بۆ ڕیسواکردنی و چەوسانەوەی خەڵك، حاشا بۆ زوبەیر لەم جۆرە ستەمکارانە بێت...

هەروەها کوڕەکەی عبداللە هانی باوکی بەدا لەسەر ئەمە گڕی شۆڕشی لە دڵی دەکردەوە دژی ئیمامی عەلی، ئیتر قسەکانی عبداللە لە گوێی باوکی دەزرینگایەوەو بە تەواوی وەریدەگرت..

زوبەیر و طـەلحە لە مەککە کۆبوونەوەیان لەگەڵ عائیشە کرد هانیان دا بۆ دەرچوون بۆ بەسرا و گوێڕایەڵیان بۆ ئیمامی عەلی نەماو بەیعەیان هەڵوەشاندەوە، ئەوەندە هەوڵیان لەگەڵ عائیشە دا تاکو لەگەڵیان دەرچوو.

ئیمامی عەلی بەم کارەیانی دەزانی لەگەڵ سەربازەکانی بۆیان دەرچوو، بە هەموو ڕێگایەك هەوڵیدا بیانگێڕێتەوە بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو بە گوێیان نەکرد...

ئیمامی عەلی پەیوەندی کرد بە زوبەیر گفتوگۆیەکی درێژ لە نێوانیان کرا هەموو ڕێگایەکی لەگەڵ بەکار هێنا بۆ گەڕانەو-پاشان ڕووداوێکی بەیاد هێنایەوە- زوبەیر و عەلی- لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ.

عەلی گووتی:-

- ئەم ڕۆژە بەیاد خۆت بهێنەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شانی خۆیدا بو عەلی سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد زەردەخەنەی پێم بردەوە، پاشان ڕووی لە تۆ کرد بە تۆی فەرمووی:-

(يا زبيرُ تُقاتِل علّياً وانتَ لَهُ ظـالِم).

واتە:- ئەی زوبەیر تۆ جەنگ لەگەڵ عەلی دەکەیت و تۆ ستەمی لێدەکەیت.

زوبەیر گووتی:- بەخوا ڕاست دەکەیت.

عەلی پێی گووت:- ئەی بۆچی شەڕم لەگەڵ دەکەیت.

زوبەیر گووتی:-

- لەیادم چوو بوو، سوێند بە خوا ئەگەر بە یادم هاتبایەوە بۆت دەرنەدەچووم و جەنگم لەگەڵ نەدەکردیت...

کۆمەڵەکەیان پەرت و بڵاو بوون...

زوبەیر سوور بوو لەسەر گەڕانەوە بۆ مەدینە، عبداللەی کوڕی ڕێگای پێگرت و قەدەغەی کرد.

زوبەیر هاتەوە ناو جەنگەکە، کاتێك جەنگەکە لە سەرەتا بوو عەممار کوڕی یاسر و عبداللەی کوڕی عەبباس ئامۆژگاریان کرد، ئەمجارەش ویژدانی بڕوادار بە ئاگا هاتەوەو، لە جەنگ کشایەوە...

کاتێك زوبەیر-خوا لێی ڕازی بێت- لە ڕێگا بوو بۆ مەدینە عەمری کوڕی حورموزی تەمیمی لە دوای بوو، تاکو زوبەیر وەستاو نوێژی دەکرد ئەم خوانەناسە بێویژدانە لە دواوە لە زوبەیری داو شەهیدی کردو ولاخەکەی برد لەگەڵ ئەنگوستیلەکەی، لە شوێنێك لە دۆڵی (السّباع) بە خاکی سپارد لە دووری پێنج میل لە بەسرا لە قەزای زوبەیری ئەم کاتە تەمەنی پڕ لە خێری شەست و چوار ساڵ بوو...

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە ئیمامی عەلی گووتی:-

- بَشِّروا قاتلَ الزّبير بالنّار.

واتە:- مزگێنی بدەن بە بکوژی زوبەیر بە ئاگر...

کاتێك شمشێرەکەی زوبەیریان بۆ هێنا گووتی:-

ئەم شمشێرە زۆر جاران ناخۆشی لابردووە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ... ئێمەش لێرەدا خوا حافیزی لە حەواری پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەین و دەڵێین سەلامی خوا لە زوبەیری ستەم لێکراو بە ناهەق شەهیدکراو، ڕیسوایی و ڕووڕەشی بۆ ئەوانەی ئاگری ئاژاوە لە نێو موسڵمانان هەڵدەکەن و دڵی شەیتانی نەفرین لێکراو و دڵی دوژمنانمان پێخۆش دەکەن...



# ئەبوهورەیرەی دەوسی

ئەو یاوەرەی زیاتر لە هەزار و شەش سەد فەرموودەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بوو

## (٨٦)

# ئەبوهورەیرەی دەوسی

## ئەو یاوەرەی زیاتر لە هەزار و شەش سەد فەرموودەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بوو

گومانی تیا نیە هەر هەموومان ئەم ئەستێرە پرشنگدارەی یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەناسین .. ئایا دەبێت لە ئوممەتی ئیسلام یەکێك هەبێت ناوی ئەبو هورەیرەی نەبیستبێت؟!

لە سەردەمی تاریکی‌دا خەڵك بانگیان دەکرد بە (عەبدوشەمس)..کاتێك خوای گەورە رێزی لێنا بە ئیسلام و گەورە بوو بە دیتنی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:- ناوت چی‌یە؟

گووتی:- عەبدوشەمس.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- بەڵکو عَبْدالرّحمن ئەویش گووتی:-

بەڵێ عبدالرحمن، دایك و باوکم بە قوربانت بێت...

بەلاّم هەر بە ئەبو هورەیرە بانگ کراوە، هۆیەکەشی دەگەرێتەوە بۆ ئەوە کەوا لە کاتی منداڵیدا پشیلەیەکی بچووکی هەبوو یاری لەگەڵ دەکرد، لەبەرئەوە هاورێیە هاوشانەکانی خۆی بانگیان دەکرد بە: ئەبو هورێرە ... واتە باوکی پشیلۆکە..

ئەم ناوەی بلاّوەی کرد تاکو سەرکەوت بەسەر ناوە راستەقینەی خۆی..

کاتێك بەهۆی مسوڵمان بوونی‌و نزیك بوونەوەی لە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ بە (ابي هِرّ) بانگی دەکرد، ئەمەش لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەر بوو (ابو هريرە) هەروەك خۆی دەڵێت:-

پێغەمبەر ﷺ بەم ناوە بانگی کردووم:

(هِرّ) نێرەی پشیلەیەو ، (هريرە) مێیەی پشیلەیە، نێرەش باشترە لە مێیە...

ئەبو هورەیرە-خوا لێی رازی بێت- لەسەر دەستی گوفەیلی کوڕی عەمری دوسی موسڵمان بوو، لەناو هۆزەکەی (دەوس) مایەوە تاکو پێغەمبەر و یاوەرەکانی کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە بە شەش ساڵ، ئەوەبوو لەگەڵ کۆمەڵێك لە هۆزەکەی گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە.

* * *

ئەم گەنجە دەوسی‌یە خۆی یەك لا کردەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاورێیەتی کرد ، مزگەوت بوو بە ماڵی‌و، پێغەمبەریش ﷺ بوو بە مامۆستاو پێشەوای، ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێت- لە ژیانی پێغەمبەردا نەژنی هەبوو نە منداڵ، بەڵکو

دایکێکی بەساڵاچووی هەبوو سوور بوو لەسەر بێباوەڕی، بەڵام ئەبوهورەیرە بەردەوام بانگی دەکرد بۆ سەر ئیسلام لەبەر سۆزی دایکایەتی و چاکەی لەسەری، هەرچی دایکی بوو لەبەری هەڵدەهات و لەسەر بێباوەڕیەکەی خۆی سوور بوو...

ئەویش پاش ئەم هەوڵانە وازی لێهێناو خەمو پەژارە شاڵاوی بۆ دەهێنا...

ڕۆژێك لە ڕۆژان بانگی دەکات بۆ بڕوا هێنان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ، دایکی قسەیەك لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەبو هورەیرە دڵی بریندار دەبێ و خەم دەخوات...

بە گریان دەڕوات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێت: بۆچی دەگرێیت ئەی ئەبو هورەیرە؟

ئەویش دەڵێت:-

من بەردەوام هەوڵم دەدا بانگی دایکم بکەم بۆ سەر ئیسلام و هەرچی دایکم بوو لێی قبوڵ نەکردم...

ئیمڕۆ بانگم کردووە بۆ موسڵمان بوون قسەیەکی خراپی لەسەر تۆ کرد...

لە خوای گەورە بپاڕێوە دڵی دایکی ئەبو هورەیرە نەرم بکات بۆ ئیسلام پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆکرد...

ئەبو هورەیرە دەڵێت:-

ڕۆیشتمەوە ماڵەوە، دەرگاکە داخرابوو ، گوێم لە شرپ وهۆڕی ئاو بووکاتێك ویستم بچمە ژوورەوە دایکم گووتی:-

لە شوێنی خۆت بە ئەی ئەبوهورەیرە..

پاشان جلوبەرگی لەبەر کرد و گووتی:-

وەرە ژوورەوە، چوومە ژوورەوەو گووتی:-

اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً عبدُهُ وَ رَسُولُه ...

گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، دەگریام لە کەیف خۆشیان هەروەك کاتژمێرێك پێشتر دەگریام لە خەمان و گووتم:-

مزگێنی ئەی پێغەمبەری خوا ... خوای گەورە دوعاکەی گیرا کردیت و دایکی ئەبو هورەیرەی هیدایەت دا بۆ ئیسلام .

* * *

ئەبو هورەیرە -خوا لێی ڕازی بێت- بە جۆرێك پێغەمبەری ﷺ خۆشتدەویست ئەم خۆشەویستی‌یە تێکەڵاوی گۆشت و خوێنی ببوو..

لە تەماشاکردنی ڕووخساری پێغەمبەر تێر نەدەبوو هەروەك دەڵێت:-

((هیچ شتێکم نەبینیوە جوانترو بریقەدارتر بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەتگووت خۆر لەدەم و چاوی هەڵدێت ...

ئەبوهورەیرە سوپاس و ستایشی خوای دەکرد لەسەر ئەوەی بەخششی پێداوە هاوڕێیەتی پێغەمبەر و شوێنکەوتووی ئایینەکەی و دەیگووت:-

حەمدو ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەبوهورەیرەی هیدات دا بۆ ئیسلام ...

حەمدو ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەبوهورەیرەی فێری قورئان کرد ...

حەمدو ستایش بۆ ئەو خوایەی بەخششی کرد بەسەر ئەبو هوریرە بە هاوڕێیەتی موحەممەد ﷺ...

*　　　*　　　*

هەروەك ئەوەی ئەبو هوریرە نووسا بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها نووسا بووش بە زانست ببوو بە پیشەو هیوایەتی کەوا داوای بۆ دەکرد..

زەیدی کوڕی ثابت -خوا لێی رازی بێت- دەڵێت:

جارێکیان من و ئەبوهوریرە بە یەکەوە لە مزگەوت یادی خوامان دەکرد دەپاڕاینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان بەدیارکەوت و، بەرەو ڕوومان هات تاکو لە نێوانمان دانیشت، ئێمەش بێدەنگ بووین، فەرمووی:-

بگەڕێنەوە بۆ ئەم کارەی لەسەری بوون.

من و هاوڕێکەم لە خوا پاڕاینەوە، پێغەمبەری خواش داوای ئامینی بۆ دەکردین پاشان ئەبو هورەیرە دوعای کرد و گووتی:-

پەروەردگارا من داوای ئەوەت لێدەکەم کەوا هاوڕێکەم داوات لێدەکات داوا زانستێکت لێدەکەم لە یادی نەکەم...

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- ئامین .

ئێمەش گووتمان:- هەروەها ئێمەش داوا لە خوا دەکەین بە زانستێك لەیادی نەکەین پێغەمبەر فەرمووی :-

مێرد منداڵە دەوسیەکە پێشتان کەوت..

ئەبوهورەیرە -خوا لێی رازی بێت- هەروەك چۆن حەزی زانستی بۆ خۆی کردووە بۆ خەڵکیشی ویستووە..

نموونەی ئەمەش رۆژێکیان بە بازاڕی مەدینەدا دەڕوات خەڵك خەریکی دونیا بوون و نقوومی کڕین و فرۆشتن و بینەو بەردە بوون، بەرامبەریان وەستاو گووتی:-

ئەی خەڵکی مەدینە بە چ بەند بووینە!!

گوویتان:- چیت بینیوە پێوەی بەند بووینە ئەی ئەبوهورەیرە؟

گووتی:- میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەش دەکرێ و ئێوەش لە ئێرەن ..! ناڕۆن بەشی خۆتان وەربگرن!!

گووتیان:- ئەمە لە کوێیە ئەی ئەبو هورەیرە؟

گووتی:- له مزگەوتە...

بە پەلە هاتن بۆی، ئەبو هورەیرە بۆیان وەستا تاکو گەڕانەوە کاتێك ئەبوهورەیرەیان بینی و گووتیان:-

ئەی ئەبوهورەیرە ئێمەت هێنا مزگەوت چووینە ناوی هیچ شتێکمان نەبینی دابەش بکرێت...

ئەویش پێی گوتن:- کەستان نەبینی لە مزگەوت؟!

گووتیان:- بەڵێ ... خەڵکمان بینی نوێژیان دەکردو، خەڵکانێك قورئانیان دەخوێندو، خەڵکانێك باسی حەڵاڵ و حەرامیان دەکرد...

ئەبوهورەیرە گووتی:- خاکتان بەسەر... ئەمەیە میراتی موحەممەدﷺ ...

* * *

ئەبوهورەیرە -خوا لێی رازی بێت- بەهۆی یەکلابوونەوەی بۆ زانست و، یەکلابوونەوەی بۆ کۆڕەکانی پێغەمبەری خوا بە جۆرێکی وا ماندوو بووە هیچ یاوەرێك بەم جۆرە ماندوو نەبووبە بەهۆی برسیەتی و ناخۆشی ژیان...

جارێکیان برسیەتی تینی بۆ هێنام وام لێهات پرسیاری ئایەتی قورئان بکەم لە یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا من دەشم زانی بۆ ئەوەی لەگەڵە خۆیان بمبەنەوە ماڵەوە و نانم بدەن...

ئەم رۆژە ئەوەندە برسی بووم وام لێهات بەرد بە سکمەوە بنێم و، لەسەر رێگای یاوەران دانیشتم، ئەبوبەکر بەلامدا رۆیشت پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێی کرد، پرسیارم لێی کرد تەنها بۆ ئەوەی دەعوەتم بکات-بانگی نەکردم.

پاشان عومەری کوڕی خەتتاب بەلامدا ڕۆیشت پرسیاری ئایەتێکم لێی کرد ئەویش دەعوەتی نەکردم، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ بەلام دا ڕۆیشت زانی برسیەتی چی پێکردووم و فەرمووی:-

ئەبوهورەیرە ؟!

گووتم:-

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، بەدوای کەوتم، لەگەڵی چوومە ماڵەوە بەرداخێکی بینیەوە شیری تیابوو، بەماڵەوەی گووت:-

کێ ئەمەی هێناوە،؟!

گووتیان :- فلانە کەس بۆ تۆی ناردووە.

فەرمووی:- ئەی ئەبوهورەیرە بڕۆ لای خەڵکی (صُفَّة)، بانگیان بکە بۆ خواردن، لە دڵی خۆمدا گووتم:-

خەڵکی (صَفّة) چی لەم شیرە بکەن؟!

من خۆزگەخواز بووم فرێکم لەم شیرە پێبدات، هێزی پێپەیدا بکەم، پاشان بچم بۆ لایان، خەڵکی (صَفّة) م هێناو بانگی دەعوەتم کردن، ئەوانیش هاتن، کاتێك لە لای پێغەمبەری خوا دانیشتن فەرمووی:-

ئەی ئەبوهورەیرە بگرەو پێیان بدە، لێم وەرگرت دام بە پیاوەکان خواردیانەوە تاکو تێر بوون و هەموویان خواردیانەوە ...( دەڵێن خەڵکی (صَفّة) کەوا لە مزگەوتی پێغەمبەر دەمانەوە ژمارەیان نزیکەی حەفتاکەس دەبوو)..

بەرداخەکەم دایەوە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ، سەری پیرۆزی لێم بڵند کردەوەو زەردەخەنەی بردەوە و فەرمووی:-

من و تۆ ماوین..

گووتم:- ڕاست دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی :- بخۆوە، منیش خواردمەوە...

پاشان فەرمووی:- بخۆوە، منیش لێم خواردەوە...

بەردەوام دەیفەرموو: بخۆوە، منیش دەم خواردەوە تاکو گووتم:-

سوێند بەو کەسەی تۆی هێناوە بەهەق شوێن نەما تێی بکەم، جامەکەی لێوەرگرتم و بەرماوەکەی خواردەوە...

ئەوەندەی نەبرد تاکو خێرو بەرەکەت ڕژا سەر موسڵمانان بە هۆی ئەم دەسکەوتانەی لە ئازادکردن شوێنەکان بەدەستیان دەکەوت، ئەبوهورەیرە خوا ماڵی پێداو شوێن و جێگەی بوو و لەگەڵ خێزان و منداڵ..

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم شتانە هیچ شتێکی لە سروشتی بەڕێزی ئەبوهورەیرە نەگۆڕی، ڕۆژانی ڕابردووی لەیاد نەبردەوە، زۆرجاران دەیگووت:-

بەبێ باوکی گەورە بووم و بە هەژاری کۆچم کردو، من کرێگرتەی بوسرەی کچی غەزوان بووم بە نان و زگ، خزمەتی خەڵکم دەکرد کاتێك گەشتێکیان دەکرد، جڵەوی ووشترم بۆ دەگرتن کاتێك سوار دەبوون، خوداش بوسرەی کچی غەزوانی کرد بە خێزانم...

سوپاس بۆ ئەم خوایەی ئەم ئایینە سەقام گیر دەکاو ئەبوهورەیرەشی بۆ دەکات بە پێشەوا...

ئەبوهورەیرە لە ژیانیدا لە سەردەمی خەلیفەکان زۆر جاران لێپرسراوەتی پێسپێردراوە، لە سەردەمی ئیمامی عومەر کراوە بە ئەمیری بەحرێن...

هەرچی ئیمامی عومەر بوو -خوا لێی رازی بێت- زۆر بە توندی لە فەرمانڕەواکانی دەپێچایەوە... ئەگەر یەکێکی کردبا بە فەرمانڕەوا، ئەم ڕۆژەی فەرمانڕەوایەتی بەجێدەهێشت دەبایە تەنها بە جل‌وبەرگەی بەری جێیهێشتیا ، ئەوا

لەبەر دەستی ئیمامی عومەر ڕزگاری نەدەبوو، ئەگەر سەرچاوەی ماڵەکەی حەڵاڵ و ڕێگا پێدراویش جێهێشتبایە...

کاتێك ئەبوهورەیرە کرا بە فەمانڕەوای بەحرێن هەندێك ماڵی کۆکردەوە، لە ڕێگای حەڵاڵ، عومەر پێی زانی و بانگی کرد بۆ مەدینە..

ئینجا با دەقی گفتوگۆیەکە بۆ خودی ئەبوهورەیرە لێگەڕێین:-

(عومەر پێی گووتم:-

ئەی دوژمنی خواو، دوژمنی پەرتوکەکەی، ئایا ماڵی خوات دزیوە؟؟

گووتم:-

من نە دوژمنی خوا و نەدوژمنی پەرتوکەکەیمە، بەڵکو دوژمنی ئەو کەسەم دوژمنایەتی ئەو دەکات و من ماڵی خواشم نەدزیوە...!

پێی گووتم:- لە کوێ ئەم دە هەزارەت کۆکردۆتوە...؟؟

گووتم:- وڵاخەکانم زاون و، خێریان داوەتەوە..

عومەر گووتی:- بیخەرە ماڵی موسڵمانان واتە (بيت المال) ...!!

ئەبوهورەیرە ماڵەکەی بۆ ئیمامی عومەر هێناو پاشان دەستی بەرزکردەوە گووتی:- (اللهم اغفر لأمير المؤمنين) واتە خودا لە گەورەی بڕوادارن خۆش ببە..).

پاش ماوەیەکی‌تر ئیمامی عومەر سەر لە نوێ لێپرسراوەتی پێشنیاری ئەبوهورەیرە کرد، وەری نەگرت و پاساوی بۆ هێنایەوە..

عومەر پێی گووت:- بۆچی؟؟

ئەبوهورەیرە گووتی:- تاکو جوێنم پێنەدرێ و، ماڵم ببردرێ و، لە پشتم بدرێ...

پاشان گووتی:- دەترسم بە بێئاگایی فەرمان بکەم و قسە لە خۆمەوە بکەم..

بەم جۆرە سەرتاپای ژیانی ئەبوهورەیرە بریتی بوو لە خواپەرستی و چاکەکردن و زانست . ئەبوهورەیرە لەگەڵ ئەم هەمو زانستەی خوای گەورە لە زانستی فەرمووده پێی دابو، مل کەچی‌یەکی بێوێنی هەبوو بۆ خوای گەورە، بە ڕۆژ بەڕۆژوو بوو و، بە شەو شەونخوونی دەکرد لە سێیەکی شەو هەڵدەستایەوە، پاشان خێزانەکەی بە ئاگا دەهێناو، ئەویش سێیەکی دووەم هەڵدەستایەوە، پاشان خێزانەکەی کچەکەی بەئاگا دەهێناو سێیەکەکەی تریش هەڵدەستایەوە...

خواپەرستی بەم جۆرە بە درێژایی شەو لە ماڵی ئەبوهورەیرە نەدەوستا...

هەروەها دایکە بە ساڵاچووەکەی تاکو لە ژیان مابوو، ئەبوهورەیرە بۆی بە وەفا بوو و چاکەی لەگەڵ دەکرد... هەر کاتێك نیازی دەرەوەی هەبوایە لەسەر دەرگا دەوەستاو دەیگووت:- السلام عليك ئەی دایکە ورحمه الله وبركاته...

ئەویش وەڵامی دەدایەوە دەیگووت:- وعليك السلام ئەی کوڕم ورحمه الله وبركاته..

ئەبوهورەیرە دەیگووت:-

خوا ڕەحمت پێ بكات هەروەك چۆن بە بچووكی پەروەردەت كردم.
دایكی وەڵامی دەدایەوەو دەیگووت:-
خوا ڕەحم بە تۆش بكات هەروەك چۆن چاكەت بە پیری لەگەڵ كردووم...
هەر كە دەگەڕایەوە ماڵەوە ئەم كارەی دووبارە دەكردەوە...
بەم جۆرە ئەبوهورەیرە سوور بوو لەسەرئەوەی خەڵكی ئاگادار دەكردەوە لەگەڵ دایك و باوكیان چاك بن لە گوێڕایەڵیان دەرنەچن، ڕۆژێكیان دوو پیاوی بینی دەڕۆیشتن یەكێكیان لە ئەوەیتریان بە تەمەن تر بوو بە بچووكەكەی گووت:-
ئەم پیاوە چی تۆیە؟!
گووتی:- باوكمە
ئەبوهورەیرە پێی گووت:- بەناوی خۆی بانگی نەكەیت..
لە پێشی نەڕۆیت..
لە پێش ئەویش دانەنیشیت.
بەم جۆرە ژیانی ئەبوهورەیرە پڕ بوو لە بەزەیی بە گیاندار و سۆزی دایكایەتیو پەروەردەی ئیسلامی ڕەسەن و جیهادكردن لە ڕێگای خوا لەم ڕۆژەی كۆچی كرد بۆ مەدینە لە هیچ جەنگێك بەدوا نەكەوت...
تاكو تەمەنی درێژ بۆوە بۆ حەفتاو هەشت ساڵ، كاتێك نەخۆش كەوت بە نەخۆشی مەرگ گریا... پێیان گوت:-
بۆچی دەگریێت ئەی ئەبوهورەیرە ؟!
ئەویش گووتی:- هەرچی منم بۆ دونیای ئێوە ناگریێم...
بەڵكو دەگریێم لەبەر دووری سەفەر و كەمی خۆراك...
بەڕاستی لە كۆتایی ڕێگا وەستاوم كۆتایم پێ دێت بە بەهەشت یان ئاگر، وە نازانم بۆ كامەیان دەبم !!.
پاشان لە خوا پاڕایەوە و گووتی:-
پەروەردگارا من حەز دەكەم پێت بگەم، حەز لە پێگەیشتنم بكەو پەلەم بۆی بكە...
پاش ئەم نزایە گیانی پاكی بەرەو ئاسمان بەرزبۆوە گەیشت بە پەروەردگاری لە ساڵی پەنجاو نۆی كۆچی
ڕەحمەتی خوا لە ئەبوهورەیرە كەوا توانی لە ماوەی ژیانی هەزارو شەش سەد فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بگەیەنێت بە موسڵمانان ...
خوا پاداشتی چاكەی بداتەوە ئێمەش لە ڕۆژی دوایی شاد بكات بەم زاتە پیرۆز و خۆشەویستانە آمین



# حەسەنی کوڕی عەلی

گەورەی گەنجانی خەڵکی بەهەشت و
بەهاری دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ

## (٨٧)

# حەسـەنی کوڕی عەلـی

### گەورەی گەنجانی خەڵکـی بەهەشـتو بەهاری دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە ماڵێك لە ماڵە دونیانەویستەکان لە جوانکاری و کەلوپەلدا لە مەدینەی ڕونـاك، ماڵێك هەبوو لە بەڕێزترین و لە پاکترینی خێزانەکان... خێزانێك کۆببۆوە لە نێو شەرەفی بنەماڵەو ڕەسەنی بنەچەو ڕەوشتی ئیسـلامو ڕێزلێنـانی ئیسـلام بۆیان و شاهێدی دانـی قورئـانی پـیرۆز بـە پـاکی و بێگـەردی بۆیـان، هـەروەك خـوای گـەورە دەرهـەقیان دەفەرمووێت:-

﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمْ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾(الاحزاب ٣٣)

ئەم ماڵە ڕەسەنە پیرۆزە فاطمـەی کچی پێغەمبـەری خواو ﷺ ئیمامی عەلـی-خوا لێی ڕازی بێت- لە باوەشیان گرتبوو، ئەم ماڵە بەختەوەرەیان ڕووناك کردبۆوە...

بەڕاستی ئەم ماڵە خێزاندارە بەختەوەری ڕاستەقینەی بەخۆوە گرتبوو، بەختەوەریەك دوور لە دونیای ڕازاوەو سامانی بە هیلاك بەر، بەڵکو بەختەوەریەك دروست ببوو لەسەر بنچینـەی ڕەزامەندی خوای گەورە و ڕازی بـوون بـە ئـایینی ئیسـلام و پێغەمبەرایـەتی موحەممەد ﷺ، بەختەوەریەك ڕووناك ببۆوە بە شانازی پێغەمبەرایەتی و بۆن و بەرامی پەیامو ڕوناکی قورئان و مێرگی ڕەوشتی پێغەمبەرایەتی و شارێکەی موحەممەد ﷺ...

بەڕاستی ئەم ماڵە ماڵێکی مەزنەو، بەڵام ئەگەر لە دەرگات داو لـێی چوویە ژوورەوە ئەوا نە ڕووباری ڕێشتوو و نە ڕایەخی عەجەمی و نە شووشەواتی سەرسووڕهێنەرو نە نەخش و نیگاری سەیرو سەرمەرە دەبینیت..!!

بەڵێ ئەم ماڵەی کچی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ ماڵی مێردی بەڕێزی ئیمامی عەلی‌یە-خوا لێی ڕازی بێت-، هەرچەندەمەزنی ماڵ لە ئیسـلامدا ناپێورێت بە زۆری کەلوپەل و جوانکاری، بەڵکو دەپێورێت بـە ڕەوشـتی ئیسـلامی و خووڕەوشـتی پـاك و بێگەرد، بەڵێ بەڕاستی ئەم ماڵە گەورە بوو و بـەڕێز بوو بـە پێشـەوای موجاهیدان بەم فەرموودەیە:-

پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوەو دەستی فاطمـەی گرتبوو و فەرمووی:-

((مَن عَرَفَ هذه عَرَفَها، وَمَنْ لَمْ يَعرِفْها فَهِيَ فاطمة بِنْتُ مُحَمَّدْ وَهِيَ بِضعَةُ مِنِّي، وَهِيَ رُوحِي التي بَيْنَ جَنْبِي مَنْ آذاها فَقَد آذاني وَمَنْ آذاني فَقَد آذى الله)).

واتە:- هەرکەسێك ئەوە بناسێت ئـەوا بەڕاسـتی ناسـیوویەتی، وە ئەگـەر نەیناسێت ئەوە فاطمـەی کچی موحەممەدە ئەوە بەشێکە لەمن، ئەوە دڵمە، ئەوە ڕوحی نێو لەشمە

هەر کەسێك ئازاری بدات ئەوە ئازاری منی داوە، هەر کەسێکیش ئازاری من بدات ئازرای خوای داوە.

(سبحان الله) ئەم ماڵە چەند جوان و ڕێك و پێکە، ماڵێك پڕ لە یادی خواو تەسبیحات و سوپاس و ستایشی خوای گەورە...

بەڵام ژیانی خێزانداری خۆ پێویستی بەکوڕو کچ هەیە، هەروەك دار پێویستە بەر بگرێت بۆ ئەوەی ماڵەکەی پێ ئاوەدان بکرێتەوە، ڕاستی فەرمووە خوای گەورە هەروەك دەفەرمووێت:-

﴿ الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلاً ﴾ (الكهف ٤٦)

هەروەها جیهانی خەونیش پڕە لە شتی سەیرو سەمەرە هەروەك پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت:-

((والرّؤيا الصادقةُ جزءٌ مِن ستٍّ وأربَعينَ جزءاً مِنَ النبوّة)).

خێزانی ئیمام (عەباس کوڕی عبدالمطلب)-خوا لێیان ڕازی بێت- واتە دایکی (الفضل) لە خەودا خەونێکی سەرسوڕهێنەری بینی، کەوا لە خەونیدا ئەندامێك لە ئەندامەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەکەی بوو، هات و خەونەکەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش زەردەخەنەی بردەوەو پێی فەرموو:- خێرت بینیوە، فاطمە منداڵێکی دەبێ و تۆش شیری دەدەیتێ...

(أم الفضل) زۆر کەیف خۆش بوو بە لێکدانەوەی ئەم خەونە چونکە ئەو وای دەزانی ئەم خەونە مانایەکی تری هەیە... ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- گوێی لە خەونەکەی (أمّ الفضل) بوو، هەروەها لەگەڵ لێکدانەوەی ڕۆیشت بۆ لای فاگمە-خوا لێی ڕازی بێت- کەیف خۆشیش لە نێوچەوانی دیار بوو خۆشی دەروونی پڕکردبوو، بەهۆی ئەم مزگێنیەی دەیگەیاند بە فاطمە بەم جۆرە کەیف خۆشی ئەم ماڵە بەڕێزەی پڕکرد.

ئیتر بەم جۆرە بۆ یەکەمین جار فاطمە هەستی بە ژانی منداڵ بوون کردو لە خوا دەپاڕایەوە کەوا نۆبەرەی منداڵێکی پیرۆز بێت... لە ڕۆژی پازدەی ڕەمەزانی ساڵی سێی کۆچی فاطمە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەم منداڵە پیرۆزەی بوو.

کەیف خۆشی دڵی پێغەمبەری خوای ﷺ داگرت، پاش ئەوەی هەواڵیان پێگەیاند، ئەویش چووە ماڵی فاطمە و داوای مەلۆتکەکەی کردو لەبن گوێی بانگ داو، لە خوا پاڕایەوە بیپارێزێت لە شەیتانی بەدو، هەروەها لە ڕۆژی حەفتەمین پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی ئیمام عەلی و پرسیاری لێکرد:-

چ ناوێکت لەم منداڵەکە ناوە؟

ئیمامی عەلی گووتی:- ناوم لێناوە (حرب).
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- بەڵکو ناوی (حەسەن) بێت.
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سەربڕینی مەڕێك و دابەشکردنی بەسەر هەژارە موسڵمانەکان ئینجا نرخی پارەی مەڕەکەیدا بە مامانەکە بۆ کڕینی مەڕەکە.
ئیتر فاطمە -خوا لێی ڕازی بێت- باشترین وجوانترین پەروەردەی ئەم منداڵەی کرد بە شیرە پیرۆزەکەی، هەروەها چاکترین چاودێری کرد بەوپەڕی نەرمونیانی.
بەم جۆرە (حەسەن) لەم ئاو و هەوا خۆش و شیرینە لە باوەشی پیرۆزی ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- گەورە بوو، بەڕاستی خوای گەورە مەزنترین دیاری پێبەخشین.
دیاریەك لە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، دڵو دەروونی فاطمە ئەوەندە بەم منداڵە بەختەوەرو چاوگەشە خۆش بوو هەروەك لەسەر کۆشی پیرۆزی هۆی دایدەناو ئەم منداڵەی بە دەستەکانی هەڵدەپەڕاندو دەیگووت:-

اشْبِهِ أباكَ حَسَن          و خلع عَن الحقِّ الرَّسَن
واعْبُد إلهاً ذا مِنَنْ          ولا تُوالي ذا الإحَن

ئیتر (حەسەن) لە ئاوو هەوایەکی ئیسلامی پڕ لە لە خواپەرستی و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو، ڕەوشتی پاکو، جیهاد لە ڕێگای خوداو، چاودێری لە مافەکانی خودا چاوی گەشی کردەوە لەنێو دایكو باوکێکی بەختەوەرو، لە شاری مەدینەی پایتەختی دەوڵەتی ئیسلام و، سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی.
حەسەن -خوا لێی ڕازی بێت- گەورە بوو لە نێو مزگەوت و ماڵەوەی، لەدایكو باوکیو باپیرەی کاکڵەی ووتەی جوانو بنچینەی فێربوونی گوێ لێدەبوو، چاکترین خۆراکی نۆشی، هەروەك لە سەرەتای پەروەردەی گەورە بوو لەسەر ژیانی جیهادو تێکۆشانو بەرخۆدان.
خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (حەسەن) لە ڕادە دەرچوو بوو ئەو ڕۆژەی لە مەدینە بوایە لە بەیانیو ئێوارە پرسیاری (حەسەن)ی لە فاطمەی کچی دەکرد، هەر کاتێك گوێی لە گریانی بوایە دڵ تەنگ دەبوو، هەر کە چاوی پێکەوتبا یاری لەگەڵ دەکرد.
خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ ئوسامە کوڕی زەید-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:-
شەوێکیان بۆ پێویستیەك چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بۆم هاتە دەرەوەو، بە سەرپۆشێك شتێکی داپۆشیبوو.
کاتێك پێویستیەکەم تەواو بوو گووتم:- ئەمە چیە داتپۆشیوە ئەی پێغەمبەری خوا؟
سەرپۆشەکەی لادا (حەسەن) بوو و فەرمووی:-

هذا ابني و إبن إبنتي، اللهم إني احِبُهُ، واحبِبْ مَن يُحِبّهُ.

واته:- ئەمە کوڕمە و کوڕی کچمە، خودایە من خۆشم دەوێت و تۆش خۆشت بوێت، ئەو کەسەشت خۆش بوێت کە خۆشی دەوێت.

عبداللەی کوڕی عەبباس-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:-

پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەنی لەسەر ملی خۆی هەڵگرتبوو، پیاوێك گووتی:- (نِعْمَ المرْكبُ رَكِبتَ يا غلام و نِعمَ الرّاكبُ)... واتە:- ئەی منداڵ چاکترین هەڵگر تۆی هەڵگرتووە و باشترین هەڵگیراوی.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت وتاری بۆ موسڵمانان دەدا بینی (حەسەن) لە جل و بەرگێکی سوور دەڕواو ساتمە دەکات، پێغەمبەر ﷺ وتارەکەی بڕی و لەسەر مینبەر هاتە خوارەوە (حەسەن)ی لە باوەش گرتوو و بە دەستە پیرۆزەکانی گرتبووی و دەیفەرموو:-

خوای گەورە ڕاستی فەرمووە:-

﴿ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾ ( الانفال ٢٨)

تەماشای ئەم منداڵەم کرد دەڕوا و ساتمە دەکات ئارامم بۆی نەماو تاکو وتارەکەم بڕی و هەڵمگرت.

(ابو هريره) دەڵێت:-

بەم دوو گوێیانە گوێم لێبوو و بەم دوو چاوانە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی حەسەنی گرتبوو، پێیەکانی حەسەن لەسەر پێی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو (حُزُقَّةٌ حُزُقَّةٌ) واتە:- تاتی تاتی منداڵەکە هەنگاوی دەهاوێشت تاکو پێی لەسەر سینگی پێغەمبەری خوا دانا ﷺ، پاشان فەرمووی:- دەمت بکەرە پاشان ناو دەمی ماچ کردو دەیفەرموو:-

(اللهم احبّهُ فإنّني احبّهُ)... واتە:- خودایە خۆشت بوێت من خۆشم دەوێت.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ باپیرەی خۆشەویستی حەسەن کۆچی دوایی کرد، خەم و پەژارە ڕووی لە (حەسەن) کرد ئەو کاتە تەمەنی لە هەشت ساڵان تێپەڕی نەدەکرد ئیتر ئەو کەسەی هەموو کاتێك مامۆستایەتی بۆ دەکرد و خۆشیدەویست و یاری لەگەڵ دەکرد لە پێش چاوی وون بوو باوکێکی گەورەی لە کیس چوو.

هێشتا خەمی باپیرەی لە دڵ و دەروونی (حەسەن) نەڕەویبۆوە، ئەمجارەیان خەمێکی‌تر ڕووی لە (حەسەن) کردەوە ئەویش کۆچی دوایی دایکی خۆشەویستی (فاطمەی زەهراء)ی بەدوادا هات ئەمەش پاش شەش مانگ لە دوای کۆچی دوایی باپیرەی.

بەڵام لەگەڵ کۆچی دوایی باپیرەی و دایکی باوکو باشترین پەروەردکار بە وتەو کردەوەی بۆ مایەوە ئەویش ئیمامی عەلی بوو-خوا لێی ڕازی بێت-، هەروەها باشترین یاریدەدەریش گەورەی گەنجان ئیمام (حوسەین)ی برای لەگەڵی بوو...

بەم جۆرە (حەسەن) ڕووبەڕووی ژیانێکی نوێ بۆوە لە شاری مەدینە بە بیرو هۆشە ژیرەکەی کەوا خۆرکی لە فێرگەی ئیسلام بۆ ڕەوانە دەکرا.

(حەسەن) پیاوێکی گەورەو جوانو بە هەیبەتو ژیرو سەخی و خێرخوازو لەخواترس و مل کەچ بۆ فەرمانەکانی خوای لێدەرچوو.

ئەم سیفەتە بەرزە حەسەنی پاڵاوت بۆ ئەوەی مێرخاسێکی بێوێنەی لێدەربچێت، ئەوەبوو سەیری ڕووداوە ئیسلامیەکانی دەکرد لە نزیکەوە و کاری لێدەکرد، هەروەها لە باوکی موجاهیدی ئیمامی عەلی گوێبیستی هەواڵی جەنگەکانی هەڵگەڕاوەکان دەبوو پاش ئەوەی زۆر لە عەرەبەکان پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و، هەنێك لە موسڵمانان فەرزی زەکاتیان بەجێنەهێنا، ئەوەبوو خەلیفەی یەکەم سوێندی خوارد شەڕی ئەم هەڵگەڕاوانە بکاتو دەیگووت:-

(والله لَو مَنَعوني عِقالاً كانوا يؤدونَهُ الى رسول الله ﷺ لَقاتَلتَهُمْ عليه).

واتە:- سوێند بە خوا ئەگەر قەدەغەم بکەن لەسەر نەدانی گوریس کەوا دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم.

بەم جۆرە (حەسەن) کاتێك تازە مێرمنداڵ بوو دەیبینی باوکی خۆشەویستی ئیمامی عەلی وەستاوە لە دەورەی شاری مەدینە بۆ پاراستنی ئەم شارە لە هێرشبەرە داگیرکەرەکان، ئیتر ئەم هەموو شتانە وای کرد قارەمانی ئەم داستانەمان دیمەنێکی تەواوی دەربارەی ژیانی جیهادیو خۆ بە قوربانیدان بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خودا فێر ببێت...

لە ڕێنمایەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ (حەسەن)-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:- پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ووشەیەکی فێر کردووم بۆ ئەوەی بیڵێم لە نوێژی ویتر:-

( اللهم إهدِني فيمَنْ هَدَيتْ، وَعافِني عافَيْت، وَ تَولّني فِيمَنْ تَوَلَيْت، وَ بارِك لي فيما اعطيت، وَقِني شرّ ما قَضَيت، فإنَكَ تَقضي ولا يُقضى علَيك، وَ إنَهُ لا يَذِلُ مَنْ والَيت ولا يَعَزُ مَن عاديت، تَبارَكتَ ربّنا و تَعالَيت).

پێغەمبەری خوا ﷺ فووی خۆشەویستی هەقو یەکسانی و لێبووردنی لە دەمی ئیمامی حەسەن کردبوو، هەروەها فووی قەناعەت و ڕەزامەندیشی لە گیانی پیرۆزی کردبوو.

حەسەن-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت:-

من منداڵ بووم دەنکە خورمایەکی صەبەدەقەم هەڵگرتەوە لێی وەرگرتمەوە.

پێیان گووت:- ئەی پێغەمبەری خوا ئەم خورمایە بەجێبهێڵە بۆ ئەم منداڵە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-
(انا آل محمد لا نأكل من الصَّدَقة)
واتە:- ئێمە نەوەی موحەمەد لە ماڵی صـەدەقە ناخۆیـن.
بەڵێ ئەمە ڕێنمایی پێغەمبـەری خوایە بۆ قارەمانی بەڕێزو کوڕی بـەڕێز حەسـەنی کوڕی عەلـی، بۆ ئەوەی پـەروەردە بێت لەسـەر کاروبـارە مەزنـەکانو، بێـز لـە خۆشـی دونیاو شتە بۆگەنەکانی ژیانی ئەم دونیایە بکاتەوە.
بەم جۆرە جێگای سەرسوڕمان نیە یاوەرێکی وەکو ئیمام حەسـەن پـەروەردە بێـت لەسـەر لەبـەرکردنی قورئـانی پـیرۆزو فیقـهی ئیسـلامیو، زانینـی نهێنیـەکانی زۆر بـە وردەکاریو، ڕەوشتو خووی باوکی ئیمامی عەلـی-خوا لـێی ڕازی بێت- وەرگرێت لە زمان ڕەوانیو ڕەوانبێژیو، ڕەوشتی ئیسلامی.
پاش پێغەمبەری خواش هەردوو خەلیفە بەڕێزەکان ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر ڕێزیان دەنا لە ئیمامی حەسەن، هەروەك عقـبەی کوڕی حارث دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-
ئیمامی ئەبوبەکر نوێژی عەسری بۆ کردین لەگەڵ ئیمامی عەلی هەڵسان و ڕۆیشـتن، بینی حەسەن لەگەڵ منداڵان یاری دەکات، حەسەنی لە باوەشی خۆی گرتو گووتی:-
(بـأبي شبيـة النبـّي، و علـيّ يتبسـّم).
واتە:- بە باوکی پێغەمبەر دەچێت، وە زەردەخەنەی بە من بردەوە.
(محمدی تـەیمی) دەڵێـت:- ئیمامی عومـەر کاتێك دیوانـی خەلافـەتی دانا حەسـەنو حوسەینی-خوا لـێیان ڕازی بێت- لە دیوانی وەزارەت دامەزراند لە باوکیشیان بە هۆی نزیکیـان لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بـۆ هـەر یـەکێکیان پێنـج درهـەمی بڕیـەوە-خـوا لـە هەمووان ڕازی بێت-.
پـاش ئـەوەی فتوحـاتی ئیسـلامی فرەوان بـوو ئاسـۆی ئیسـلامی بـۆ بەرزکردنـەوەی وشـەی خـواو، ژێرخـاك کردنـی ئـاڵای ناحـەق، موسـڵمانان لـە دورگـەی عـەرەب بـە ئایینەکەیانەوە دەرچوون، دادیان بە فەرمانڕەوایی کردو، باشـترین ڕێبـازو سـیرەیان بۆ خەڵك بەجێهێشتو، چەند وڵاتیان ڕزگارکرد، چەندەها بەندەیان هیدایەت دا بەم ڕەوشتە بەرزانەیان.
ئەوەبوو ئاڵای ڕۆمەکان لە جەنگی یەرموك کەوتە خوارەوەو، ورەیان بەرداو، وڵاتیـان پارچە پارچە بوو و لە وڵاتی شام بە سەرشۆڕیو بەزیوی دەرچوون.
هەروەها فارسەکان لـە جـەنگی قادسیە بەزینو، موسڵمانان دەستیان گرت بەسـەر موڵكو ماڵیانو لـە عیـراقو لـە وڵات بـەدەریان نـان و بـە سەرشـۆڕی بـۆ مۆڵگـەکانیان پاشـەکشـەیان پێکردن.

کاتێك ئیمامی عثمان -خوا لێی ڕازی بێت- جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست، فتوحاتی ئیسلامی درێژ بۆوە بۆ (طبرستان) پادشای (جرجان) سوپای کۆکردەوە بۆ شەڕی موسڵمانان .

خەلیفی سێیەم ئیمامی عپمان سوپایەکی بە فەرماندەی سەعیدی کوڕی عاص بۆ ڕەوانە کردن و تێیدا گەورە یاوەرەکان خوا لێیان ڕازی بێت- بەشداریان کرد.

ئینجا لەم جەنگەدا موجاهیدی مەزنمان قارەمانی بێوێنەمان حەسەن-خوا لێی ڕازی بێت- بەشداری کرد و ئاڵای بەرزی ئیسلامی هەڵگرت لەم هەڵمەتە ئیسلامیە مەزنە... تەمەنی پیرۆزی ئەم کاتە بیست ساڵ بوو. بەڵێ گەنجانی ئیسلام لەم سەردەمەدا کەوا لەوپەڕی لاوێتیدا بوون لەم تەمەنەدا تەنها تەمەنیان لەسەر جیهادو مردن لە ڕێگای خودا تەرخان دەکرد، ژیانێك دوور بوو لە ڕابواردن و خۆشی دونیا، بەم جۆرە خودا لێیان ڕازی بوو، ئەوانە کۆمەڵی خودا بوون. بەڕاستی تەنها کۆمەڵی خوداش سەرکەوتوو بوون.

سوپای ئیسلام گەیشتە (جرجان) و پادشای (جرجان) ناچار بوو داوای ئاشتەوایی بکات لەگەڵ فەرماندەی سوپای موسڵمان... پاشان سوپای ئیسلامی بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە شاری مەدینەی پێغەمبەر پاش ئەوەی هەڵسا بەو ئەرکەی پێیسپاردار بوو.

هەروەها پاش ئەوەی موسڵمانان بەرەنگاری ئەم فیتنە ڕوو زەردە بوونەوە، لە ئەنجامدا هەڵگەڕاوەکان دەوری ماڵی ئیمامی عثمانیان دا.

ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- حەسەن و حوسەینی ڕەوانەکرد بۆ بەرگری لە خەلیفەی ئیسلام، ئەوەبوو حەسەن و حوسەین هەڵسان بەم ئەرکەی پێیان سپاردرابوو بەڵام قەزاو قەدەری خوا وای کرد ئیمامی عثمان شەهید بکرێت گیانی پیرۆزی بەرز بێتەو بۆ لای پەروەردگار..

لە پاش ئیمامی عپمان-خوا لێی ڕازی بێت- جڵەوی خەلافەت درا دەست خەلیفەی چوارەمی دادوەر و دونیا نەویست ئیمامی عەلی-خوا لێی ڕازی بێت- موسڵمانان بەوپەڕی کەیف خۆشی پێشوازیان لەم بەیعەیە کرد.

ئەو کاتەش قسە قسەی خەڵکی مەدینە بوو هەروەك ئیمام مالك دەڵێت-خوا لێی ڕازی بێت -.

هەروەها دەسەڵاتیش نەیتوانی ڕەوشتی ئیمامی عەلی بگۆڕێت لە مل کەچی و قەناعەت و ڕازی بوون بە هەژاری.

ئیمامی عەلی خوا لێی ڕازی بێت- سوور بوو لەسەر ماڵ بەخشین بەسەر هەژارە موسڵمانەکان و چاوی لە دەسکەوت و ماڵی دونیا نەبوو هیچ کەس لە خزم و کەسوکارو ناسیاری خۆی دانەنا لەسەر (بیت المال)ی موسڵمانان مەگەر ناسراو نەبوو بێت بە دەستپاکی.

ئیمامی عەلی دەیگووت:-
(یا دنیا غـرّي غیـري) واتە:- ئەی دونیا یەکێکیتر هەڵخەڵەتێنە.
ئیتر لەم ئاووهەوا خواپەرستیەدا ئیمامی حەسەن لەگەڵ باوکی لە کوفە ژیاوە...
بوو بە نموونەی پیاوێکی ئاسایی‌و موسڵمان و مل کەچ بۆ ئایینی خوا...
پاشان فیتنە لە نێوان موعاویە و ئیمامی مەزن عەلی-خوا لـێ‌ی ڕازی بێت- گەورە بوو جەنگی جەمەل‌و جەنگی صیفین ڕوویدا...
قارەمانمـان (حەسـەن) لـەم دوو جەنگـە خەفـەتبارە بەشـداری کـرد بـە جوانـترین بەشداری.
ئیتر ئەم کارە کۆتایی هات بە شەهیدکردنی ئیمام‌و پێشەوامان ئیمامی عەلی-خوا لـێ‌ی ڕازی بێـت- ... کاتێك دەستنوێژی شوشـتبوو دەڕۆیشـت بـۆ نوێـژ، بـەم جۆرە شەهیدبوونی ئەم مێرخاسـە مەزنە گەورەترین زیانی لە ئیسلام‌و موسڵمانان دا.
ئیمامی حەسـەن-خـوا لـێ‌ی ڕازی بێـت- بـەرەنگاری هەڵوێسـتێکی زۆر نـاخۆش و توونـد بۆوە، پـاش شـەهیدکردنی بـاوکی... ئـارامی گـرت‌و گـەورەترین کـاری کـرد لـە مێژووی ئیسلامدا و کۆتایی هێنا بە خوێن ڕشتنی موسڵمانان.
پاشان ئیمامی حەسەن لەسەر گۆڕی وەستاو گـەورەیی بـاوکی بەیـاد خەڵك هێنـاوەو سوپاس‌و ستایشی خوای کردو گووتی:- (إنّا لله وإنّا إليه راجعون) پاشان گووتی:-
(ئەی خەڵکینە ئەمشـەو پیاوێك گیانی پاکی کێشرا، نە موسڵمانە سـەرەتاکان‌و و نـە موسڵمانە کۆتاکـان نـاتوانن شـان لـە شـانی بـدەن، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە نـێردراوی دەینارد نەدەگەڕایەوە تاکو خوا لە کارەکەی سـەرکەوتووی دەکرد، هیچ شتێکی لە پاشە خۆشی جێنەهێشتووە بێجگە لە حەفتسـەد درهەم نەبێت ئەویش کۆیکردبۆوە بۆ کڕینی پێویستیەك).
پاشـان ڕەحمـەتی بـۆ بـاوکی ڕەوانەکرد تـاکو گریـاو خـەڵکیش دەسـتیان بـە گریـان کرد...
خەڵکی عێراق کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی بەیعەت بدەن بە ئیمامی حەسەن پاش باوکی بەڵام سروشتی ئیمام حەسەنیش وابوو هـەموو کـات لای دونیانەویستی هـەڵدەبژارد لـە پلەکانی دەسـەڵات‌و لێپرسـراوەتی، پێغەمبـەریش ﷺ هـەر چاوەڕێ‌ی ئەم سـیفەتەی لێدەکردو دەیفەرموو:-
(إن إبنـي هـذا سَيّدٌ، و لَعَلّ الله ان يُصلحُ بِهِ بَيـنَ فِئَتَيـنِ مِنَ المسلِمِيـنَ).
واتە:- بەڕاستی ئەم کوڕەم، گەورەیە، بەڵکو خودا بەهۆی ئەمەوە ئاشـتەوایی نێوان دوو چینی موسڵمانان بکات.
ئیمامی حەسەن بینی جەنگ سەر لە نوێ موسڵمانان دەهاڕێ، منداڵەکانیان هەتیو دەکاو، ئافرەتان بێوەژن دەکات، بە گەنجایەتی لەناویان دەبات، بیری لە ئاشتبوونەوەی

نێوان خۆی و موعاویە کردەوە، ئەم پێشنیارەی لە سەرەتادا ئاراستی خەڵکەکە کرد، بەڵام بینی پشێوی دەکەوێتە نێو ڕیزەکانیان، ئەم وتارە بەنرخەی بۆ دان:-

(ئێمە سوێند بە خوا پەشیمان نینە لە جەنگ کردن لەگەڵ خەڵکی شام، بەڵکو ئێمە شەڕمان کرد لەگەڵ خەڵکی شام بۆ ئاشتی و ئارامی، ئەم ئاشتیە پاشان ڕەنگی داوە بۆ دوژمنداری و ئارام بۆ نا ئارامی، ئێوە لە جەنگ کردنتان لە (صفین) ئاینتان لەپێش دونیاتان دانابوو ئەمڕۆکە واتان لێهاتووە دونیاتان لە پێش ئاینتان بێت، ئێمە هەروەکو خۆمانین بەڵام ئێوە گۆڕاون و وەکو خۆتان نین... هەروەها ئێوە کەوتوونەتە نێوان دوو کوژراو:

((کوژراوەك لە (صفین) بۆی دەگرێین و کوژراوەك لە(نهروان) داوای تۆڵەی لێ دەکەن، بەڵام ئەوەی ماوەتەوە ورەی بەرداوەو ئەوەی گەنجە و خوێن گەرمە داوای شۆڕش دەکات، هەروەها موعاویە داوامان لێ دەکات بۆ کارێك نە سەربڵندی تیایەو نە یەکسانی ئەگەر مردنتان دەوێت ئەوە عەواڵەی خوامان کردووە بە هۆی شمشێر، وە ئەگەر ژیانتان دەوێت قەبوڵی دەکەین و داوای ڕازی بوونی ئێوەش دەکەین)).

حەسەن چەند کەسێکی ناردە لای موعاویە بۆ ئاشتەوایی بەو مەرجەی هیچ نیازێکی خراپیان نەبێت لەگەڵ خەڵکی مەدینەو حیجازو عیراق بە هیچ شتێك ئەوەی ڕوویدا لە کاتی باوکی، موعاویەش وەڵامێکی باشی هەبوو بۆ داواکەی حەسەن.

کاتێك موعاویە هاتە کوفە لە ساڵی چل و یەکی کۆچی حەسەن هەڵسایەوەو گووتی:-

بزانن ژیرترین کەس ئەو کەسەیە لە خواترس بێت هەروەها نەزانترین کەسیش ئەوەیە خراپە بکات، وە ئەو کارەی من و موعاویە تێیدا ناکۆکین، یان ئەو شیاوترە بۆ ئەو کارە یاخود من شیاوترم، بەڵام من بۆ خودا وازم لێ ی هێنا لە پێناوی چاککردن و وەستانی خوێن ڕژانی ئوممەتی موحەممەد ﷺ...).

بەم جۆرە حەسەن دەسەڵاتی قەبوڵ نەکرد لەسەر حیسابی خوێنی موسڵمانان هەروەك دەیگووت:- (من شەرم دەکەم بۆ خودا کاتێك پێ ی بگەم و بە پێ نەچم بۆ ماڵی، لەبەرئەوە زیاتر لە دە جاران بە پیادە چوو بۆ حەجی ماڵی خودا).

حەسەن قورئانی زۆر دەخوێندەوە و زۆر دەگریا و بەڕۆژوو دەبوو شەو شەونوێژی دەکرد (خوای گەورە لێ ی ڕازی بێت)...

حەسەن-خوا لێ ی ڕازی بێت- هەروەکو مێژوو باسی لێوە دەکات دەڵێن لە ساڵی چل و نۆی کۆچی وە هەندێکی تریش دەڵێن:- ساڵی پەنجای کۆچی، کۆچی دوایی کردووە و لە (بەقیع) بەخاك سپاردراوە... لە دوای خۆشی چەند کوڕێکی لەپاش بەجێما:-

حەسەنو، زەیدو، طـەلحە و، قاسمو، ئەبوبەکر، عبدالله ئەوانە هەر هەموویان لەگەڵ مامیان لە کارەساتی کەربەلا شـەهیدکران خـوای گـەورە لـە ئیمـامی حوسـەینو هـەر هەموویان ڕازی بێت.

هەمرو، عبدالرحمن و، حوسـەینو، یەعقـوبو، اسماعیـل ئەمانـەش کوڕی ئیمـامی حەسەن بوو، تەنها حەسەنو زەید نەوەیان لە پاش بەجێما ئینجا دەبێت (محەممەدی مەهدی)یش لە نەوەی یەکێك لەم دووانە بێت، (انشاء الله) ئێمەش دەبین بە یەکێك لە سەربازەکانی (محەممەی مەهدی) ئامین.

ڕەحمـەتی خـوات لێبێـت ئـەی ئیمـامی بـەڕێز ئـەی موجـاهیدی مـەزن، بەڕاسـتی سەرمەشـقی ڕاسـتگۆیی و پیـاوەتیو ڕەوشـتی چاك بوویت... خودای گـەورە شـادمان بکات بەم یاوەرە بەڕێزە و خۆشەویستە.

## (٨٨)

# کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاری

### ئەو یاوەرەی بە دەستو زوبانی جیهادی ڕێگای خوای کرد

ووشەی جیهاد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە زۆر ماناو واتای هەیەو فرەوانە، تاکو جیهاد بە دڵیش دەگرێتەوە لە ڕێگای نیازێکی پاك بە گوێرەی توانا بۆ خوای گەورە، جیهاد بە زمان لە ڕێگای دەربڕینی ووشەی هەق بە ئاشکراو، جیهاد ماڵ بە ڕێگای بەخشینو، جیهادی گیان بە تێکۆشانو بەرخودانندا.

لێرەدا سەرورەمان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت:-

((المجاهد يجاهد بلسانه وسيفه)) .

واتە:- موجاهید بە شمشێرو زمان جیهاد دەکات.

ئینجا بەڕاستی یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ -خوا لێیان ڕازی بێت-، بە سەروماڵو زمان خۆیان فرۆشبووە خوا بە ویستی خۆیان بەبێئەوەی یەکێك زۆریان لێبکات، وە یەکێك لەم یاوەرە بەڕێزانە، سێیەمینی سێشاعیرانی پێغەمبەری خوا و، قارەمانی گۆڕەپان:- کەعب کوڕی مالیك کوڕی عەمری ئەنصاری خەزرەجی ناسراو بە باوکی عبدالرحمن و عبدالله، ئەم یاوەرە بەڕێزە یەکێکە لەم موسڵمانە پێشەنگە ئەنصاریانەی لە سەرەتا هاتن بۆ ناو ئیسلام، ئەوەبوو بەهۆی شیعرە ناسكو تەڕەکانی توانی بەرگری لە پێغەمبەری خواو هەڵوێستی موسڵمانان بکات بۆ وەڵامدانەوەی بێباوەڕە ملهوڕەکان...

ئەم یاوەرە هەروەك جیهادی بە زمان کرد، هەروەها جیهادی بە دەستیش کرد لە جەنگە دژوارەکان و لەم کاتانەی شمشێرەکان تێکەڵی یەك دەبوونو لەبەر شریقو هۆڕی گوێی مرۆڤی کەڕ دەکرد، ئینجا لێرەدا ئەم دوو سیفەتە بەڕاستی لەم یاوەرە کۆبووینەوەو شاهێدی بۆ دەدەن (المجاهد يجاهد بلسانه وسيفه)...

هەروەها مسوڵمان بوونی کەعب هۆیەکی ماددیو مەعنەوی بوو بۆ ژمارەی موسڵمانان، چونکە ئەم موسڵمانانەی لە دەوری پێغەمبەر ﷺ بوون ژمارەیان زۆر کەم بوو، بەڵام کێشیان تاکو بڵێیت گەورەو قورس بوو، ئەوەبوو یەکەمین پێگەیشتنی کەعبو پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەی پیرۆز بوو.

لێرەدا کەعب خودی خۆی ئەم پێککەیشتنەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

لەگەڵ میللەتەکەم دەرچووین بۆ حەج، بەڕاستی نوێژمان کردو لە ئایین گەیشتین، (بەراء کوڕی مەعرور)مان لەگەڵ بوو گەورەی میللەتەکەمانو لە هەموومان گەورەتر بوو، کاتێك گەیشتینە شاری مەککەی پیرۆز، بەمنی گووت:-

ئەی برازام، بمابنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ).

دەڵێت (ڕۆیشتین پرسیاری پێغەمبەری خوامان ﷺ کرد، ئێمە نەدەماناسی، پێشتر بینیبوومان. گەیشتینە پیاوێکی خەڵکی مەککە پرسیاری پێغەمبەری خوا ﷺ لێکرد گووتی ئایا نایناسن؟

گووتمان:- نەخێر.

گووتی:- ئایا (عەباس کوڕی عبدالمطلب)ی مامی دەناسن؟

گووتی:- گووتمان بەڵێ، دەڵێت:- پێشتر (عەباس)مان دەناسی، کەوا بازرگانی لەگەڵ دەکردین.

پیاوەکە گووتی:- ئەگەر چوونە ناو حەڕەم ئەو پیاوە دانیشتووەوە لەگەڵ عەباس.

دەڵێ:- چووینە ناو حەڕەم عەباس دانیشبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵی دانیشتبوو، سەلاممان کردو پاشان لەگەڵی دانیشتین.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەباسی فەرموو:-

ئەی باوکی (فضل) ئەم دوو پیاوە دەناسی؟

گووتی:- بەڵێ، ئەمە بەراو کوڕی مەعرورە گەورەی میللەتەکی و، ئەمەش کەعبی کوڕی مالیکە.

دەڵێت:- سوێند بە خوا فەرموودەی پێغەمبەرم ﷺ لەیاد ناچێتەوە:- (الشاعر) واتە:- شاعیری...

گووتم:- بەڵێ.

پاشان بەراء پرسیاری مەسەلەیەکی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە.

هەروەها پێکگەیشتنی دووەمی مالیك و هاوڕێکانی لە ئەنصارەکان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ترسناکتر بوو لە پێکگەیشتنی یەکەمین جار، ئەمەش لە تاریکایی شەو بوو بێباوەڕەکان هەموو کات چاریان دەگێڕا بۆ ئەوەی بزانن کێ دەچێت بۆ لای؟! بەڵام غیرەت و ئازایەتی ئەم بڕوادارنە توانیانیان ئەم تۆقە بشکێنن و پێك بگەن).

جارێکیتر یاوەری بەڕێزمان ئەم پێکگەیشتنە پیرۆزو مێژووییەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:- ((پاش ئەوەی چووینەوە بۆ حەج، بەڵێنمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەست لە عەقەبە لە ناوەندی ڕۆژانی (تشریق) پێك بگەین.

دەڵێت:- کاتێك لە حەج تەواو بووین، ئەم شەوەش هات کەوا بەڵێنمان تێیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو، هەروەها (عبدالله‌ی کوڕی عەمری کوڕی حرام باوکی جابر)یشمان لەگەڵ بوو، یەکێك بوو لە گەورەکانمان و پیاوە بەڕێزەکانمان، لەگەڵ خۆمانمان هێنابوو، ئێمە ئەم کارەمان لە بێباوەڕەکانی میللەتەکەمان شاردبۆوە کەوا لەگەڵمان بوون، ئەوەبوو قسەمان لەگەڵ باوکی جابر کردو پێمان گووت:- ئەی باوکی

جابر تۆ یەکێکیت لە گەورە پیاوەکانمان و پیاوە بەڕێزەکانمان، ئێمە دەمانەوێت تۆ ڕزگار کەین لەوەی تۆ لەسەریت بەیانی دەبیت بە سووتەمەنی ئاگر، پاشان بانگمان کرد بۆ سەر ئیسلام، هەواڵمان دایێ بەو بە یەککەیشتنەی لە عەقەبە لەگەڵ پێغەمبەری خوامان ﷺ هەیە، دەڵێت:- موسڵمان بوو لەگەڵ ئێمە عەقەبەی بینی و بوو بە یەکێك لە پێشەنگەکان.

دەڵێت:- ووشترەکانمان خستو ئەمشەوە خەوتین، تاکو سێیەکی شەومان بەڕێکرد ئینجا لەگەڵ ووشترەکانمان ڕۆیشتین بۆ وەعدی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە دزیەوە ڕۆیشتین چۆن قەتێ بە نهێنی دەڕوات، تاکو کۆبووینەوە لە دۆڵێك لە عەقەبە، نوسیبەی کچی کەعب، ام عمارە، یەکێك بوو لە ئافرەتانی تیرەی مازن کوڕی نەججار، اسماء کچی عەمر کوڕی عەدی کوڕی پابتی، یەکێك بوو لە ئافرەتانی تیرەی سەلمە، ئەمەش ام منیع بوو...

دەڵێت:- لە دۆڵەکە کۆبووینەوە چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەکرد، تاکو پێغەمبەر و مامی عەباس کوڕی عبدالمطلب هاتن بۆ لامان کاتێك دانیشتین یەکەم قسەکەر عەباس کوڕی عبدالمطلب بوو و گووتی:-

(ئەی کۆمەڵی خەزرەج-واتە خەزرەج و ئەوس- هەروەك دەزانن موحەممەد لە ئێمەیە، بەڕاستی پاراستوومانە لە میللەتەکەمان، ئەویش لەسەر نەفسی بیروڕای ئێمەیە، ئەمە یەکێکە لە پیاوە سەرفرازەکانی میللەتەکەی و هەڵبژاردەی شارەکەی، بەڕاستی لای ئێوەی هەڵبژاردووەو لە لای ئێمە نامێنێتەوە و دێتە لای ئێوە، ئەگەر ئێوە وا تێڕادەبینن بۆی بە وەفان لەسەر ئەوەی بانگتان دەکات بۆ سەری و، قەدەغەی ئەوانە دەکەن کەوا بە گوێی ناکەن، ئێوە و ئەم پیاوەو بەرگەی ئەم کارە بگرن، ئەگەر ئێوە وا ڕادەبینن ئەم پیاوە دەبەن لەگەڵ خۆتان و ناتوانن بیپارێزن و ڕیسوای دەکەن، ئەوا هەر لە ئێستاوە وازی لێبهێن، ئەمە لە سەرفرازو هەڵبژاردەی میللەتەکەی و شارەکەیەتی).

دەڵێت:- پێمان گووت:- بەڕاستی گوێمان لە قسەکانت بوو، قسەی بکە ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوەی خۆت و خوات حەزی لێدەکەی فەرمانمان پێبدە!!

دەڵێت:- پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کردو، قورئانی خوێندەوەو لە خوا پاڕایەوە و باسی گەورەیی ئیسلامی بۆ کردین، پاشان فەرمووی:-

(موبایەعەتان دەکەم لەسەر ئەوەی ماڵ و منداڵی خۆتانی لێدەپارێزن منیش لێی بپارێزن).

دەڵێت:- براء کوڕی مەعرور دەستی لەناو دەستی پێغەمبەر ناو پاشان گووتی:-

(بەڵێ، سوێند بە خوا بە هەقی ڕەوانە کردوویت، دەتپارێزین وەکو ئەوەی پشتی خۆمان دەپارێزین، موبایەعەمان کردیت ئەی پێغەمبەری خوا ، سوێند بە خوا ئێمە

بیاوی جەنگ‌وشەڕین لە پشتاو پشت بۆمان مایتەوە... دەڵێت:- قسەیان بڕی و(براء) قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا کرد، هیشم کوڕی تیهان گووتی:-

(ئەی پێغەمبەری خوا، لە نێوان ئێمەو جولەکەکان پەتێك هەیە، ئایا ئەگەر ئەم پەتەمان پساند پاشان خودا سەریخستی گەڕایەوە ناو میللەتەکەت و تۆش وازت لە ئێمە هێنا؟

دەڵێت:- پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی بردەوەو پاشان فەرمووی:-

(( بل الدّمُ الدَّمَ و الهدمُ والهدْم، انا مِنْكُمْ وانْتُمْ مِنّـي احارِبُ مَنْ حارَبْتُم واسالِمُ مَنْ سالَمْتُم)).

واتە:- بەڵکو خوێنم خوێنی ئێوەیەو ڕووخانم ڕووخانی ئێوەیە، من لە ئێوەم و ئێوەش لە منن شەڕ لەگەڵ ئەو کەسە دەکەم شەڕتان لەگەڵ بکات، ئاشتیم لەگەڵ ئەو کەسەیە ئاشتیتان لەگەڵ دەکات.

کەعب کوڕی مالك دەڵێت ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- دوازدە پێشەنگ لە ئێوە بۆم بێنە دەرەوە، نۆ لە خەزرەجیان و سێ لە ئەوسیان.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێشەنگەکانی فەرموو:-

ئێوە لەسەر میللەتەکەتان دابینکەرو کەفیلن وەکو کەفالەتی حەواریەکان بۆ عیسای کوڕی مەریەم و، من دابینکەرم لەسەر میللەتەکەم-واتە موسڵمانان-؟

گووتیان:- بەڵێ.

کەعب کوڕی مالك گووتی:- یەکەم کەس دەستی لەناو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نا بەراء کوڕی مەعرور بوو، پاش ئەو میللەتەکەی موبایەعەیان کرد.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- بگەڕێنەوە لای ووشترەکانتان.

عەباس کوڕی عەبادەی کوڕی نضلە بە پێغەمبەری گووت:-

(( سوێند بەو خوای بە هەق ڕەوانەی کردوویت:- ئەگەر حەز دەکەیت بە شمشێرەکانمان دەچینە سەر خەڵکی (منی)؟)).

دەڵێت:- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

(فەرمانم پێتان نەکردووە بەمە بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای ووشترەکانتان).

دەڵێت:- گەڕاینەوە بۆ لای جێگاکانمان، تێیدا خەوتین تاکو بەیانیمان بەسەر داهات.

ئیتر یاوەری قارەمانمان کەعب کوڕی مالك-خوا لێی ڕازی بێت- لەگەڵ یاوەرەکانی‌تر گەڕانەوە مەدینەو ئەم باوردۆخەیان ساز کرد بۆ هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شارەکەیان و بۆ ئەم کۆچە پیرۆزە مەزنە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ پێی پیرۆزی نایە شاری مەدینە برایەتی خستە نێوان کەعبو طەلحەی کوڕی عبیدالله و هەندێك ڕیوایەتی تریش دەڵێن لەگەڵ زوبەیر کوڕی عەوام

کەعب یەکێك بوو لە شاعیرەکانی پێغەمبەر ﷺ کەوا لەم کاتە شاعیرەکانی پێغەمبەری خوا سێ شاعیر بوون لەمانە:-

کەعب لە شیعرەکانی وەسفی جەنگی دەکرد و دەیگووت:- ئەوها دەکەینو واتان لێدەکەین. بەڵام هەرچی حسان بوو عەیبو عاری بەدیار دەخستن، هەرچی کوڕی ڕەواحە بوو ئەنگی پێدەگرتن بەبێباوەڕیان.

شیعرەکانی کەعب کاریگەریەکی گەورەی هەبوو بۆ بەرزکردنەوەی ورەی موجاهیدانو ڕوخانی ورەی بێباوەڕان بەڵام پاش ئەوەی چەند ئایەتێك لە سورەتی (شعراء) دابەزیە سەر شاعیرە بێباوەڕەکان و بڕوادارەکان ئەوەبوو خوای گەورە لێکی جیاکردنەوە کەوا دەفەرمووێت:

﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ أَلَمْ تَرَى أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ ۞ إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ (الشعراء ٢٢٤-٢٢٧)

کەعب کوڕی مالك-خوا لێی ڕازی بێت- پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو گووتی:-

(ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی ئەوەی لەسەر شاعیران خوای گەورە دایبەزاندووە ئەوا دایبەزاندووە)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:-

(( إن المجاهد بسيفه ولسانه، والذي نفسي بيده ترمونهم به نَضْحَ النَبل)).

واتە:- (موجاهید بە شمشێر و زمانی جیهاد دەکات، بەو خوایەی ڕوحی منی بەدەستە شیعر بارانتان کردن وەکو ئەوەی تیر بارانیان کەیت).

جابر-خوا لێی ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەعبی کوڕی مالکی فەرموو-خوا لێی ڕازی بێت- :-

(ما نَسيَ ربّكَ-وَما كانَ ربُك نَسِيًا-بَيتاً قلتَه). واتە:- خودا تۆی لەیاد نەکردووە سوپاسی کردوویت بۆ ئەم شیعرەی گووتووتە خواش شت لەیاد ناکات.

گووتی:- ئەم شیعرە چی‌یە؟

فەرموو:- ئەی ئەبوبەکر بۆی بخوێنەوە-ئەویش گووتی:-

زَعمت سُخَينَةُ ان ستغلبَ ربّها وَلَيُقلبنَ مَغالبُ الغَلاب

واته:- هەر کەسێك جەنگ لەگەڵ خوای گەورە بکات بەڕاستی شکاوەو بەرەو پاش دەگەڕێتەوە:-

﴿ وَاللّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ (یوسف ٢١)

شیعرەکانی کەعبی کوڕی مالك-خوا لێی ڕازی بێت- بە هۆی خۆ گیف کردنەوەو کاری دەروونی تاکو وای لێهاتبوو ترس بخاتە دڵی بێباوەڕەکان، هەروەك ئیبن سیرین دەڵێت:- کەعب دوو دێڕی لە شیعر گووت بووە هۆی موسڵمان بوونی (دەوس) هەروەك دەڵێت:-

| | |
|---|---|
| قَضَينا مِن تُهامَى كُلّ وَتْر | و خَيبر، ثم اغْمدنا السيوفا |
| نخَيِّرها ولو نطقت لَقَالَت | قَواطعُهُن دَوساً او ثقيفا |

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە دەوس گووتیان ئاگاتان لە خۆتان بێت، با ئەوەی بە ثقیف کرا بە ئێوەش نەکرێت هەروەك ئەوەی کەعبی کوڕی مالك بە زمانی جیهادی کردووە، هەروەها بە شمشێرەکەشی جیهادی کردووە، لە جەنگی ئوحد گەورەترین بەشداری کرد ئەوەبوو یازدە برینی سەختی لە لەشی کەوت لە خوێنی خۆی گەوزاو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چەسپا، کاتێك پڕوپاگندە بڵاوەی کرد کەوا پێغەمبەری خوا شەهید کراوە، موسڵمانان باری خەمیان بەسەردا کەوت، کەعبی کوڕی مالك یەکەم کەس بوو پێغەمبەری خوا بە ساغ و سەلامەتی بینیەوە، تاکو خۆی پێنەگیراو هاواری لێهەڵساو گووتی:- ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، مزگێنی ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پێغەمبەر بە خێرایی ئاماژەی بۆ کرد کەوا بێدەنگ بێت، موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر کۆمەڵەیان کردو، پاشان پێغەمبەر قەڵغانەکەی خۆی دایە کەعب و، ئەویش وەریگرت و لەبەری کرد ئەمەش گەورەترین ڕێزلێنان بوو بۆ کەعب.

کاتێك جەنگ تەواو بوو برینەکانی کەعب هێزی لێبڕیبوو، ئەوەبوو سواری وشترەکەیان کردو، زوبەیری کوڕی عەوام جڵەوەکەی بۆ گرت و لە پێشی ڕۆیشت.

بەم جۆرە کەعب بەشداری هەموو جەنگەکانی کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها جەنگی بەدرو تەبوك نەبێت...

ئینجا با لێرەدا هۆی دواکەوتنی کەعبی کوڕی مالك لەم دوو جەنگەدا بۆ خودی خۆی کەعب لێبگەڕێین بزانین چی دەڵێت:-

کەعبی کوڕی مالك دەڵێت:- لە هیچ جەنگێك پێغەمبەری خوا سازی دابێت هەرگیز دوا نەکەوتوومە.

جگە لەوەی لە جەنگی بەدر دواکەوتم، ئەمەش جەنگێك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرچوو مەبەستی کاروانەکانی قوڕەیش بوو، تاکو خوای گەورە ئەوان و

دوژمنەکانی لەسەر کاتێکی نادیار کۆکـردەوە، بەڕاستـی لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ عەقەبەم بینی و، ئەو کاتە پەیمانمان دا لەسەر ئیسلام.

هەروەها مەسەلەی ئەو کاتەی دواکەوتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبوك من هەرگیز وا بەهێز نەبوومەو بۆم ئاسان نەبووە لەم کاتەی دواکەوتم لە موسڵمانان لەم جەنگەدا، سوێند بە خوا هەرگیز بەم جۆرە سوارم بۆ ڕێك نەکەوتووە هەروەك لەم جەنگە بۆم ڕێککەوت.

نـەریتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ وابـوو بڕۆیشـتبا بـۆ هـەر جـەنگێك ئـەوا ئاشـکرای نەدەکردو بە نهێنـی ئەنجامی دەدا، هەرچی ئەم جەنگە بوو، کەوا پێغەمبەری خوا تێیدا جەنگا، لـە گەرمایـەکی زۆر تونـد بـوو، بـەرەنگاری دوژمنێکـی زۆر دەبـۆوە، ئینجـا بـۆ خەڵکی ئاشکرای کرد بۆ ئەوەی خۆیانی بۆ ئامادە بکەن و، بەو شێوەی مەبەستی بوو هـەواڵی دانـێ و، ئـەو موسڵمانانەی شـوێن کـەوتووی پێغەمبـەری خـواش بـوون ﷺ ژمارەیان زۆر بوو، هەروەها هیچ تۆمارکراوێکی سەرژمێریشیان نەبوو بۆ ئەوەی کۆیان بکاتـەوە، کـەم کـەس هـەبوو خـۆی بشـارێتەوە لەبەرئـەوەی گومـانی دەبرد لـێی ئاشـکرا دەبێ و نیگای خوای لەسەر دێتە خوارەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم غەزایەی کرد لـە کاتێك بەروبووم گەیشـتبوو، پێغەمبـەری خـوا ﷺ و موسـڵمانان خۆیـان بـۆ ئامـادەکرد، منیـش هـەوڵ و تەقـەلام دا بـۆ ئـەوەی لەگەڵیان خۆم ئامادە بکەم، گەڕامەوە هیچ شتێکم دابین نەکرد، لە دڵی خۆم گووتم:- من توانام هەیە.

ئینجا بەردەوام بیـرم بۆی دەکردەوە تاکو خەڵکەکە خۆیان ئامادەکرد، پێغەمبـەری خواو ﷺ موسڵمانان ئامادەبوون، منیـش تـا ئـەو کاتـە هیچـم بـۆی ئامـادە نـەکردبوو، دەمگـووت:- ئیمـڕۆ یـاخود ڕۆژێکیتـر دەیانگـەمێ، ئـەوان شـاریان بەجێهێشـت و بەڕێکەوتن گەڕامـەوە هیچ شـتێکم نـەکرد، پاشـان ڕۆیشـتم دووبـارە گەڕامـەوە هیچـم نەکرد، هەر بەم جۆرە خەریك بووم تاکو ئەوان دوورکەوتنەوەو کاتەکە بەسەرچوو، هەوڵم دا خۆم ئامادە بکەم و پێیان بگەم، بەڵام چیم بۆ نەکرا...).

بەم جۆرە کەعب لە مەدینە بەجێماو سوپاش لە ڕێگادا بوو بۆ جەنگ، ئیتـر خـەم و پـەژارە دایگرت و هـەر کـاتێ دەچووە نـاو شـاری مەدینە زیاتر خـەم دایدەگرت، چونکـە تەنها تووشی بە تووشی ئەو کەسانە دەبوو کەوا تاوانبـار بوون بە دووڕوویـی و نیفـاق یاخود پاساو بوون لە هەژاران و بێهێزان.

هەروەك سیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ کەعبی لەیاد نەبوو تەنها پاش ئەوە نەبێت کـەوا گەیشـتە تـەبوك، بـەو یاوەرانـەی لـە دەوری دانیشـتبوون پێیـانی گـووت:- کـەعبی کوڕی مالك چی بەسەر هات؟

پیاوێك له بەنی سەلەمە بە پەلە بە وەڵام هاتو گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا، دەوڵەمەندی و فیزو شانازی نەیهێشت لە ماڵ بێتە دەرەوە.

معاذ کوڕی جەبەل گووتی:- خراپت گووت، سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ، لە چاکە زیاتر هیچی ترمان لێ ی نەبیستووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بێ‌دەنگ بوو....

پاشان کەعب گوێی لێبوو پێغەمبەر بەرێکەوتووە لە تەبوك‌و دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە خەمی زیاد بوو وترس‌و پەژارە دایگرت، ئەوەبوو لەگەڵ دەروونی خۆی دەدوا ڕێگایەك ببینێتەوە خۆی لە تووڕەیی پێغەمبەر ﷺ ڕزگار بکات، ئایا درۆ بکات؟ حاشا بۆ کەعب پاش ئەوەی بوو بە موسڵمان. کاتێك کاتی گەیشتنی پێغەمبەر هات شتی نادروست لە دڵی کەعب هەڵقەناو،بڕیاری‌دا تەنها ڕاستیەکەی بە پێغەمبەر بڵێت.

* * *

پێغەمبەر ﷺ، بەرێزی گەیشتەوە مەدینەو، خەڵکێکی زۆر لە دەورەی کۆبوونەوە، هەروەك نەریتی بەردەوامی دوو ڕکات نوێژی لە مزگەوت کرد، پاشان لەگەڵ خەڵکەکە دانیشت، ئینجا خاوەن پاساوەکان دەهاتنە لای‌و خۆیان دەپەڕاندەو سوێندیان دەخوارد، ئەمانەش زیاتر لە هەشتا پیاو بوون، پێغەمبەریش بە گوێرەی قسەکانیان لێ ی بووردن‌و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن‌و، موبایەعەی کردن‌و، نهێنیەکانیشی عەواڵەی زانای نهێنی کردن.

کەعبی کوڕی مالك هاتە لای‌و ترس دایگرتبوو هەروەکو بڵێیت پێیەکانی لە دوای خۆی ڕابکێشێت، کاتێك سەلامی لە پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر ﷺ بە زەردەخەنەیەکی تووڕەییەوە بە کەعبی گووت:- وەرە.

کەعب لێ ی نزیك بۆوە تاکو لەژێر دەستی دانیشت.

پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو:- چی بەدوای خستی؟ ئایا وڵاخت پەیدا نەکرد؟

کەعب وەڵامی دایەوەو گووتی:- بەڵێ، سوێند بە خوا ئەگەر بێجگە لە تۆ لەلای یەکێکی‌تر دانیشتبام لە پیاوی دونیا دەتبینی بە پاساوێك خۆم دەپەڕاندەوەو، گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد، بەڵام سوێند بە خوا من بەڕاستی نازانم ئەگەر بە قسەیەکی درۆ قسەت لەگەڵ بکەم پێم ڕازی بیت، بەڵام دوور نیە خوا لێم ئاشکرا بکات، وە ئەگەر قسەی ڕاستیش بکەم تۆ لێم تووڕە دەبیت ئینجا تکا کارم خودا لێم ببورێ. نەخێر سوێند بە خوا پاساوم نیە، سوێند بە خوا هیچ کاتێك لەم کاتەی دواکەوتم وا بەهێزتر نەبوومە و بەم جۆرە بۆم ئاسان نەبووە.

پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردو فەرمووی:- هەرچی ئەمەیە ڕاست دەکا... پاشان فەرمووی:- هەڵسە تاکو خوا فەرمانت لەسەر دەکات؟

بەم جۆرە کەعب هەڵساو ڕۆیشتو بە ڕاستی ویژدانی خۆی مورتاح کرد بە هۆی ڕاستگۆیی و دڵسۆزیەکەی.

کۆمەڵێك هاتنە پێشی و گازاندەو ڕەخنەیان لێگرت بە هۆی ئەم هەڵوێستەی نواندی، ئەوەیان بە یاد هێنایەوە بڵێت لە دوای ئەم گوناهە هیچ گوناهێکیتر ناکەمو، دەتوانی بچیەوە لای پێغەمبەر و داوای لێبووردنی لێبکەیتو وەکو ئەوانیتر پاساوی بۆ بهێنیتەوەو، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکات، کەعب دەڵێت:- ( سوێند بە خوا ئەوەندە هەوڵیان لەگەڵدام ئەوەندەی نەمابوو بگەڕێمەوەو درۆی بە خۆم بکەم)، بەڵام نەمکرد.

پاشان کەعب پرسیاری لە خەڵك کردو گووتی:- ئایا هیچ کەسیتر وەکو منی بەسەر هاتووە؟

پێیان گووت:- بەڵێ، دوو پیاو وەکو تۆیان گووتووە، ئەمانەش (مرارة کوڕی الربیع العمری‌و، هلال کوڕی امیة الواقفی).

کەعب دەڵێت:- ئەم دوو پیاوچاکەیان بۆ باس کردم کەوا جەنگی بەدریشیان بینیوەو سەرمەشق بوونە، کاتێك ئەمەیان بۆ باس کردم ڕۆیشتم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد قسە لەگەڵ ئەم سێ‌کەسە نەکرێت، خەڵك لێیان دوور کەوتنەوەو، مرارة و هلال لەماڵەوە دانیشتنو دەگریان، هەردووکیان بەساڵاچوو بوون، بەڵام کەعبی کوڕی مالك گەنجێکی تەڕ بوو، دەچوو نوێژی دەکرد لەگەڵ موسڵمانان، لە بازاڕەکان دەسوڕایەوەو،کەس قسەی لەگەڵ نەدەکرد، تووشی پێغەمبەر دەبوو لە دانیشتنەکان سەلامی لێدەکرد هەر ئەوەتە و ئەوەتە لێوەکانی دەجوڵایەوە بۆ وەڵامدانەوەی سەلام، پاشان کەعب لە نزیك پێغەمبەر نوێژی دەکرد تیچاوێکی دەدایێ، کاتێ کەعب بە نوێژ خەریك دەبوو پێغەمبەر تەماشای دەکرد، کاتێك کەعب ئاوڕی لێ دەدایەوە پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەردەگێڕا.

ئەم کارەساتە بەسەر کەعبدا ماوەی کێشاو، چەند ڕۆژێکی بەسەردا چوو، زەوی بەسەردا تەسك بۆوە، چووە ماڵی کوڕە مامی:- ابی قتادة، کەوا لە هەموو خەڵك زیاتر خۆشی دەویست، کەعب سەلامی لێکرد، ابو قتادة وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە، دووبارە کەعب پرسیارەکەی لێکردەوە، ابو قتادة بێ‌دەنگ بوو دیسان کەعب گەڕایەوە پرسیارەکەی لێکردەوەو ئیلحاحی لێکرد، ابو قتادة لەمەی زیاتر پێ‌نەگووت واتە گووتی:- اللهو رسوله أعلم... واتە:- خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن.

لێرەدا کەعب چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسك‌و، دووبارە خەمو پەژارە ڕووی تێکردەوە!.

ڕۆژێکیان کەعب لە بازاڕی مەدینە دەسوڕایەوە، پیاوێکی نبطی لە ئەنباطەکانی شام هەندێك خواردنی لەگەڵ خۆی هێنابوو بیفرۆشێتەوە لە مەدینە، بە خەڵکی دەگووت:- کێ (کەعب کوڕی مالك)م نیشان دەدات؟

خەڵك کەعبیان پێنیشان دا، هاتە لای و نامەی پاشای غەسانی لە پارچەیەك هەریر پێدا، کەعب نامەکەی کردەوە خوێندیەوە، ئەمەی تیابوو( اما بعد، بەڕاستی پێم گەیشتووە گەورەکەت خراپەی لەگەڵ کردوویت، تۆ شایەنی ئەوە نیت خوا لە شوێنی ڕیسوات دابنێت، وەرە لای ئێمە بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەین...).

کەعب زیاتر خەم دایگرت و گووتی:- ئەمەش هەر خۆی لە خۆی بەڵایەکە، بە خێرایی ڕۆیشت کاغەزەکەی خستە ناو ئاگر.

ڕۆژگارێکی بەسەرداچوو تاکو گەیشتە چل ڕۆژ، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ نێردراوێکی لە لایەن خۆی ڕەوانەی لای سێ دواکەوتووەکان کرد کەوا دوورکەونەوە لە خێزانەکانیان، نێردراوێ هاتە لای کەعب و پێی گووت:- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێدەکات لە خێزانەکەت دوور بکەویتەوە کەعب گووتی:- طەلاقی بدەم چیبکەم؟ ئەویش گووتی:- نەخێر بەڵکو لێی جیابەوە لێی نزیك مەبەوە، کەعب بە خێزانەکەی گووت:- بڕۆوە ماڵەوە لە لایان بمێنەوە تاکو خوای گەورە فەرمانمان لەسەر دەکات لەم کارە.

خێزانی هەلال کوڕی امیة هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گووت:- ئەی پێغەمبەری خوا هەلال کوڕی امیة پیاوێکی پیر و پەککەوتووە خزمەتکاری نیە! ئایا ڕێگا دەدەی خزمەتی بکەم؟

ئەویش فەرمووی:- نەخێر، بەڵام لێت نزیك نەبێتەوە.

ئافرەتەکە گووتی:- ئەم پیاوە سوێند بە خوا هیچ جوڵەی تیا نەماوە شتێکی کەم نەبێت، سوێند بە خوا تاکو ئێستا دەگریێ لەم ڕۆژەی ئەم کارەی کردووە!!

لێرەدا هەندێك لە خزم و کەس وکارەکانی کەعب بە کەعبیان گووت:- بەڵکو پێغەمبەری خوا ڕێگا بە خێزانەکەت بدات، هەروەك ڕێگای بە هەلال کوڕی امیة دا بۆ ئەوەی خزمەتی بکات؟

کەعب گووتی:- سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ڕێگا نادات، ئەی چی بڵێم ئەگەر داوای ڕێگا پێدانم لێی کرد منیش پیاوێکی گەنجم؟

ڕۆژگار بەسەرچوو تاکو گەیشە پەنجا ڕۆژ، کەعب نوێژی بەیانی کرد لە ماڵەوەی کەوا لە شوێنێکی بڵند بوو، لە سەرباری خۆدا دانیشتەوە هەروەك خوا لە قورئان باسیان دەکات:-

﴿ وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمْ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لاَ مَلْجَأَ مِنْ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ (التوبة ١١٨)

گوێی لە دەنگێکی بەرز بوو گووتی:- ئەی کەعب، مزگێنی!

کەعب سوجدەی شوکری بۆ خوا برد، زانی رزگاربوونیان قەبوڵ بوو، یەکێك لە موسڵمانەکان بە سواری ئەسپێکەوە بەخێرایی مزگێنی بۆ کەعب هێنا کەعب جلەکانی لەبەرکردەوەو بەخشیە ئەم مزگێنیدەرە، لەبەرئەوەی لەم کاتەدا تەنها ئەمەی لەلا بوون دوو جلی بە ڕاسپاردە وەرگرت و لەبەریکرد، چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کۆمەڵ لە دوای کۆمەڵ دەهاتنە لای و پیرۆزباییان لێدەکرد بە هۆی ئەم لێخۆشبوونەی خوای گەورە بۆی دایبەزاند.

کەعب چووە مزگەوت بۆ لای پێغەمبەر، پێغەمبەر ﷺ نێوچەوانی دەبریسکایەوە لە خۆشیان و پێی فەرموو:-

(ابشر بخير يوم مرّ عليك منذ ولدتك امك)

واتە:- چاکترین مزگێنیت بدەمێ کەوا ئیمڕۆیە، لەم رۆژەی لە دایك بوویت.

کەعب پێی گووت:- ئایا ئەمە لە لای پێغەمبەری خوایە ﷺ یان ئەمە لە لای خوایە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- نەخێر، بەڵکو لەلایەن خوایە.

کەعب گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا، بۆ ئەم تەوبەم لە ماڵەکەم بێمە دەرەوە و ماڵەکەم بکەم بە صەدەقە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:- هەندێك ماڵت بهێڵەوە، ئەمە بۆ تۆ باشترە.

کەعب گووتی:- من ئەم بەشە دەهێڵمەوە کەوا لە خەیبەر بە دەستم کەوتبوو.

پاشان کەعب گووتی:- (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە منی ڕزگار کردووە بە هۆی ڕاستگۆیییەکەم، تەوبەکەم ئەوە بێت قسە نەکەم تەنها ڕاستی نەبێت). بەم جۆرە کەعب بۆ تەوبەکەی بەوەفا بوو تاقیبکاتەوە، زمانی بۆ لای درۆ هەرگیز نەدواوە، وە ئەمەی لێ دەگێڕنەوە گووتیەتی:- ( سوێند بە خوا نەمزانیوە موسڵمانێك خوا تاپبکاتەوە بە هۆی ڕاستگۆییەکەی لەم ڕۆژەی ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد بەم جۆرە تاقیکردمەوە، لەم ڕۆژەی ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد تاکو ئەمڕۆ درۆم نەکردووەو، من لە خوا ئەپاڕێمەوە بمپارێزێت لەوەندەی لە ژیان مایمەوە).

بەم جۆرە خوا ئەم ئایەتانەی دەرهەق بە کەعب و دوو هاوڕێکەی دابەزاند کەوا دەفەرموێت:-

﴿ لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ۝ وَعَلَى

الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لاَ مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ۞ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ﴾ (التوبة ١١٧-١١٩)

كەعبی كوڕی مالك زۆر كەیف خۆش بوو لەبەرئەوەی خوای گەورە موەفەقی كردو هیدایەتی دا بۆ ڕاسگۆیی هەروەك دەڵێت:-(سوێند بە خوا هەرگیز نیعمەتی وای لەگەڵ نەكردووە، پاش ئەوەی هیدایەتی دام بۆ ئیسلام مەزنتر بێت لە ڕاستگۆییم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هاتوو درۆم كردبا وەكو ئەوانەی درۆیان كرد، وەكو ئەوان بە هیلاك دەچووم).

كەعبی شاعیر سوارچاك و ڕاستگۆ، شارەزایی پەیداكردنی لە ئایین لەیاد نەكردو ئەوەبوو هەشتا فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەت كردو پاراستنی و لەبەری كردن، ڕایگەیاند و كاری پێكرد، ئەوەبوو منداڵەكانی عبدالله‌و عبدالرحمن و محمدو عبیدالله فەرموودەیان لە باوكیان وەرگرت... یەكێك لەم فەرموودانەی كەوا دڵی موسڵمانان خۆش دەكاو دەفەرموێت:-

((انّ ارواح الشهداء حواصل طير خضر تعلق (اي تأكل) من ثمار الجنّة)).

واتە:- ڕۆحی شەهیدەكان لەناو سكی باڵندەی كەسك دان لە بەرووبوومی بەهەشت بەخۆن.

یەكێك لەو كارەساتانەی بەسەر كەعب داهات ئەوەبوو چاوەكانی لەدەست دا، بەڕاستی ئەمەش كارەساتێكی گەورە بوو بۆ كەعب (انشاء الله) خوای گەورە دوو چاوی ساغی پێدەدا لە بەهەشت بە هۆی ئەم ئارامەی گرتی لە پێناوی خوا...

كەعبی كوڕی مالك لە زەمانی موعاویە ساڵی پەنجا یان پەنجاو سێ لە تەمەنی حەفتاو حەفت ساڵی لە مەدینە كۆچی دوایی كردو بە پاكی و بێگەردی گەڕایەوە لای پەروەردگار.

ئینجا لە كۆتاییدا لە خوا دەپاڕێینەوە خوا ئەم كارەمان بە جیهاد بۆ بژمێرێ و لە گوناهەكانمان خۆش بێت...

ئازایەتی و غیرەتێكمان پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی پێی بەرگری لە ئیسلام بكەین، بە موجاهید لە قەڵەممان بدات آمین.



# ثابتی کوڕی قەیسی ئەنصاری

**نەزانراوە وەسیەتی کەسێك وەگیرا بێت پاش مردنی، بێجگە لە وەسیەتەکەی ثابت کوڕی قەیس نەبێت**

# ثابتـــی کوڕی قەیســی ئەنصاری

## نەزانراوە وەسیەتی کەسێک وەگیـرا بێت پاش مردنی، بێجگـە لە وەسـیەتەکەی ثابت کوڕی قەیس نەبێت

یاوەرێك لە یاوەرە بەڕێزو لەخواترسەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لـە گـەورە پیاوە ناودارەکـانی خـەزرەج و، ئەسـتێرەیەك لــە ئەسـتێرە پڕشـنگدارە بێوێنـەکانی یەثریب ثابتی کوڕی قەیسی ئەنصاری‌یە.

لەگەڵ ئەمەشـدا پیاوێکی بەهرەمەندو بیرتیـژو، زمان پـاڵاوو قسـەڕەوان و دەنـگ پیاوانە بوو، ئەگەر قسەی کردبا قسـەی قسەکەرەکانی هەر هەمووی دەبڕی‌و خەڵکەکە تەماشای ئەویان دەکردو، ئەگەر ووتاری بدابا گوێ بیستەکان سەریان سووڕ دەما.

ئەو یاوەرە یەکێکە لە بڕوادراە سەرەتاکان لە یەثریب، هەر کە گوێی لە بانگهێژی مەککەیی گەنج موصعەبی کوڕی عومەیر بوو قورئانی بە دەنگە پڕ سۆزو خرۆشـەکەی دەخوێند تاکو وای لێهات قورئان گوێیەکانی بەند بکات بە هۆی ئەم تام‌و چێـژو، ڕوون کردنەوەی تیا بوو،بەم جۆرە بیرو هۆشی بۆ ئەم ڕێگا ڕاست‌و پڕ یاسایە مل کەچ بوو...

خوای گەورە سینگی جۆش دا بۆ بڕواهێنان‌و پلەوپایەی زیاتر بەرز کردەوەو یادی بەخێری لەژێر ئاڵای شەکاوەی پێغەمبەری ئیسلام چەسپاند.

کاتێك پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کۆچی بـەخێری کـرد بـۆ مەدینـە ثـابتی کـوڕی قـەیس لەگـەڵ کۆمـەڵێکی گـەورە لـە سـوراچاکەکانی هۆزەکـەی وەسـتان لـە پێشـوازی پێغەمبـەرمان و بە گـەورەترین پێشـوازی ڕێزیـان لـێ‌نا، بـە جوانتـرین بـەخێرهاتن بـەخێرهاتنی خـۆی و هاوڕێیـە خۆشەویسـتەکەیان کـرد، ئـەوەبوو لـەژێر دەسـتی ووتارێکی بەنرخی‌دا کەوا سـەرەتاکە بـە سـوپاس‌و سـتایشی خـوای گـەورە، درووردو سـەلام بۆ سەر پێغەمبەرەکەی دەستی پێ‌کرد....

بەم ووشە دڵسۆزانەش کۆتایی پێ‌هێنا کەوا دەیگووت:-

((ئێمە پەیمانت دەدەینێ (ئەی پێغەمبەری خوا) لەسەر ئەوەی بتپارێزین هـەروەك ئەوەی خۆمان‌و منداڵ‌و ئافرەتەکانمان دەپارێزین، ئینجا چیمان بۆ هەیە؟))

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- الجنـّة ...

واتە:- بەهەشتان بۆ هەیە..

هەرکە ووشـەی بەهەشـت (الجنـّة) بـەرگوێی کۆمەڵەکـە کـەوت وایـان لێـهات دەم‌و چاویـان بگەشـێتەوەو زەردەخەنـەی خۆشـی بـەدڵیان دا بێـت موچڕکـی بەختـەوەری بـە لەشیان دابێت‌و گووتیان:-

رضـينا يا رسول الله .... رضـينا يا رسول الله ....

واته:-. ئەی پێغەمبەری خوا ڕازی بووین ... ئەی پێغەمبەری خوا ڕازی بووین...
ئیتر لەم ڕۆژەوە ثابتی کوڕی قەیس بوو بە ووتاربێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەك حەسانی کوڕی ثابت بوو بە شاعیری..
وای لێهات ئەگەر نێردراوانی عەرەبەکان بهاتبایە لای پێشبڕکێیان لەگەڵ کردبا و شانازیان بە زمان ڕەوانو قسەزانەکانی خۆیان کردبا لە شاعیران و ووتاربێژان، ئاماژەی بۆ ثابتی کوڕی قەیس دەکرد لە ووتاردەرەکانو حەسانی کوڕی ثابت دەکرد لە شاعیران بۆ ئەوەی شان بە شانیان بوەستن.

* * *

ثابتی کوڕی قەیس خوا لێی ڕازی بێت- هەروەکو لێی ڕازی بوو بڕواداریکی تاکو بڵێیت ئیمان بەهێزو پاكو لەخواترس بوو بە لە خواترسانێکی ڕاستو بێوێنە، زۆر زۆر لە خوا بەترساو، زۆر بە (حذر) و بە ئاگا بوو لەوەی خوای گەورە پێی تووڕە دەبێت.
ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ ثابت دەبینێ خەمبارەو ترسو لەرز گرتوویەتی، پێی فەرموو:- چیتە ئەی باوکی موحەممەد؟!
گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا لەوە دەترسم بە هیلاك چووبم...
فەرمووی:- لەبەرچی؟!
گووتی:- خوای گەورە قەدەغەی کردووین لەسەر ئەوەی حەز بکەین ستایشی بکەین و ئێمەش ئەمان کردووەو، دەمبینیەوە حەز لە ستایش دەکەم...
وە قەدەغەمان دەکات لەسەر فیزلێدانو، دەمبینیمەوە حەز بەوەش بکەم ڕام لە خۆم بێت...
پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دڵی دەدایەوەو هێمنی دەکردەوە و ترسی لە لەشی دەردەکرد تاکو پێی فەرموو:-
ئەی ثابت، ئایا ڕازی نابیت بە سوپاسگوزاری بژیت...
وە بە شەهیدی بکوژرێیت.
وە بچیتە بەهەشت...
دەموچاوی ثابت بەم مزگێنیە گەشایەوەو گووتی:-
بَلَى يا رَسُول الله.... بَلَى يا رَسُول الله...
واتە:- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا... بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا...
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-
(( إنَّ لَـكَ ذلِكَ... ))
واتە:- ئەمە بۆ تۆیە...

* * *

کاتێك ئایەتی پیرۆزی خوای گەورە دابەزی:

﴿ یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلاَ تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تَشْعُرُونَ ﴾ (الحجرات ٢)

ثابتی کوڕی قەیس -خوا لێی ڕازی بێت- لە کۆڕو کۆبوونەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەپاراست لەگەڵ ئەوەی بێ ئەندازە خۆشی دەویست و، شەیدای پێغەمبەرەکەی بوو، بە جۆرە پاش جێبەجێکردنی نوێژە فەرزەکان بە کۆمەڵ دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەواڵی ئەم یاوەرەی پرسی و فەرمووی:-

کێ هەیە هەواڵی ئەمەم بۆ بهێنێ؟

پیاوێك لە ئەنصارەکان گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا من...

ئەم پیاوە ڕۆیشت بۆ لای و لە ماڵەکەی خۆی بە خەمباری و کزی بینیەوە پێی گووت:- ئەی باوکی موحەممەد چیتە؟

گووتی:- خراپ!!

پێی گووت:- چی بووە؟!

گووتی:- تۆ دەزانیت من پیاوێکم دەنگم بەرزو زاڵە، زۆرجاران دەنگم بەرزتر دەبێت لەسەر دەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەك دەزانی ئەوەی لە قورئان دابەزیوە، بەڕاستی من وادەزانم کردەوەکانم بەتاڵ بووەو من لە دۆزەخیەکانم...

پیاوەکە گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەواڵی ئەوەی پێدا کە بینیوویەتی و گوێی لێبووە، ئەویش بە پیاوەکەی فەرموو:-

(( إِذْهَبْ إِلَیهِ وَ قُلْ لَهُ:- لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّار، وَلَكِنَّكَ مِنْ أَهْلِ الجنَّةِ)).

واتە:- بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ:- تۆ لە دۆزەخی نیت و، بەڵکو لە بەهەشتیەکانیت.

بەڕاستی ئەمە مزگێنییەکی یەکجار گەورەیە بۆ ثابت بۆ ئەوەی بە درێژایی ژیانی چاوەڕوانی خێری لێبکرێت.

ثابتی کوڕی قەیس -خوا لێی ڕازی بێت- هەموو دیمانەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بینی تەنها جەنگی بەدر نەبێت، بۆ گەڕان بەدوای ئەو شەهادەتەی پێغەمبەر مزگێنی پێدابوو خۆی دەهاوێشتە ناو گەرمەی جەنگەوە، بەڵام هەموو جارێکیان کاتوساتی ئەم بەختەوەرییەی ئەدەمات و هەرچەندە لە زۆربەی جارەکان بە ئەندازەی موویەك لێی دوور ئەدەکەوتەوە.

تاکو جەنگی هەڵگەڕاوەکان ڕوویدا لە نێوان موسڵمانان و موسەیلەمەی درۆزن لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق -خوا لێی ڕازی بێت- .

لەم کاتەدا ثابتی کوڕی قەیس ئەمیری موجاهیدە ئەنصارەکان بوو، سالم خزمەتکاری (مَوْلَى) ابو حذیفة ئەمیر بوو لەسەر موجاهیدە موهاجیرەکان، خالیدی

کوڕی وەلیـد سـەرکردەی گشـتی سـووپاکە بـوو لـە ئەنصـارو موهاجیـرو خـەڵکی دەشتەکان...

لـە سەرەتای جەنگەکـە هـێزو سـەرکەوتن بـەلای موسـەیلەمە بـوو نـەوەکو بەسـەر سوپای موسڵمانان، تاکو وای لێهات گەماڕۆی خیوەتی خالیدی سەرکردەی موسڵمانان بدەن‌و، هـەوڵی کوشـتنی خـێزانی خـالید (أم تمیـم) بـدەن‌و، کندمرکـانی خیوەتەکـەیان پساندو خیوەتەکەیان هەپروون بە هەپرووون کرد.

ثابتی کوڕی قەیس لەم ڕۆژگارەدا هەستی بە شڵەژانی موسڵمانان کرد دڵی پڕ بوو لە ژان‌و خەم، زیاتر خەم دایگرت، کاتێك بینی موسڵمانان تانەو تەشەر لە یەکتر دەدەن ئەو ئەویتر تاوانبار دەکات...

خەڵکی شارەکان تانەیان لە خەڵکی بیابان‌و گوندەکان دەدا بە ترسنۆکی‌و، خەڵکی دەشت‌و بیابەنەکانیش باسی خەڵکی شارەکانیان دەکرد کەوا نازانن جەنگ بکەن‌و هونەری جەنگیان نیە...

لەم کاتەدا ثابتی کوڕی قەیس جەستەی خۆی بۆندار کرد بەم بۆنەی لە مردوو دەدرێت‌و کفنی لە خۆیدا و وەستا لەبەردەمی ئامادەبووان‌و گووتی:-

ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئێمە بەم جۆرە جیهادمان نەکردووە لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ.

بەڕاستی ئێوە خراپ دوژمنتان بەخۆ فێرکردو توانیان دەستتان بۆ بهێنن...

بەڕاستی ئێوە خراپ نەفسی خۆتان وا لێکرد ڕیسوا بن بۆیان...

پاشان ڕووی خۆی لە ئاسمان کردو گووتی:-

پەروەردگارا من خۆم بەبێ‌تاوان دەزانم لەوەی ئەم هاوبەش پەیداکەرانە هێناویانە (واتە موسەیلەمەو کۆمەڵەکەی) وە من خۆم بەبێ‌تاوان دەزانم لەم شتانەی ئەمانەش دەیکەن(واتە موسڵمانان ).

پاشان شاڵاوی برد وەك شاڵاوی شێر شان بە شانی هاوڕێیە گیان لەسەر دەستەکانی:- نموونەی بەڕائی کوڕی مالیکی ئەنصاری‌و... زەیدی کوڕی خەتتاب برای ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەطاب و .. سالم خزمەتکاری أبو حوذەیفەو... زۆر لە بڕوادارە دڵسۆزە سەرەتاکان...

بەم جۆرە بەشداریەکی یەکجار مەزنیان کرد دڵی موسڵمانانیان پڕ کرد لە ئازایەتی‌و وورە، دڵە لەرزیوەکانی هاوبەش پەیداکەرانیشیان پڕکرد لەترس‌و بیم...

ئیتر بەردەوام لە هەموو لایەك شاڵاوی دەبرد، بە هەموو جۆرە چەکێك لە دوژمنی دەدا تاکو برینەکانی هێزی لێبڕی‌و، لاشەی پیرۆزی خوێناوی ڕاکشا لەسەر گۆڕەپانی جەنگ‌و چاوی گەش بۆوە بەوەی خودا بۆی نووسیبوو لە شەهادەت‌و بەوەی

پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێدابوو، سینگی دامرکایەوە خەمی ڕەویەوە بەم سەرکەوتنەی موسڵمانان بە دەستیان هێنا.

ثابت زرێیەکی بە نرخی لەبەر بوو، پیاوێك لە موسڵمانان بەلایدا تێپەڕی و لەبەری کردەوە و بۆخۆی برد.

پاش ئەوەی شەوێك بەسەر شەهیدبوونیدا تێپەڕی، پیاوێك لە موسڵمانان لە خەونیدا بینی ثابت با پیاوەکەی گووت:-

من (ثابتی کوڕی قەیس)م، ئایا دەمناسی؟

گووتی:- بەڵێ.

بە پیاوەکەی گووت:- من بە وەسیەتێك وەسیەتت دەکەم، ئاگادار بە لەوەی بڵێیت ئەمە خەونە و لە یادی بکەیت..

من دوێنێکە لەم کاتەی کوژرام پیاوێك لە موسڵمانان بەلامدا تێپەڕی و شێوەی بەم جۆرەو بەم جۆرەیە، زرێیەکەی بردم و بەرەو خێوەتەکەی ڕۆیشت لە دووری سەربازگەو لە فلان شوێن و، لە ژێر مەنجەڵێك داینا و، کورتانێکی لەسەر مەنجەڵەکە دانا، بڕۆ لای خالیدی کوڕی وەلید و، پێی بڵێ:- بنێرێتە لای ئەم پیاوە و زرێیەکەی لێ بسەنێتەوە تاکو ئێستا لە شوێنی خۆیەتی.

وەسیەتێکی تریشت دەکەم، ئاگادار بە لەوەی بڵێیت ئەمە خەونە و لە یادی بکەیت...

بە خالید بڵێ:-

ئەگەر ڕۆیشتیە لای خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە پێی بڵێت :-

هەندێك قەرز لەسەر (ثابتی کوڕی قەیس) هەیە و ئەمە و ئەمەیە، هەروەها فلان و فلان لە بەندەکانی ئازادن، قەرزەکانم بۆ بداتەوە و دوو بەندەکەشم بۆ ئازاد بکات.

پیاوەکە لە خەو هەڵسا و، چووە لای خالیدی کوڕی وەلید ئەمەی بینی بووی و گوێی لێبوو هەواڵی پێدا...

خالید یەکێکی ڕەوانە کرد بۆ هێنانەوەی زرێیەکە لە لای ئەو کەسەی بردبووی و لە شوێنەکەی خۆی بینیەوە و لەگەڵ خۆی هێنایەوە هەروەکو خۆی بوو..

کاتێك خالید گەڕایەوە ئەمەی بۆ ئەبوبەکر-خوا لێی ڕازی بێت- باسکرد بەوەی بەسەر(ثابتی کوڕی قەیس) دا هاتووە و وەسیەتەکانی، ئەبوبەکریش وەسیەتەکەی بەڕاست دانا...

نەزانراوە وەسیەتی کەسێك وەرگیرا بێت لە پاش مردنی بێجگە لە وەسیەتی ئەم نەبێت.

خوای گەورە لە یاوەری لەخواترس و شەهید (ثابتی کوڕی قەیس) ڕازی بێت، بەهەشتی هەرە بەرز جێگای بێت و لە ئێمەی گوناهباریش خۆش بێت بە دیداری ئەم خۆشەویستانەی شادمان بکات...

(٩٠)

# عبداللەی کوڕی جەحش

## یاوەرێک ماڵو گیانی خۆی بەخوا فرۆشت

ئەو یاوەرەی ئێستا دێینە سەر باسیو قسەی لەسەر دەکەین، یەکێکە لە یاوەرە سەرەتا یەکەمەکانی ئیسلام و، پەیوەندی خزمایەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبەستەوە.

ئەم بەڕێزە کوڕە پلکی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەبەرئەوەی دایکی (امیة کچی عبدالمطلب)ەو پلکی پێغەمبەرمانە ﷺ

هەروەها کوڕە خەزوری پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەبەرئەوەی خوشکی زەینەب کچی جەحشی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووەو یەکێك لە دایکانی بڕواداران، ئەم یاوەرە یەکەم کەس بوو ئاڵای ئیسلامی درا دەستو، پاش ئەمە یەکەم کەس بوو بانگ کرا بە ئەمیری بڕواداران.

ئەم یاوەرە بەڕێزەش عبداللەی کوڕی جەحشی ئەسەدی بوو .

عبداللەی کوڕی جەحش پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێتە ماڵی ئەرقەم موسڵمان بوو لەبەرئەوە بە موسڵمانە سەرەتاکان دەژمێردرێت.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕێگای یاوەرەکانی دا بە کۆچ کردنیان بۆ مەدینە، بۆ پاراستنی ئایینەکەیان لە ئازاری قوڕەیش، (عبداللەی کوڕی جەحش) دووەم کۆچ کردوو بوو کەوا کەس پێشی نەدەکەوت لەم گەورەییە تەنها باوکی (سلمة) نەبێت.

لەبەرئەوەی کۆچ کردنیشی بۆ خواو، بەجێهێشتنی کەسوکارو نیشتنمان لە پێناوی خوا کارێکی نوێ نەبوو سەبارەت بە (عبداللەی کوڕی جەحش)، چونکە لەگەڵ هەندێك خزمی پێش ئەوکاتە کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە.

بەڵام کۆچکردنی ئەم جارەی گەورەترو فراوەنتر بوو و، کەسوکارو خزمەکانیشی لەگەڵی کۆچیان کردبوو لەگەڵ هەموو ئەوەی باوکی بە پیاوو ئافرەتو بە گەنجو پیرو منداڵەوە، بەڕاستی ماڵی ئەم پیاوە ماڵی ئیسلام و هۆزەکەی هۆزی ئیمان بوو.

هەر لەم ساتەی لە مەککە جیابوونەوە، ئەوەبوو ماڵو خانوویان بەبێخاوەنو بەبێ کەسی مایەوە، دەرگای ماڵەکانیان با ئەم بەرو ئەوبەری پێدەکردو، هەروەکو بڵێیت ئاوەدانی تیا نەبووەو ئادەمیزادی تیا نەژیاوە.

ئەوەندەی پێنەچوو لەسەر کۆچ کردنی عبداللەو هاوڕێکانی ئەوەبوو گەورەکانی قوڕەیش سوڕانەوە لەسەر کۆڵانو گەڕەکەکانی مەککە بۆ ئەوەی بزانن کێ لە موسڵمانان کۆچی کردووەو کامەیان ماوەتەوە، ئەبوجەهلو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیان لەگەڵ بوو، عوتبە تەماشای ماڵی کوڕی جەحشی کرد - خوا لێی ڕازی بێت - بینی با دەرگاکانی

دەهێنی و دەبات و گووتی:- ماڵی کوڕی جەحش وای لێهاتووە لە بێ‌صاحێبان کەسوکاری بۆی بگرێیت، ئەبوجەهل گووتی:- ئەوانە کێن بۆ ئەوەی دارو دیوار بۆیان بگرێیت؟!!

پاشان ئەبوجەهل لەسەر ماڵی (عبداللەی کوڕی جەحش) داناو، چونکە بەڕاستی ئەم ماڵە لە هەموویان خۆشتر و دەوڵەمەندتر بوو، ئەوەبوو هەڵس‌وکەتی لەسەر کەل‌وپەلی ئەم ماڵە دەکرد هەروەك ئەوەی خاوەنی بێت.

کاتێك کوڕی جەحش - خوا لێی ڕازی بێت - پێی گەیشت ئەبوجەهل چی بە خانووەکەی دەکات، ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:-

(الا تَرْضى يا عبدالله، ان يعطيَك الله بها داراً في الجنـّة؟).

واتە:- ئەی عبدالله ڕازی نابێت، خوای گەورە خانووەکت لە بەهەشت پێ ببەخشێت؟

ئەویش گووتی:- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی:- فذلك لك، واتە :- ئەمە بۆ تۆیە....

* * *

ماوەیەکی زۆر نەبوو (عبداللەی کوڕی جەحش) جێگیر بوو لە مەدینە پاش ئەم هەموو ئازارو ئەشکەنجەی تووشی بوو بەدەستی قورەیش، تاکو خوا حەزیکرد بەرەنگاری ناخۆشترین تاقیکردنەوە بێت کە لە ژیانی نەیبینیبوو، تووشی توندترین تاقیکردنەوە بوو لەم ڕۆژەی موسڵمان بووە.

با ئێستاش گوێ بگرین لەم داستانەو تاقیکردنەوە ناخۆشەی بە سەری هات:-

پێغەمبەری خوا ﷺ هەشت یاوەری هەڵبژارد بۆ هەڵسان بە یەکەمین کاری سەربازی لە ئیسلام، کە تێیدا (عبداللەی کوڕی جەحش) و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بەشداربوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

یەکێکتان لەسەر دەکەم بە ئەمیر لە هەمووتان زیاتر ئارامی هەبێت لەسەر برسیەتی و تێنوویەتی، پاشان ئالاکەی دا دەست (عبداللەی کوڕی جەحش)، ئەمەش یەکەمین ئەمیر بوو کرا بە ئەمیر لەسەر چینێك لە موسڵمانان.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم جێگایەی بۆ (عبداللەی کوڕی جەحش)دیاری کردو نامەیەکی دا دەست، فەرمانی پێکرد تەماشای نامەکە نەکات تەنها پاش ڕۆیشتنی دوو ڕۆژ نەبێت.

کاتێك دوو ڕۆژ لەسەر ڕۆیشتنی ئەم پۆلە یاوەرە تەواو بو عبدالله تەماشای نامەکەی کرد تێیدا نووسرا بوو:-

(ئەگەر تەماشای ئەم نامەی منت کرد برۆ تاکو دەگەیتە (نخلة) لە نێوان طائیفو مەککە، موراقەبەی قورەیش بکەو، دەنگوباسی ئەوانم بۆ بهێنەوە).

کاتێك عبدالله نامەکەی خوێندەوە تاکو گووتی:- گوێڕایەڵم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان بە یاوەرەکانی گووت:-

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێدەکات بڕۆم بۆ (نخلة) و موراقەبەی قورەیش بکەم بۆ ئەوەی دەنگوباسی بۆ ببەمو، قەدەغەی کردووم لەسەر ئەوەی یەکێکتان بە زۆری بێن لەگەڵم، هەر کەسێك شەهادەتی دەوێو ئارەزووی لێیە با هاوڕێیەتیم بکات، هەر کەسێکیش ئەمەی پێناخۆشە با بگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی گوناهبار ببێت.

کۆمەڵەکە گووتیان:- گوێڕایەڵین بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لەگەڵت دێین چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوویت.

پاشان کۆمەڵەکە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە (نخلة)، دەستیان کرد بە هاتوچۆکردنو گەڕان بە دوای ئەم ڕێگایەی تێیدا موراقەبەی دەنگوباسی قورەیش دەکەن، ئەوەندەی پێنەچوو کە لەم شوێنە مانەوە تاکو کاروانێکی قورەیشیان لە دوورەوە بینی چوار پیاو بوون بریتی بوون لە عەمری کوڕی حەضرەمیو، حەکەمی کوڕی کیسانو، عثمان کوڕی عبداللهو، براکەی موغەیرە کەوا بازرگانی قورەیشیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو بریتی بوو لە پێستەو مێوژو ئەو شتانەی کەوا قورەیشیەکان بازرگانیان بۆ دەکرد.

لەم کاتەدا یاوەرەکان ڕاوێژیان لە نێوان یەکتر دەکرد، ئەم ڕۆژەش ڕۆژی کۆتایی مانگی حەرام (ڕەجەب) بوو، گووتیان:-

ئەگەر ئەمانەمان کوشت ئەوا لە مانگی حەرام ئەوانەمان کووشتوە، ئەم کاتە حورمەتی ئەم مانگەمان شکاندووەو بەرەنگاری تووڕەیی عەرەبەکان دەبینەوەو، ئەگەر وازمان لێهێنان تاکو ئەم ڕۆژە دەڕوات ئەوا دەگەنەوە خاکی مەککەو لێرەدا ئەوان ڕزگاریان دەبێت.

بەردەوام ڕاوێژیان دەکرد تاکو هەموویان بیروڕیان وابوو پەلاماریان بدەنو بیانکوژنو ئەوەی لە لایانە بە دەسکەوت بیگرن... ئەوەبوو لە چەند ساتێکی کەم دا یەکیان کوشتو دووانیان بە دیل گرتن، چوارەمیان لەبەر دەستیان ڕزگاری بوو.

(عبداللەی کوڕی جەحش)و هاوڕێکانی دوو دیلەکەو بارەکەیان بە پێشە خۆیان داو بەڕێکەوتن بۆ مەدینە، کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وەستان بەرامبەر ئەو کارەی کردوویانە ئەوەبوو گەورەترین ناڕەزایی درا بەرامبەر کارەکەیان، پێی فەرموون:- سوێند بە خوا فەرمانم پێتان نەکردبوو بە جەنگ، بەڵکو فەرمانم پێتان کردبوو بوەستن بەرامبەر هەواڵی قورەیش و موراقەبەی جوڵانەوەکانیان بکەن، دیلەکانیان ڕاگرتو تاکو بزانن چ فەرمانێکیان پێدەکرێتو، وازیان لە بارەکە هێناو هیچ شتێکیان لێی نەبرد.

ئەوەبوو ئەم کارە لە دەست (عبداللەی کوڕی جەحش)و هاوەڵەکانی دەرچوو، دڵنیا بوون لەوەی کەوا بە هیلاك چوون لەگەڵ ئەو کارەی پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد.

زیاتر بەوەش تێکچوون برا موسڵمانەکانیان زیاتر لە نێوان یەکتر گازاندەیان لێیان دەکرد، هەر کە بە لایان دا تێپەڕ دەبوون گوناهباریان دەکردن بەوەی کە پێیان دەگووتن:- پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ کردووە.

زیاتر خەمبار دەبوون کاتێك زانیان قورەیشەکان بەهۆی ئەم ڕووداوەوە ڕێگایەکیان دۆزیتەوە ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرن، بڵاوی بکەنەوە لە نێو هۆزە عەرەبەکان و، دەیانگووت:-

موحەممەد مانگی حەرامی بە حەڵاڵ زانیوە و، خوێنی تێدا ڕشتووە و، ماڵی بردووە و، پیاوی بە دیل گرتووە.

مەپرسە (عبداللەی کوڕی جەحش)و هاوەڵەکانی چەندە خەمبار بوون بەرامبەر ئەم کارەی لە دەستیان چوو، وە لەو شەرمەزاریەی کەوا کەوتوونە ناویەوە بەرامبەری پێغەمبەری خوا ﷺ!!

کاتێك باری خەم بە هەموو هێزێکیەوە تینی پێهەڵچنیبوون... مزگێنیدەرێك هاتە لایان و مزگێنی دانێ بەوەی خوای گەورە ڕازی بووە بە کارەکەیان و، ئایەتی دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەر سەبارەت بەم کارە، ئەمجارەیان مەپرسە چەندە کەیف خۆش بوون و خەڵك دەهاتنە لایان و دەستیان لە ملیان دەکردن و بە هۆی ئەم مزگێنیە و پیرۆزباییان لێیان دەکرد بەم کارە پیرۆزەی کردیانە و قورئانیش پشتی گرتوون.

ئەوەبوو ئەم ئایەتانە دابەزینە سەر پێغەمبەرەکەی:

﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ ﴾ (البقرة ٢١٧)

کاتێك ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە دەروونی پێغەمبەری خوا ﷺ داکەوت و زۆر کەیف خۆش بوو، بارەکەی وەرگرت و، بە بەرامبەر دیلەکانی ڕزگار کردو، ڕازیبوو بە کارەکەی (عبداللەی کوڕی جەحش)و هاوەڵەکانی و ئەم جەنگەی کردیان ڕوداوێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان، دەستکەوتەکەیان یەکەمین دەسکەوت بوو لە ئیسلام وەرگیراو، کوژاوەکەیان یەکەمین بێباوەڕ بوون موسڵمانان خوێنیان ڕشت و، ئاڵاکەیان یەکەمین ئاڵا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دایەو دەست و، ئەمیرەکەی (عبداللەی کوڕی جەحش) بوو یەکەمین کەس بوو بانگ کرا بە ئەمیری بڕواداران.

پاشان جەنگی بەدر هات (عبداللەی کوڕی جەحش) دیسان گەورەترین بەشداری تیاکرد کەوا شایەنی ئیمانەکەی بوو.

پاشان جەنگی ئوحد هات (عبداللەی کوڕی جەحش)و هاوڕێکانی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص تیایدا بەشدار بوون داستانێکی لەگەڵە هەرگیز لەیاد ناکرێت، با ئەم قسە لێگەڕێین بۆ سەعدو خۆی ئەم داستانەمان بۆ بگێڕێتەوە...

سەعد کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت:-

کاتێك جەنگی ئوحد دەستی پێکرد (عبداللەی کوڕی جەحش) تووشم بوو گووتی:- ئایا نزا لە خوا ناکەیت؟

گووتم:- بەڵێ.

لە لایەك جیابووینەوەو نزامان کردو گووتم:- ئەی پەروەردگارا ئەگەر گەیشتم بە دوژمن تووشی پیاوێکی ئازام بکەیت، جەنگم لەگەڵ بکاتو جەنگی لەگەڵ بکەم، پاشان وابکەیت بەسەریدا سەرکەوم تاکو دەیکوژمو چەکەکەی لە لەشی دەکەمەوە، بەڵام هەرچی (عبداللەی کوڕی جەحش) بوو گووتی:- پەروەردگارا تووشم بە تووشی پیاوێکی ئازا بکەیت، شەڕی لەگەڵ بکەمو شەڕم لەگەڵ بکاتو، پاشان بمگرێت لووتو گوێیەکانم لێبکاتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بەیانی گەیشتم پێت، فەرمووت:- بۆچی لووتو گوێت براوەتەوە، منیش دەڵێم:-

بۆ تۆ و بۆ پێغەمبەرەکەت تۆش دەفەرموویت:- ڕاستت گووت.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاص - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت:-

بەڕاستی نزای (عبداللەی کوڕی جەحش) لە نزاکەی من باشتر بوو، کاتی ڕۆژئاوا بوون بینیمەوە، کوژراوەو ئەتك کراوە، لووتو گوێکانی بە داوێك بەسترابۆوە بە دارێك.

خودا نزاکەی (عبداللەی کوڕی جەحش) ی - خوا لێی ڕازی بێت - گیرا کردو ڕێزی لێنا بە شەهادەت هەروەك ڕێزی نا لە خاڵی گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عبدالمطلب - خوا لێی ڕازی بێت - .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیانی خاڵو خوارزای لە یەك گۆڕ بە خاك سپارد، پاش ئەوەی فرمێسکی پاکی ﷺ بۆ هەردوکیان ڕشتو فرمێسکەکانی لەگەڵ خۆڵی سەر گۆڕەکەیان تێکەڵاوی یەك بوون، بۆنی گۆڕەکەیانی پێ بۆن خۆش کرد.

ڕەزای خودا لە یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ بێتو پاش ئەوەی گەورەترین ڕەصیدی لە بانکی خودا تۆمار کرد لە دوای ئەو بازرگانیەی کردی ماڵەکی فرۆشت بە خوا بەرامبەر بە کۆشکێك لە بەهەشتو گیانی خۆی بەخشی بەرامبەری پلەی بەرزی شەهادەت.

لە کۆتاییدا لە خوا دەپاڕێینەوە ئیمانێکمان پێ ببەخشێت تاکو ئێمەش بتوانین بەم جۆرە ماڵو گیانی خۆمان ببەخشینە خوداو، خوای گەورە لە خۆمان ڕازی بکەین ( آمین یا ربَّ العالمین).



# عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل

یاوەرێک ڕاستگۆ بوو لەگەڵ
خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ

(٩١)

# عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل

## یاوەرێك ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ

ئەم پیاوە لە كۆتایی تەمەنی چلەكان بوو، ئەم ڕۆژەی پێغەمبەری بەزەیی و بەرەكەت بانگی هیدایەت و هەقی ئاشكرا كرد.

یەكێك بوو لە بەڕێزترین بنەچەكانی قورەیش و، لە هەموویان دەوڵەمەندتر بوو و لە هەموویان پلە بەرزتر بوو لە بنەماڵە.

بەڕاستی شایەنی ئەوەبوو هەروەك هاوشانەكانی موسڵمان بێت، لە نموونەی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص و موصعەبی كوڕی عومەیر و ئەوەی ناودارەكانی شاری مەككە، تەنها ئەگەر باوكی بەربەست نەبوایە.

ئینجا دەبێت ئەی برای بڕوادار ئەم باوكە كێ بێت؟!

ئەم باوكە یەكێك بوو لە گەورەترین ستەمكارانی شاری مەككە و، سەركردەی هاوبەش پەیداكەرە سەرەتاكان و، خاوەن ئەشكەنجەدەرەكان كەوا خوای گەورە ئیمانی بڕوادارەكانی پێتاقیكردەوە بە هۆی بێویژدانی و نامرۆڤایەتی ئەم پیاوە، بەڵام ئەم بڕوادارنە لە شوێنی خۆیان چەسپان و، ڕاستگۆیی ئەم بڕوادارانەی بۆ خواو ئەم ستەمكارانە بەڕاستی دەرهات...

ئەم پیاوە ستەمكارە ئەبوجەهل بوو. ووشەی ئەبوجەهل واتە سەركردەی نەزانین و گومڕایی، ئێمەش لێرەدا هەرچی (عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل)ی مەخزومی بوو، یەكێك بوو لە ناودارە بێوێنەكانی قورەیشی و بەناوبانگترین سوارچاكە مەزنەكانیان.

(عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل) بە هۆی سەركردایەتی باوكی، دەروونی خۆی بینیەوە لە دژایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەم جۆرە توندترین دژایەتی و دوژمنداری پێغەمبەری كرد و، گەورەترین ئازاری یاوەرەكانی داو، بووە كۆسپ بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان بۆ ئەوەی دڵ و دەروونی باوكی پێخۆش بكات.

كاتێك باوكی سەركردایەتی هاوبەش پەیداكەرانی كرد ڕۆژی بەدر، سوێندی خوارد بە لات و عوززا نەگەڕێتەوە مەككە تاكو شكستی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنێت، ئەوەبوو لە بەدر دابەزی و تێیدا سێ ووشتری كردە قوربانی و، عەرەقیان خواردەوە، ئافرەتە كۆیلەكان مۆسیقایان بۆ لێدەدان و گۆرانیان دەگووت، ئەو كاتەی ئەبوجەهل سەركردایەتی ئەم جەنگەی دەكرد عیكریمەی كوڕی كۆڵەگەی پشتی بوو پشتی پێدەبەست و بەهێزی ئەو دەستی ستەمی درێژ دەكرد.

بەڵام لات و عوززا بە پیر بانگەکەی ئەبوجەهل نەهاتن لەبەرئەوەی کەڕ بوون، نەیانتوانی بەسەری بێخن لەم جەنگەدا لەبەرئەوەی دەستەوەستان بوون، ئەوەبوو بە خێرایی لاشە بۆگەنەکەی لە مەیدانی جەنگ کەوت و عیکریمەش بە چاوی خۆی بینی ڕمەکانی موسڵمانان بە خوێنی باوکی خوێنیان لێدەکێتەوەو، بە گوێیەکانی خۆی کۆتا هاواری باوکی گوێ لێبوو کە لە نێو لێوەکانی دەرچوو.

*　　　*　　　*

عیکریمە گەڕایەوە مەککە لە دوای ئەوەی جەستەی بەجێماوی گەورەی قورەیش لە بەدر بەجێهێشت، ئەم شکستە گەورەیەی بەسەریان هات لێنەگەڕا بەسەر لاشەی باوکی ڕابگاو لە مەککە بە خاکی بسپێرێ، ڕێگای هەڵاتنی لەگەڵ هاوڕێکانی هەڵبژاردو لاشەکەی کەوتە بەردەستی موسڵمانان و، ئەوانیش لەگەڵ لاشە بۆگەنەکانیتر کۆیانکردەوەو لەگەڵ دەیەها کوژراوی هاوبەش پەیداکەرەکانیتر خستیانە ناو بیری (القلیب)، پاشان تۆزو لمی بیابان دایپۆشین.

ئیتر لە دوای ئەم ڕۆژەوە بارێکیتر زاڵ بوو بەسەر دەروونی (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) بە جۆرێکی وا دوژمنایەتی دەکرد لە ڕۆژێك دەگەڕا تۆڵەی باوکی کوژراوی بکاتەوە.

ئینجا لێرەدا (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل)و چەند کەسێك لەوانەی باوکیان کوژرا بوو لە بەدر خەریان لە چاو نەدەکەوت بۆ ئەوەی ئاگری دوژمنداری لە سینەی هاوبەش پەیداکەران هەڵبگیرسێنن دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ببوون بە گڵپەی ئاگر لە دڵی ئەوانەی تۆڵەی خۆیان وەرنەگرتبوو لە قورەیش، تاکو ڕوودانی جەنگی ئوحد.

(عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) دەرچوو بۆ جەنگی ئوحد، هەروەها خێزانەکی (ام حکیم)یشی لەگەڵ بوو بۆ ئەوەی بوەستێت لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی هاتبوون بۆ تۆڵە وەرگرتنەوەی کوژاروەکانیان لە دواوەی ڕیزەکان و، دەفیان لێدەدا بۆ هاندانی قورەیش لە جەنگەو، ئارامگرتن و چەسپاندنی سوارچاکەکانیان، ئەگەر ورەیان بەرداو پشتیان هەڵکرد.

قورەیش لەم جەنگەدا لە لای ڕاستەی سوارچاکەکانیان خالیدی کوڕی وەلیدیان دانابوو، لە لای چەپیان (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل)یان دانابوو، ئەم دوو سوار چاکە هاوبەش پەیداکەرە لەم ڕۆژەدا بەڵایەکی گەورەیان هێنا بەسەر پێغەمبەرو یاوەرەکانی بەهۆی ئەوەی ژمارەیەك لە موسڵمانان فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ شکاند، بەم جۆرە هاوبەش پەیداکەران سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا، تاکو (ئەبو سوفیان) وای لێهات بڵێ:- هذا یوم بیوم بدر... واتە:- ئەم ڕۆژە بە ڕۆژی بەدرە.

له جەنگی خەندەق، هاوبەش پەیداکەران بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك گەمارۆی شاری مەدینەیان دا بەبێ‌ئەوەی هیچیان بۆ بکرێت، تاکو (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) ئارامی لێبڕاو لەگەڵ چەند هاوبەش پەیداکەرێکی‌تر زۆریان لە ئەسپەکانیان کرد بۆ ئەوەی باز بدەنە ئەوبەری خەندەقەوە، لەوانەی لەگەڵ عیکریمە پەڕینەوە (عمرو کوڕی عبدود و ضیراری کوڕی خەطاب) بوون، وە کۆمەڵی موسڵمانان بە سەرۆکایەتی عەلی کوڕی ئەبوطالب هاتن بۆیان، عەلی بە عەمروی کوڕی عبدودی گووت-کە پاڵەوانێکی ناسراو بوو لە تەمەنی نەوەدساڵیدا بوو- ئەی عەمر تۆ پەیمانت داوە بە خوا هەرکاتێ پیاوێکی قوڕەیش بانگی کردی بۆ یەکێ لە دووشت تۆ یەکێکیانی لێ وەرگری؟ ووتی:- بەڵێ، ئیمامی عەلی ووتی:- دە من داوات لێ‌دەکەم کە باوەڕ بێنی بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە ئیسلام، عەمر ووتی:- پێویستیم بەمە نیە.

عەلی ووتی- دەی بانگت ئەکەم بۆ زۆرانبازێ. عەمر گووتی:- بەخوا پێم خۆش نیە منالێکی وەکو تۆ بکوژم.

عەلی ووتی:- بەخوا من حەز دەکەم بت کوژم... عەمر ڕقی هەڵساو لە ئەسپەکەی دابەزیو ڕووی کردە ئیمامی عەلی پەلاماری یەکیان داو یەکتریان هێناو بردو لە ئەنجامدا خوا کردی ئیمامی عەلی عەمری کوشت...

پاشان قوڕەیشیەکان ناردیانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لاشەکەیان بدەنەوە بە دە هەزار، پێغەمبەر فەرمووی بڕۆن بیبەنەوە ئێمە پارەی مردارەوە بوو ناخۆین..

بەم جۆرە عەمری کوڕی عبدود بووە قوربانی ئەم کارە سەربازییەیانو ئەمیان بە هەڵاتن ڕانەگەیشتو دەربازی نەبوو.

لە ڕۆژی فەتح دا مامی پێغەمبەر عەبباس کاتێك ئەم سوپاو هێزە گەورەیەی بینی زانی قوڕەیش بەرگەی ناگرێ، پێی ناخۆش بوو قوڕەیش لەناوبچێو خوێن ڕێژی لە مەککە بکرێ، لەم ڕووداوە لەگەڵ پێغەمبەردا دوا، پێغەمبەریش ﷺ پێی خۆش بوو ڕێگایەك بدۆزێتەوە بەو بۆنەیەوە بەبێ کوشتار دەست بەسەر مەککەدا بگرن، داوای کرد لە مامی:- بگەڕێت بەڵکو یەکێ بدۆزێتەوە بینێرێ بۆ ناویانو بیان ترسێنێ و بەبێ کوشتار دەست بەسەر مەککەدا بگرن، عەبباسیش سواری هێسترە سپیەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو و هات بۆ ناوچەی (اراك)، بەڵکو لەوێدا دارکێشێك یا ڕێبوارێك بڕوا بۆ مەککەو ڕای سپێری بۆ ناو قوڕەیش هێزو دەسەڵاتی موسڵمانانی تێبگەیەنێ، پاش ئەوەی قوڕەیش زانیانو هەواڵیان پێگەیشت بەرگەی ئەم هێزە ناگرن بە ناچاری ڕێگای موسڵمانانیان داو بەبێ شەڕ هاتنە ناو شاری مەککەو خۆیان بە دەستەوەدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی‌کرد بە سەرکردەکانی، شەڕ لەگەڵ کەس ناکەن مەگەر شەڕیان لەگەڵ بکەن.

بەڵام عیکریمە و کۆمەڵێك لە قورەیشییەکان دەرچوون لە بڕیاری قورەیشییەکان و، بڕیاریان دا دژی ئەم سوپا گەورەیە بوەستن، ئەوەبوو خالیدی کوڕی وەلید پاش ئەوەی موسڵمان بوو لە شەڕێکی بچووك دا توانی پەرتەوازەیان پێبکاو پەنا ببەن بۆ هەڵاتن، یەکێك لەم هەڵاتوانە (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) بوو.

لەم کاتەدا عیکریمە شاری مەککەی لەدەست چوو پاش ئەوەی مل کەچ بوون بۆ موسڵمانان، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیارێکی لێبووردنی گشتی بۆ قورەیشییەکان دەرکرد، تەنها چەند کەسێك نەبێت فەرمانی کوشتنی دان ئەگەر لەژێر سێبەری کەعبەش بێت، یەکێك لەمانە (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) بوو، لەبەرئەوە بە نهێنی لە مەککە دەرچوو، ڕووی کردە وڵاتی یەمەن، لەبەرئەوەی هیچ پەنایەکی نەبوو بێجگە لەم شوێنە نەبێت.

لەم کاتەدا (أم حکیم) خێزانی (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) و هیندی کچی عوتبە ڕۆیشتن بۆ جێگای پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئافرەتی تریشیان لەگەڵ بوو بۆ ئەوەی موبایەعە بە پێغەمبەر ﷺ بدەن، ئەوەبوو دوو خێزانی پێغەمبەر فاطمەی کچی و چەند ئافرەتێك لە نەوەی عبدالمطلب یان لەگەڵ بوو، هیند سەری خۆی داپۆشتبوو و گووتی:-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەمدو ستایش بۆ ئەو خوایەی ئایینی خۆی ئاشکرا کرد کەوا بۆ خۆی هەڵیبژاردبوو، من داوام وایە لێت بەزەیی تۆ بگات پێم و، من ئافرەتێکی بڕواداری ڕاستگۆم، پاشان ئەوەی سەری داپۆشیبوو و لایبردو گووتی:-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیند کچی عوتبەم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:-

(مَرحَباً بِكِ) واتە:- بەخێر بێیت، ئەویش پێی گووت:-

سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هیچ ماڵێك لەسەر ڕووی زەوی حەزم نەدەکرد وەکو ماڵەکەی تۆ ڕیسوا بێت، بەڕاستی ئێستاش وام لێهاتووە حەز بکەم هیچ ماڵێك لەسەر ڕووی زەوی وەکو ماڵەکەی تۆ سەرفراز نەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:- (وَ زِیَادةٌ ایضاً) واتە:- بەڵکو زیاتریش.

پاشان (أم حکیم) خێزانی (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) هاتە لای و گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەبەر تۆ عیکریمە هەڵاتووە بۆ یەمەن لە ترسی ئەوەی تۆ دەیکوژی، پەنای بدە خوا پەنات بدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- ئەو پەنادراوە.

لەم ساتەدا (أم حکیم) بۆی دەرچوو غولامێکی لەگەڵ بوو بەناوی ڕومی، کاتێك کەوتنە ڕێگا غولامەکەی نیازی خراپی جوڵا، ئەویش کاتێك هەستی بەوەکرد بە فرتوفێڵ ڕایگرت تاکو گەیشتە ئاوەدانیەکی عەرەبەکان ئەوانیش بە هانای ئەم ئافرەتە هاتن و غولامەکەیان بەند کردو لەلای خۆیان هێشتیانەوە.

ئەویش بە مەبەستی خۆی ڕۆیشت ڕێگای گرت بۆ ئەوەی بگات بە عیکریمە لە لای قەراغی ڕووبار لە ناوچەی تیهامە لە قەراغی دەریای سوور عیکریمە گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ دەریاوانێکی موسڵمان بۆ ئەوەی بیگوازێتەوە، دەریاوانەکە پێی دەگووت:- دڵسۆز بە تاکو بتگوازمەوە، عیکریمە پێی گووت:- چۆن دڵسۆز بم؟ گووتی:- بڵێ (اشهد أن لا اله الا الله وان محمداً رسول الله).

عیکریمەش پێی گووت:- هەڵنەدەهاتم ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە.

ئەوان لەم قسانە بوون (ام حكيم) گەیشتە لای عیکریمەو پێی گووت:-

ئەی کوڕە مام، هاتوومە لات لە لایەن چاکترین خەڵك و چاکەخوان، لە لایەن موحەممەد کوڕی عبدالله، بەڕاستی پەنام بۆ وەرگرتیت لە لایەن ئەوەوە پەنات دەدات و خۆت بە هیلاك مەدە، ئەویش پێی گووت:-

تۆ قسەت لەگەڵ کرد؟

گووتی:- بەڵێ، من قسەم لەگەڵ کردو پەنام بۆ وەرگرتوویت، بەم جۆرە قسەی لەگەڵ کرد تاکو دڵنیابوو، لەگەڵی گەڕایەوە.

پاشان باسی مەسەلەی غولامە ڕۆمیەکەی بۆ کرد ئەویش بە لایدا تێپەڕی پێش ئەوەی موسڵمان بێت کوشتی.

گەیشتنە شوێنێك لە ڕێگادا دابەزین عیکریمە دەیویست لەگەڵ خێزانەکەی کۆببێتەوە، ئەویش بە توونترین ڕەتکردنەوە ڕەدی دایەوەو پێی گووت:-

من موسڵمان و تۆ هاوبەش پەیداکەریت، سەری سوڕما پێی و پێی گووت:- ئەم کارە تۆی بەم جۆرە گۆڕیوە لەگەڵم کۆنەبیتەوە، دەبێت کارێکی زۆر گەورە بێت.

کاتێك عیکریمە لە مەککە نزیك بۆوە، پێغەمبەر ﷺ بە یاوەرەکانی فەرموو:-

پاش کەمێکی‌تر (عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل) دێتە لاتان بە بڕواداریەتی و موهاجیری، جوێن بە باوکی مەدەن، چونکە جوێن دانی مردوو زیان بە زیندوو دەگەیەنێت و ناگات بە مردوو.

ئەوەندەی نەبرد عیکرمەو خێزانەکەی گەیشتن و لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتن، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی بەبێ ئەوەی جل‌وبەرگی بە تەواوی لەبەر بکات لە کەیف خۆشیان بۆی هات، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت عیکریمە لەژێر دەستی وەستاو گووتی:-

ئەی موحەممەد،(ام حكيم) هەواڵی بۆ هێناوم تۆ پەنات داوم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- ڕاست دەکات، تۆ پەنادراوی، عیکریمە گووتی: بۆچی بانگم دەکەیت ئەی موحەممەد؟

فەرمووی:- بانگت دەکەم بۆ شاهیدی (لا اله الاّ الله)و منیش پێغەمبەری خوام ﷺ و بەندەی ئەوم‌و نوێژ بکەیت زەکات بدەیت‌و پایەکانی ئیسلام هەمووی جێبەجێ بکەیت، عیکریمە گووتی:-

سوێند بە خوا بانگت نەکردووە تەنها بانگی هەق نەبێت، فەرمانت نەکردووە تەنها بە چاکە نەبێت، پاشان گووتی:- بەڕاستی تۆ لەناو ئێمە بوویت پێش ئەوەی بانگمان بکەیت بۆ ئەمە تۆ لە هەمووممان ڕاستگۆتر و چاکەخوازتر بوویت، پاشان دەستی درێژ کردو گووتی:- (اشهد ان لا اله الا الله وانـك عبده ورسوله) پاشان گووتی:-

باشترین شتم فێر بکە بیڵێم ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فەرمووی دەڵێیت:- (اشهد ان لا اله الاّ الله وانـك عبده ورسوله) عیکریمە گووتی:-

پاشان چی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی دەڵێیت:-

شاهێدی بەخوا دەدەم‌و، شاهێدی دەدەم بەوانەی لەلامن، موسڵمان و موجاهیدو موهاجیرم، عیکریمەش ئەمەی گوتەوە.

لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:-

ئیمڕۆ داوای هەر شتێکم لێ‌بکەیت بەس لەلام بێت پێت دەبەخشم، عیکریمە گووتی:-

داوات لێدەکەم لە هەموو ئەم دوژمنداریانەی لەگەڵم کردووی‌و، یان لە شوێنێك پێت گەیشتبم، یان قسەیەکم لە بەرامبەرت یان بەبێ ئاگاداری تۆ کردبێت لێم خۆش ببیت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:-

خودایە لە هەموو ئەو دوژمندارییانەی لەگەڵی کردوین‌و، لە هەر شوێنێك بۆی ڕۆیشتبێت بۆ ئەوەی ڕووناکی تۆ بکوژێنێتەوە لێی خۆش ببیت‌و، لە هەموو ئەو گوناهانەی خۆش ببێت کە بەرامبەرمان بەبێ ئاگاداری من کردوویەتی...

ڕوخساری عیکریمە گەشایەوەو گووتی:-

سوێند بە خوا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر ماڵێکم بەخشی بێت دژی ڕێگای خوا ئەوا دوو ئەوەندە دەیبەخشمەوە لە ڕێگای خوا، وە هەر شەڕێکم کردبێت دژی ئایینی خوا ئەوا دوو ئەوەندە دەیکەمەوە لە ڕێگای خوا.

* * *

لەم ڕۆژەوە عیکریمە گەیشتە کاروانی بانگهێشتن‌و بوو بە سوارچاکێکی تێکۆشەر لە گۆڕەپانەکانی جەنگ، بەندەیەکی شەونوێژکەر و قورئان خوێن لە مزگەوت، قورئانی هەڵدەگرت‌و لەسەر ڕووی خۆی دادەنا و دەیگووت:-

کتاب ربّي... کلام ربّي... پاشان لە ترسی خوا دەگریا.

عیکریمە بوو بە بڕوادارێکی چاکەخوازو، بەشداری هەموو جەنگەکانی موسڵمانانی دەکردو لە ڕیزی پێشەوەی هەمووان بوو لە هەموو بوارەکان.

لە ڕۆژی یەرموك عیکریمە بەشداریەکی وای لەم جەنگە کرد وەکو ئەوەی تینوویێك لە ڕۆژێکی بێئاو بگەڕێت بە دوای ئاوێکی سارد، کاتێك شەڕ لە یەکێك لە شوێنەکان توونَد ببوو، عیکریمە لەسەر وڵاخەکەی هاتە خوارەوە و کاڵانی شمشێرەکەی شکاندو چووە ناو ڕیزەکانی دوژمنو، خالیدی کوڕی وەلید ڕووی تێکردو پێی گووت:- ئەی عیکریمە وامەکە، کوشتنی تۆ دەبێتە بێهێزی لەسەر موسڵمانان ، ئەویش گووتی:- ئەی خالید وازم لێبهێنە، تۆ ڕۆژانت هەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام من و باوکم لە هەموو کەس زیاتر ئازارمان داوە، وازم لێبهێنە با گوناهەکانی پێشووم ڕەش ببێتەوە، پاشان گووتی:- بەڕاستی لە زۆر شوێن شەڕم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە ئیمڕۆ لەبەر ڕۆم ڕابکەم؟

ئەمە بە هیچ شێوەیەك نابێت.

پاشان بانگی موسڵمانانی کردو گووتی:- کێ هەیە پەیمانی مردنم لەگەڵ بدات؟

مامی حارث کوڕی هیشامو، ضرار کوڕی ئەزوەر لەگەڵ چوار سەد لە موسڵمانان هاتنە دەرەوەو، جەنگیان لەنێو خیوەتەکەی خالید ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کرد، کەوا سەرکردایەتی سەربازییان بوو، ئەوەبوو جوانترین چالاکیان نواند.

کاتێك جەنگی یەرمووك دامرکایەوە بەم سەرکەوتنە گەورەیە سێ لاشەی موجاهیدان بە خوێنە ئاڵەکانیان سوور ببوون درێژ کرابوون لەسەر گۆڕەپانی یەرمووك ئەوانەش:-

حارث کوڕی هیشام و عەیاش کوڕی ئەبی ڕەبیعە و عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل بوون حارث داوای ئاوی کرد بۆ ئەوەی بیخواتەوە کاتێك ئاوەکەیان بۆ هێنا عیکریمە تەماشای کرد گووتی:- ئاوەکە بۆ ئەو ببەن، ئاوەکەیان بۆ عیکریمە هێنا عەیاش تەماشای کرد گووتی:-

بۆ ئەمەی ببەن کاتێك ئاوەکەیان بۆ عەیاش برد بینیان گیانی پاکی سپارد، کاتێك گەڕاندیانەوە بۆ هەردوو هاوڕێیەکەیتری ئەوانیش گیانی پاکیان سپارد... خوای گەورە هەر لە هەموویان ڕازی بێتو لەسەر ئاوی کەوسەر بە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ شەرابی کوسەر بنۆشن.

بەڕاستی ئەو پەیمانەی عیکریمە دای بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستگۆ بوو بۆیەو کەمتەرخەمی تیا نەکردو بەوەفا بوو بۆی و بە مەردی ژیاو بە مەردی گەیشت بە پەروەردگاری...

ڕەحمەتی خوا لە موجاهیدی لەخۆ بردوو و گیان لەسەر دەستو چاونەترس عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل ...

## (٩٢)

# نوسـەیبەی كچی كەعب

## موجاهیـدەیەكـی لەخۆبــردوو

داستانی ئەمجارەمان باسـی ئافرەتێكی بڕواداری موجاهیدە، كەوا موسڵمانان لـە كـاتی خـۆی بـە تـەواوی رێزیـان لێنـاوە، لـە مێـژووی پـڕ سـەروەری ئیسـلامدا چـەند لاپەڕەیـەكی پرشـنگداری تۆمـار كـردووە، پێغەمبەر ﷺ دوعـای بەهەشـتی بـۆ كـردووە لـەپاش كۆچـی دوایـی پێغەمبـەر ﷺ ئیمـامی ئەبوبـەكر (خـوا لـێی ڕازی بێـت) سەرپەرشتی چارەسەری زامدارانی كردووە، ئینجا پێویستە موسـڵمانانی ئـەمڕۆ ئـەم ئافرەتە بناسن‌و، بیكەن بە سـەرمەشقی ئافرەتانـی بڕواداران و سەبارەت بە قوربانی‌دان و گیان بەخت كردن لە ڕێگای ڕێبازی ئیسلام

ئەم ئافرەتـە بەڕێزەش یـاوەری پێغەمبـەری خـوا ﷺ (أم عمـارە) نوسـیبەكی كچـی كەعبی عەمری كوڕی عەوفـی ئەنصارییە، یەكێكە لە ئافرەتانی نەوەی مازنی نەججاڕ.

(أم عمارە) شووی بە پیاوێكی ئەنصاری كرد بە نـاوی (زەیـدی كـوڕی عاصم) كەوا یەكێك بوو لە گەنجە یەثریبیە ناودارەكان.

ئەوەبوو پاش چەند ساڵێك پێش ئـەوەی ژیانێكی پڕ سەروەری و بەختـەوەری‌یان لەگەڵ زەید بردەسەر دوو كوڕیان بوو بە نـاوی (عبـدالله و حبیـب) ئەم دوو كوڕە چاوی ئەم دایك‌و باوكەیان ڕووناك كردەوە.

ڕۆژێكیان زەید گەڕایەوە ماڵەوە دەم‌وچاوی دەگەشایەوە زەردەخەنە لەسەر لێوەكانی چـەند ووشـەیەكی مزگێنیـداری دەخوێنـدەوە، كـاتێك ئیسـراحەتی خـۆی لـە ماڵـەوە وەرگرت‌و شـەو تـاریكی داهێنـاو لەگـەڵ خێزانەكـەی كەوتـە گفتوگـۆ، زەیـد هـەواڵێكی مەزنی‌دا بە خێزانەكەی‌و كەوا لە دڵی خۆی جێگای ڕەزامەندی گرتبوو.

زەید گووتی:- ئەی دایكی عبدالله ئیمشـەو لـە مەجلیسـێك ئامادە بووم كەوا پیاوە ناودارەكانی یـەثریبی تیـابوو و دەورەی پیاوێكیـان دابـوو بـەناوی (موصـعەبی كـوڕی عومـەیر) خـەڵكی مەككـە بـوو، نـێردراو لـە لایـەن (موحەممـەدی كـوڕی عبـدالله كـوڕی عبدالمطلب) وای بانگەشە دەكرد، كە موحەممەد پێغەمبەرە لە لایەن خوای گەورە ڕەوانە كراوە بۆ هـەموو ئادەمیزاد بۆ ئـەوەی لـە تاریكی جاهیلی دەریان بهێنێ بـۆ ژیـانێكی ڕووناك‌و پڕ لە بەختەوەری یاسا، ئاگاداری ستەمكاران و دووڕووان بكاتەوە بە سـزا لـە ڕۆژی دوایی.

نوسـەیبە گووتی:- ئایا ئامینەی كچی وەهەب دایكی موحەممەد نیە؟

زەید گووتی:- بەڵێ ، ئەی نوسەیبە.

نوسەیبە گووتی:- کەواتە، لە نێوان ئێمەو ئەو خزمایەتی هەیە، هەردوو لامان لە بەنی نەجارین.

زەید گووتی:- ئەوەی دەیڵێی ڕاستە.

نوسەیبە گووتی:- ئەی باوکی عبدالله ئەی قورەیش چیان کردووە؟

زەید گووتی:- ئەمەیان ئێستا بۆت باس دەکەم، بەڕاستی ئەم پیاوە سەرفرازی بەدەست هێناو، لە پلەو پایەی ترسان، موحەممەد بتەکانی ناشیرین کردوون و خواکانی سووك کردوون، ئەوانیش ئەشکەنجەترین ئازاریان داو دوژمنداری بانگە پاکەکەیان کرد بە سەرەخۆیان دا شکایەوەو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پێغەمبەرە ورەی پێبەرنەداو پەیامەکەی بێهێز نەبوو.

نووسەیبە گووتی :- ئەی باوکی عبدالله تۆ چی دەڵێی لە ڕاستی ئەم پیاوە؟

زەید گووتی:- ئەوەی هەموو لە دڵدا لابردووم ئەوەیە قورەیش ماڵێکی زۆر و گەورەیی یەکی بێوێنەیان پێشنیار کرد بەڵام ئەمانە لە خشتەی نەبردن، ئەگەر ئەم پیاوە مەبەستی دونیا بوایە هەمووی بۆ ئامادە بوو، بەڵام ڕاستگۆ بوو بۆ بانگەکەی.

نوسەیبە گووتی:- ئەی باوکی عبدالله بە گوێرەی قسەکانت دیارە بەم بانگهێژە موعجیبی.

زەید گووتی:- سوێند بە خوا ئەی نوسەیبە من لە سنووری سەرسوڕمانی ئەم کارە تێپەڕیوم بەڵکو بڕواییم هێناوەو شاهێدیم داوە هیچ خوایەك بێجگە لە (الله) نیەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، ئەگەر هاتوو تۆش بە گوێیەکانی خۆت گوێت لە قسەکانی (موصعەب) بوایە دەربارەی بانگەکەی لە شاهێدیدان دوا نەدەکەوتی...

*　　　*　　　*

بەڕاستی قسەکانی تامی لە هەنگوین شیرین تربوو، دەتگووت کانییەو ئاوی شیرینی لە دەم هەڵدەقوڵێ، قسەکانی وای لە گوێگر دەکرد بە ئاسۆدا بفڕێ و وەکو بڵندە باڵەکانی لێکبدا، لەم باغ بۆ ئەو باغ بڕوات، ئەی نوسەیبە مرۆڤ بەم پەیامە هەست بە مرۆڤایەتی و گەورەیی خۆی دەکات....

*　　　*　　　*

لە کاتێکدا فرمێسك وەکو مرواری بریقەدار بە ڕوومەتەکانی نوسەیبە دەهاتە خوارەوە دەیگووت:-

(امنتُ بالله ربّاً وَ بِمُحَمّد نَبیّاً)...

بەم جۆرە نوسەیبە دەستی لەناو دەستی پیاوەکەی ناو، ئەویش پەیمانی پێدا لە کاتی هاتنی حەج لەگەڵ موبایەعەدەرەکانی ئیسلام بیبات لەگەڵ خۆی.

هەرکە کاتی حەج هات و خەڵك و لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە شاری مەککە کرد ژن و پیاو تێکەڵی یەکتر بوون لەناو بازاڕەکانی مەککە، (موصعەب) چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ مزگێنی پێدا کەوا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی یەثریب بانگەکەی ئەویان قەبووڵ کردووە، بە نوێنەر هاتوون بۆ مەککە موبایەعە بدەن و پەیمان بدەن، بەم جۆرە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ڕووی گەش بۆوە و زەردەخەنەی هات، مەوعیدێکی بۆ موبایەعەدەرەکان دانا...

لە کاتێکدا هێمنی باڵی خۆی کێشا بوو بەسەر مەککە و یانە و بازاڕەکان لە خەڵکەکە بەتاڵ ببوون، خەڵکەکە هەر هەموویان هەرکشا بوون بۆ ماڵەکانیان، تەنها کۆمەڵە چاوێك هەر بە ئاگاداری مانەوە و خەو لە چاویان نەدەکەوت، ئەو خەڵکانەی بە پەرۆش بوون بە دیداری پێغەمبەرەکەیان و خەونیان پێدەدەیت، ئەم خەڵکانەش خەڵکی یەثریب بوون لە عەقەبە لە یەکێك لە دۆڵەکانی مەککە کۆببونەوە، ئەو خاکەی مەزنترین وەفا و ڕاستگۆترین پەیمانیان بەسەر خۆیانەوە بینی...

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ مامی عەباس لە سێیەکی شەو ڕۆیشتن بۆ ئەم شوێنە دیاریکراوەی هێمنی باڵی خۆی بەسەردا کێشاوە و بێجگە لە مینگە گوێیان لە هیچ نابێت، بەیعەکە لەسەر ئیسلام لەژێر سێبەری شمشێر تەواو بوو، هەروەها (ام عمارە) و نوسەیبە مێردەکەی زەید لە موبایەعەدەرە ڕاستگۆیەکان بوون.

ئەوەبوو خەڵکی یەثریب گەڕانەوە، (ام عمارە)ش لەگەڵیان گەڕایەوە بەڵام ئەمجارەیان مرۆڤێکی نوێ و هەست و تیرازێکی نوێیان لێدروست بوو، بەهۆی ئەوەی تەزوویەکی ئیمانی لە دڵی موحەممەد ﷺ دڵ و دەروونی بەهێز کردنەوە و دڵیان پڕ بووە لە عیزەت و بەرگری... ئیشوکاری (ام عمارە) تەنها بریتی بوو لە بانگهێشتن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی و چاودێری ماڵ و پەروەردەی منداڵ لەسەر ئیسلام.

کاتێکیش پێی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە خاکی یەثریب، هەروەك تەزووی کارەبا شەپۆلی بەختەوەری خۆشی خۆی کرد بە دەروونی خەڵکەکە، پێغەمبەریش ﷺ شاری مەدینەی هەڵبژارد بەسەر هەموو شارەکانی حیجاز بۆ ئەوەی بیکات بە مەڵبەندی بانگەکەی و پەیامەکەی و سەرکردایەتی سەربازی، بەڕاستی ئەمە شانازییەکی مەزنە و بۆ شاری یەثریب ئەنصاریەکانیش بازووی خۆیان لێهەڵکرد بۆ ئەوەی بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە پارێزگاری لەم گەورەییە بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەخۆی و سێسەد و پەنجا کەس دەرچوون بۆ ئەوەی ڕێگا لە کاروانەکانی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بگرن کە لە وڵاتی شام دەگەڕایەوە، لەم کاتانەشدا نوسەیبە هانی کوڕەکەی (عبدالله)ی دەدا بۆ ئەوەی دەربچێت لەگەڵ موجاهیدەکان.

موسڵمانان بە ژمارەیەکی کەمو کەرەستەیەکی بێهێز ڕووبەڕووی ژمارەیەکی قورەیشی زۆر و سوارێکی زۆر و فیزێکی بێئەندازە لە (بەدر) بوونەوە.

بەڕاستی ئەم ڕۆژە هەقو ناهەق لە یەکتر جیابوونەوە، چینێکی کەمو زۆرێکی بێژمارە، هەروەها بێچەك پڕ لە ئیمان لەگەڵ چینێکی بەهێزی پڕ لە چەکی ڕمو شمشێرو زرێ بەڵام لەسەر ڕێبازێکی بەتاڵ، تێکەڵی یەکتر بوون کاتێك دەستاڕی جەنگ سووڕایەوەو شەڕ گەرم بوو، موسڵمانان دیارترین بەشداریان تیاکرد شەڕەکە بەسەر قورەیشیەکان دا شکایەوەو پشتیان هەڵکرد و هەڵاتن، هەروەها (عبدالله)کوڕی (ام عمارة) لەم کاتەدا گەنجێکی تەڕو ناسك بوو بەو ئیمانەی هەڵیگرتبوو دەهاتو دەچوو، لەم کاتانەدا قسەکانی دایکی موجاهیدەی بە یاد دەهاتەوە زیاتر خۆڕاگرو بەهێزتر دەبوو نەیدەزانی ماندووبوون چیەو وەکو هەورو تریشقە دەنگی دەهاتو ڕووبەڕووی دوژمنەکانی دەبۆوە.

کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان لە مەدینەی پیرۆز دەنگی دایەوە خەڵك بە هەلهەلەو تەکبیری سەرکەوتن پێشوازیان لە پێغەمبەرو یاوەرەکانی دەکرد، لە نێوانیشیاندا (أمّ عمارة) بە پەرۆش بوو بۆ دیتنی (عبدالله)ی کوڕی، هەرکە کوڕە خۆشەویستەکەی بینی باوەشی پیاکردو تێر تێر ماچی کرد بە دەستە پیرۆزەکانی تۆزو خۆڵی جیهادی لە نێوچەوانی دەسڕیەوە.

هەروەکو شتێکی سروشتیە ژیانی مرۆڤیش هەر لەسەر تیرازێك نیە گۆڕانی بەسەردا دێت لە نێوان خۆشیو ناخۆشیو کەیف خۆشیو خەموپەژارە.

(زەیدی کوڕی عاصم)ی موجاهید مێردی (نوسەیبە) کۆچیدوایی کرد نوسەیبە زۆر بۆ ڕۆژگارەکانی ڕابردوو گریا کە لەگەڵ زەید بەسەریان بردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی نوسەیبە بڕوادارێکی ئارامگر بوو ڕازی بوو بە قەزاوقەدەری خوا، داوای پاداشتی پێ لە خوای گەورە کرد... پاشان (غَزیّة کوڕی عەمر) هات بۆ خوازبێنی نوسەیبەو مێردی بە ئەو کرد...

* * *

کاتێك قورەیش ویستی ئارەقەی شەرمەزاری لەنێوچەوانی بسڕێتەوە کەوا لەوەی لە (بەدر) بەسەری هاتبوو، کۆمەڵەکانی کۆکردەوەو خەڵکی پیرو گەنجو سوارچاكو پیادەکانی هێناسەر مەدینەی ڕووناك، سەربازگەیان لە ئوحد دامەزراندو پێغەمبەریش ﷺ موسڵمانانی کۆکردەوەو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان هەرچەندە پێغەمبەریش ﷺ وای پێباش بوو لە مەدینە خۆیان قایم بکەن لەبەرئەوەی چاریان نەبوو.

کاتێك هەردوو چین لێکیان داو ئاگری جەنگ هەڵگیرسا جەنگ بەسەر هاوبەش پەیداکەران شکایەوەو موسڵمانان هەڵمەتێکی بەهێزیان کرد بۆ سەریان، هاوبەش پەیداکەران پشتیان هەڵکردو لە دوای خۆیان دەسکەوتێکی زۆریان بەجێهێشت تیربازەکانی سەر چیایەکە فەرمانی پێغەمبەریان شکاندو کەوتنە دوای دەسکەوت، ئەمجارەیان سەرکەوتنەکە پێچەوانە بۆوە لەسەر موسڵمانان، بووە بای هاوبەش پەیداکەرانو، موسڵمانان ڕیزەکانیان تێکچوو هەندێك لە پاڵەوانەکانیان بوون بە قوربانی ئەم هەڵەیە نموونەی حەمزەی کوڕی عبدالمگلب و موصعەبی کوڕی عومەیر، ئینجا ئەم کردەوە بووە هۆی ئەوەی کەلێن بهاوێتە ڕیزی موسڵمانان و بگەن بە پێغەمبەری خواو ﷺ ئازاری پێبگەیەنن و ئاڵای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێتە خوارەوە.

هەرچەندە ئەمەش مەحاڵە نابێت ئاڵای پێغەمبەرﷺ بکەوێتە خوارەوە.

بۆ جاری دووەم ئاڵای پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵکرایەوەو چەند موجاهیدێکی کەم لە دەورەی مانەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکەن و دوژمنی لێ دووربکەنەوە...

ئینجا لێرەدا جیهادی (أمّ عمارە) دەست پێدەکات نوسەیبە (خوا لێی ڕازی بێت) لەم ڕۆژەدا ڕۆژی (ئوحد) نەهاتبووە دەرەوە بۆ جەنگ، بەڵکو بۆ برین سازی بریندارەکانو ئاودانی تینووەکان، کاتێك ئەم دیمەنە ناخۆشەی بەچاوی خۆی بینی عیزەت گرتیو خوێنی گەرم بوو لەبەرئەوەی ئەم ئافرەتە ڕاستگۆیە بەیعەی عەقەبەی بینیبوو پەیمانی دابوو سەرو ماڵی لە پێناو خودا بەخت بکات، دێمکەی ئاوەکەی فڕێدا و شمشێرەکەی لە کەلان هێنا دەرەوە ڕۆیشت بۆ پارێزگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و لە شوێنی خۆی وەکو چیای سەرکەش مایەوە لەگەڵ مێردەکەی (غَزِيّة)و کوڕەکەی (عبدالله)، ئەمان لەگەڵ چەند نەفەرێکی کەم ژمارەیان لە دە کەس زیاتر نەدەبوو لە دەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ مانەوەو پارێزگاریان لێکرد کەوا بەرامبەریان ژمارەیەکی زۆر لە هاوبەش پەیداکەران هەبوو، ئەو بێباوەڕانە نەدەترسان و داوای جەنگیان لە بڕوادارە دڵسۆزەکان دەکرد.

نوسەیبە (خوا لێی ڕازی بێت) خۆی دابووە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ ببوو بە قەڵغان بۆ بەرگریکردن و وەڵام دانەوەی تیرەکان هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی دەیفەرموو:-

(ما التَفَتُ يَميناً ولا شمالاً الاّ اراها تُقاتِلُ دوني).

واتە:- ئاوەڕی چەپو ڕاستم دەدایەوە ئەوا دەمبینی نوسەیبە بەرگری لەمن دەکات.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ تیچاوی داین نوسەیبە جەنگ دەکات بەبێ زرێ پیاوێك پشتی هەڵکردووەو هەڵدێت پێی فەرموو:-

( الق تَرْسَكَ الى مَنْ تقاتِل)

واتە:- زرێیەکەت بدە بە یەکێك جەنگ بکات، زرێیەکی فڕێداو، (امّ عمارة)ش وەریگرت شەڕی پێکرد لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ

سوارچاکێك لە سوارچاکەکانی قورەیش پەلاماری نوسەیبەی دا بەڵام زرێیەکەی بەری کاری لێنەکردو شمشێرەکەی هیچی بۆ نەکرا، ئەویش کەوتە دوایو شمشێرەکەی لە قایشی بن زگی ئەسپەکەی داو هاوبەش پەیداکەرەکە کەوتە سەر زەوی و پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری (عبدالله)ی بۆ کرد فەرمووی:-

(یا ابنَ اُمُّ عمارة، امّك امّك..) واتە:- ئەی کوڕی (امّ عمارة) بەهانای دایکت وەرە، بە هانای دایکت وەرە...) عبداللەش هاوکاریکرد لەسەر کوشتنی.

عبدالله بریندار بوو پاش ئەوەی دایکی برینەکەی بۆ پێچایەوەو پێی گووت:- (هەڵسە بۆیان ئەی کوڕم شەڕیان لەگەڵ بکە) وای لێهات پێغەمبەرﷺ دەرهەقی بفەرمووێت:-

(وَمَن يُطيق ما تطيقين يا امّ عمارة)... واتە:- کێ ئەم هەموو توانایەی هەیە وەکو ئەو توانایەی ئێوە هەتانە ئەی (اُمُّ عمارة).

ئینجا بەڕاستی ئەو توانایەی (اُمُّ عمارة) هەیبوو لە هیچ کەسێك نەبوو بەڵکو لە پیاویش، ئافرەتێك ئاوی دەدا تێنووەکانو، برین سازی بۆ بریندارەکان دەکردو، شەڕی لەگەڵ قارەمانان دەکردو، خۆڕاگر بوو پیاو لەبەری هەڵدەهات و قارەمانان لەبەری شکستیان دەخوارد، دەسا خوا پشتیوانت بێت ئەی ئافرەتی بڕواداری موجاهیدە.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك عبداللەی کوڕی نوسیبەی بریندار کرد بە (اُمُّ عمارە)ی فەرموو:-

(هـذا ضارِبُ إبنِكِ) واتە:- ئەمە لە کوڕەکەتیدا ... ئەویش بەرەنگاری بووەوەو لە لاقیداو کەوتە سەر زەوی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە زەردەخەنی بردەوە تاکو ددانی پیرۆزی بە دیارکەوت، پێی فەرموو:-

(اقْتصّ یا (اُمُّ عمارە) ... واتە :- تۆڵەت لێی کردەوە ئەی (اُمُّ عمارة) پاشان (اُمُّ عمارة) ڕووی لە پیاوەکە کردو تەواوی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:-

(الحَمدُلله الّذي ظفَرَكِ، وَاقَرّ عَينَكِ و اراكِ ثأركِ بِعينِكِ)...

واتە:- ستایش بۆ ئەو خوایەی سەریخستی، چاوت ڕۆن بۆوە بە دوژمنەکەتو تۆڵەی خۆت بە چاوی خۆت بینی...

عبدالله هەر لە شوێنی خۆی ئارامگر و خۆڕاگر بوو پێغەمبەری خوای ﷺ لە خراپەی دوژمنان دەپاراست پێغەمبەری خوا ﷺ بینی پیاوێك بەرامبەریان دێت هـــاواری کرد:-

ابن (اُمُّ عمارة) !! کوڕی (اُمُّ عمارة)، ئەویش وەڵامی دایەوە گووتی:- بەڵێ بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموو:- بهاوێژە، عبدالله بەردێکی هاوێشت بۆ

پیاوەکەو لە چاوی ئەسپەکەی داو پیاوەکەو ئەسپەکە کەوتنە سەر زەوی، پاشان بەردی‌تری لێداو تاکو کوشتی.

جەنگ هەر لە گەرمەی دابوو، پەلامار لە لایەن هاوبەش پەیداکەران بەردەوام بوو بۆ سەر شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك کۆتا پەلامار درا بۆ سەر پێغەمبەر بۆ کۆتایی هێنانی موسڵمانان بە کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوارچاکێك لە قورەیشیەکان بەناوی (ابنُ قَمیئة) هاتە پێشەوەو گووتی:- موحەممەدم پێ‌نیشان بدەن ڕزگارم نەبێت ئەگەر ڕزگاری بێت، (اُمُ عمارة) و موصعەب کوڕی عومەیر بەرەنگاری بوونەوە، موصعەب کوژراو (خوا لێ‌ی رازی بێت) کاتێك (اُمُ عمارة) بەرەنگاری بۆوە لێدانێکی بۆ کرد ملی گرتەوە، بەڵام شمشێرەکەی کاری لێ‌نەکرد لەبەرئەوەی دوو زرێ‌ی لەبەربوو.

کاتێك هەر شەڕ بەردەوام بوو (اُمُ عمارة) خۆی گورج کرد پەلاماری راستو چەپی دوژمنی‌دا تاکو سێزدە برینی لە لەشی پەیدا بوو خوێنی پاکی دەهاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی عبداللەی کوڕی کردو فەرمووی:-

(اُمّك .... اُمّك اُعصب جُرحَها)... واتە:- دایکت... دایکت... برینەکەی بپێچەوە، (بارك الله علیکم من اهل بیتٍ، مقام اُمّك خیرٌ من مَقام فلانٍ و فُلان، رحم الله اهل البیت) واتە:- خودا ئەم بنەماڵەیە پیرۆز بکات، شوێنی دایکت باشترە لە شوێنی فلان‌و فلان، خوا رەحم بەم بنەماڵەیە بکات...

نوسەیبە گوێ‌ی لەم فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺبوو ئەم پیرۆزیەی بیست، بەدەمی پیرۆزی هاواری‌کرد:-

ئەی پێغەمبەری خوا لە خوا داوا بکە ببینە یاوەرت لە بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دایەوە (اللهم إجعلهُم رُفقائي في الجنّة)...

واتە:- خودایە وابکە ببنە یاوەرم لە بەهەشت، ئینجا هاواری لێ بەرز بۆوەو گووتی:- گوێ نادەم بە هیچ شتێك تووشم بێت لە دونیا.

پاشان بۆی دەرچوو، هەروەکو بڵێیت بۆنێکی خۆشی بۆ دابەزیبێ چووبێتە ناو ڕووحی گوێ‌ی نەدا بە هیچ شتێك‌و، کۆمەڵی هاوبەش پەیداکەران بەرە بەرە بێ‌هێز بوو، پەلاماریان نەما، پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامەت دەرچوو، بێ‌باوەڕان کشانەوەو موسڵمانانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە.

بەڵام گەڕانەوەیەکی پڕ لە ناسۆر و خەم، ئەوەبوو بانگدەرێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی‌کرد بە دوای بێ‌باوەڕان بکەون تاکو (حمراء الأسد) نوسەیبە دەیویست ئەم شانازی‌و گەورەییەشی لەدەست نەچێت لەم جەنگەدا ئەوەبوو جلەکانی خۆی گورج کرد بەڵام برینە سەختەکانی کەوا خوێنی لێ‌دەهات ڕێگای پێ‌نەدا لەماڵ بچێتە دەرەوە، ئەوەبوو لە ماڵ مایەوە هەندێك ئافرەت لەگەڵی مانەوە برینەکانیان سارێژ دەکرد، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە (حمراء الأسد) گەڕایەوە، نەگەڕایەوە ماڵەوە تاکو لە ساغ‌و

سـەلامەتی (أمُ عمـارة)ی پرسـی، زۆر کـەیف خـۆش بـوو کـاتێك زانـی (أمُ عمـارة) سەلامەتە...

کاتێك ئایەتی (حیجاب) دابەزی (أمُ عمارة)، یەکی کەوت لەبەرئەوەی نەیتوانی لەم ڕۆژەدا دەربچێت بۆ جەنگ، ئەی باشە چی‌بکـات بـۆ ئـەوەی ئەمـە قـەرەبوو ( تعویـض) بکاتەوە؟؟

لێرەدا هانی کوڕەکانی (عبدالله)و (حبیـب)ی دەدا کەوا دوو گەنجی تەڕو ناسك بوون لەسـەر خۆشەویسـتی شـەهادەت‌و خـۆ بـەقوربانی‌دان‌و پارێزگـاری لـە ئـایینی خـواو بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی گەورە ببوون.

هەروەها نوسەیبە لـە (بیعـــة الرضـوان)یش بەشدار بوو کەوا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشـتـن بۆ حەجی ماڵی خواو کۆتایی هات بە ڕێککەوتنـی حودەیبیـە .

پاش ئەوەی چەنـد تیـرەو هۆزێك لـە دوای کۆچی دوایی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ئایینـی ئیسـلام هەڵگەڕانـەوە، ئیمـامی ئەبوبـەکر (خـوا لـێ‌ی ڕازی بێـت) سـوپایەکی ئامادەکرد بۆ جەنگ لەگەڵ کردنیان، ئەوەبوو ( حبیب کوڕی زەید)ی بۆ ڕەوانە کردن وەکو نوێنـەرێك، بـەڵام موسـەیلەمەی-نەفرەت لێکراو- گرتی‌و بە زنجیـر بەستی‌یەوە، پاشان زۆری لێکرد شاهێدی بدات بە پێغەمبەرایەتی موسەیلەمە، بەڵام حبیـب وەڵامی دایەوە بە (لا اسـمع) واتـە:- گوێـم لـێت نی‌یـە، موسـەیلەمەی سـتەمکار ئەندامـەکانی لەشی پارچە پارچە لێدەکردەوە تاکو لە ژێر دەستی شەهید بوو.

لە دوای ئەمە نوسـەیبە سوێندی خوارد دەبێت کوشتنی موسەیلەمە بە چاوی خۆی ببینێت لەبەرئەوەی ئەم کارەساتە کارێکی گەورەی لە دڵە گەورەکەی (أمُ عمارة) کرد..

ڕۆژی (یەمامـە) پـاش ئـەوەی موسـڵمانان لـە مەدینـە دەرچـوون بـۆ جـەنگی هەڵگەڕاوەکان، عبدالله وەکو بروسـك لەگەڵیان دەرچوو بۆ ئەوەی تۆڵـەی ئایینی خـواو براکەی بکاتـەوە، ئـەوەبوو نوسـیـەبەش بۆ وەفای سـوێندەکەی لە کەژاوەکەی لەگەڵیان دەرچوو ئەو کاتە تەمەنی شەست‌و پێنج ساڵ دەبوو، کەوا پیـریش نەیدەتوانی چۆکـی پێ‌بدا.

* * *

لە سەرەتای جەنگەکە بای هەڵگەڕاوەکان بوو بەڵام پاش ئەوی خالیدی کوڕی وەلید (خـوا لـێ‌ی ڕازی بێـت) هـاواری کـردە سـەر موسـڵمانان (وا مُحَمَّـداه)، ئـەم دەنگـە وەك تەزووی کارەبا چوو بە ناو دڵـی موجاهیدان، لێرەدا (أمُ عمـارة) نـەیتوانی خـۆی ڕابگرێ شمشێرەکەی دەرهێناو لەگەڵ پۆلێك لە سوارچاکان لـە ئـەنصارەکان پـەلاماری دوژمنـی دا ئەوەبوو قوڵێکی بڕایـەوە و ڕەوانـەی بەهەشـتی کـرد، بـەڵام ئەمـەش وای نـەکرد (أمُ عمارة) ورە بەربدا هـەر بەرەو شـوێنی موسـەیلەمە ڕۆیشـت لەگـەڵ کوڕەکـەی (عبـدالله)

ئەوەبوو کەلاکێکی تۆپیو لە لاشەی موسەیلەمە کەوتە بەردەستیان، ئینجا موجاهیدەی خۆڕاگر بە یەك قۆڵەوە گەڕایەوە، بەڕاستی ئەم توانا و ورە بەرزەی (أمُ عمارة) هەیبوو لە هیچ پیاوێکی بەغیرەت بەدی نەدەکرا.

چەند ساڵێك بەسەر چوو (أمُ عمارة) هەروەك بە پەرۆش بوو بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی پاکی بەرەو بارەگای پەروەردگار بەرز بۆوە.

بەڵام با بزانین (عبدالله) خاوەن بەدری و ئوحدی و هەموو جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگەکانی دوا ئەو چارەنووسی بە کوێ دەگات؟؟!

پاش ئەوەی (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) نەریتی دەستبەسەر داگرتنی دەسەڵاتی داهێناو لە دوای خۆی دەسەڵاتی خەلافەتی دا بە کوڕە ستەمکارەکەی یەزیدی لەخوانەترس، (عبدالله)ش هەروەکو ئیمامی حوسەین شەهیدی کەربەلا یەکێك بوو لە بەرهەڵستکارەکان لەبەرئەوەی ئەم یاوەرە لە کۆشی دایکێك گەورە ببوو لەسەر بنچینەی هەق و یەکسانی و دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە ئیمانی بێ گەرد.

ئەوەبوو یەزیدی کوڕی موعاویە سوپایەکی ئامادەکرد بۆ ئەوانەی ڕازی نابن بە خەلیفایەتی ئەم و مل کەچی فەرمانەکانی نابن، سوپایەکی بە سەرکردایەتی (موسلم کوڕی عوتبە) ڕەوانە کردە سەر شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ، عبدالله یەکێك بوو لە ڕیزی بەرگری کارانی مەدینە، ڕووبەڕووی ئەم ستەمکارانە وەستاو، شەهیدکرا، عبدالله بە سەربەرزی دونیای بەجێهێشت و خراپە و ڕیسواییش بۆ بکوژەکانی مایەوە...

ڕەزای خودا لە یاوەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ (أمُ عمارة) و کوڕەکانی عبدالله و حبیب بێت ، خوای گەورە وا بکات ئەم ئیمان و غیرەتەش بچەسپێنێ لەناو دڵی ئێمەش و پلەی شەهادەتمان پێ ببەخشێت -آمین-.

(٩٣)

# عوبادەی کوڕی صامت

## ئەو یاوەرەی کەوا ئیسلام تیایدا ڕەنگی دەدایەوە

ڕووناکی ئیسلام گەیشتە مەدینەو، ڕووناکیەکەی تادەهات بڵاوەی دەکردو، بەرەبەرە دڵەکانی بەخۆیەوە دەگرت...

هەواڵی ڕاستگۆیی و دەسپاکیو ژیانی و هیدایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە دڵی عوبادەی کوڕی صامت (خوا لێی ڕازی بێت) زۆر بە مەزنی بیری لەم کارە کردەوە، ئەوەبوو دڵی بۆ ئەم بانگە نوێیەو هەواڵی ئەم پێغەمبەرە مەزنە کرایەوە.

عوبادە لەگەڵ چەند کەسێك لە مەدینە ڕۆیشتن بۆ مەککە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم ڕۆناکیە.

ئا لەم شوێنەدا عوبادەو برایەکانی لە ئەنصارەکان کۆبوونەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ. ئای لەبەر ئەم کۆبونەوە مەزنەی کەوا لەگەڵ گەورەی دونیاو قیامەت موحەممەدو ﷺ عوبادەی کوڕی صامت و هاوڕێیەکانی لە ئەنصارەکان بەسترا!! ئەم کۆبوونەوەش بە بەیعە لەسەر ئیسلام کۆتایی هات.

بەڵێ ئەم بەیعە بوو کەوا ڕووناکی لە پێش قارەمانی مەزنمان کردەوە، بە درێژایی ژیانی خۆی لەم ڕووناکیە بینیەوە...

عوبادە (خوا لێی ڕازی بێت) زۆر شانازی دەکرد بەم بەیعەیەو، یەکێك بوو لە قارەمانەکانیو لە پاش ئەو بەیعەیەش بوو بە یەکێك لە قارەمانە ناودارەکانو، یەکێك لە پێشەنگە ڕووناکبیرەکانی خەزرەجو لێپرسراوێکی ڕێكوپێك بە ڕێبازی ئیسلام و یاساکانی...

ئینجا دەبێت بنەماڵەو ناسنامەی ئەم یاوەرە بەڕێزە چی بێت؟

پێشەوای سەرمەشق عوبادەی کوڕی صامت کوڕی قەیس کوڕی اصرم کوڕی فیهر کوڕی ثەعلەبەی خەزرەجی ئەنصاریە)، نازناویشی باوکی وەلیدە...

دایکی (قرة العين عبادەی کوڕی فضلە کوڕی مالك کوڕی عجلان)ە.

موسڵمانان بۆ جاری دووەم لە مەدینەی ڕووناك دەرچوون بۆ مەککەی پیرۆز بۆ ئەوەی کۆببنەوە لەگەڵ پێشەوای ڕێبازی ئیسلام و پێغەمبەری پاكو بێگەرد موحەممەد ﷺ، هەروەها کاتی ئەم پێکگەیشتنەش لە تاریکایی شەوەزەنگی شەوبوو، بێباوەڕەکانیش لەم کاتەدا هەموو توانایەکی خۆیان تەرخان کرد بوو بۆ ڕیشەهەڵکێشانیهەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لە دەرەوەو لە ناوەوەی مەککە.

﴿ يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ۞ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴾ (التوبة ٣٢-٣٣)

ئەم كۆبوونەوەش هەر لە عەقەبــە كرا عــوبادە بۆ جاری دووەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كۆبۆوە.

لە سیرەی ( ئیبن هیشام) هاتووە، ئیبن ئیسحاق دەڵێت:-

پاش ئەوەی عوبادەی كوڕی صـامت لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە عەقەبە، لـە ناوەڕاسـتی ڕۆژانـی(التشـریق)، ئـا لـەم كاتـە ویسـتی خـوا وابـوو پێغەمبەرەكـەی سەركەوتوو و سەربڵند بكات و موسڵمانان سەرفراز بكات و هاوبەش پەیداكەران ڕیسواو سەرشۆڕ بكات.

كەعبی كوڕی مالك (خوا لـێی ڕازی بێت) دەڵێت:-

ئـەم شـەوە لـە لای وشـترەكانمان ماینـەوە، تـاكو سـێیەكی بەسـەرچوو لەگـەڵ ووشـترەكانمان ڕۆیشـتین بـۆ میعـادی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، دەڕۆیشـتین هـەروەك ڕۆیشـتنی نـەرمی قەتـێ، تـاكو كۆبووینـەوە لـە دۆڵێك لە عەقەبـە ئێمـە حەفتـاو سـێ پیـاوو دوو ئـافرەت بووین، ئافرەتـەكانمان نوسـەیبەی كچـی كـەعب (أمُّ عمـارة) و ئەسـماوی كچـی عومـەر كـوڕی عـەدی (أم منیـع) لـە دۆڵێـك كۆبووینـەوە چـاوەڕێی پێغـەمبەری خوامان ﷺ دەكرد تاكو لەگەڵ مـامی عـەباس كوڕی عبدالمطلب هـات بۆ لامان.

كاتێك دانیشتین یەكەمین جار عەباس كوڕی عبدالمطلب قسەی كردو گووتی:-

((ئەی كۆمـەڵی خـەزرەج-واتـە خـەزرەج و ئـەوس:- بەڕاستی موحەممـەد لـە ئێمەیـە هەروەك دەزانن موحەممەد لە ئێمەیە، بەڕاستی هـەڵبژاردە بوو لە میللەتەكەمان، لەناو میللەتەكەی لە سـەرفرازیدا بوو، هـەڵبژاردە بوو لـەناو شـارەكەی بەڕاسـتی لای ئێـوەی هـەڵبژاردووە و دێت بۆ لای ئێوە، ئەگـەر ئێوە وا تێڕادەبینن بۆی بە وەفان بـن و بێتـە لاتان، وە دەیپارێزن لەوەی كێشـەی لەگـەڵ دەكات و، ئێوە بەرگەی ئەمە دەگرن، ئەگـەر واشی تێدا ڕادەبینن پاش ئـەوەی دێت بۆ لاتان سووك و ڕیسوای دەكـەن، لە ئێسـتاوە وازی لێبهـێنـن، چونكە ئەو لەناو شارو میللەتەكەی لە عیزەت و سەرفرازیە.

ئێمەش پێمان گووت:- بەڕاستی گوێمان لـەوە بووە كە گووتـت:- قسـەی بكە ئـەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆت و خواكەت حەز لە چیدەكەن پێمان بسـپێـرە)).

پێغەمبـەری خـوا ﷺ قسـەی كـردو، قورئـانی خوێنـدەوەو لە خـوا پاڕایـەوە و زیـاتر ئیسلامی لە پێش جوان كردین، پاشان فەرمووی:-

(موبایەعەم بكەن بمپارێزن لەوەی ئافـرەت و منداڵەكانی خۆتانی لـێ دەپارێـزن).

بەرائی كوڕی مەعرور دەسـتی لەناو دەسـتی ناو پاشان گووتی:-

(بەڵێ، سوێند بەو کەسەی بەهەق تۆی ناردووە بە پێغەمبەرایەتی، دەتپارێزین هەروەك ئەو شتانەی خۆمانی لێدەپارێزین، موبایەعەمان بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە سوێند بە خوا پیاوی جەنگین، پیاوی چەکین، لە پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە).

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

(با دوازدە پێشەنگ لە ئێوە بۆ من بێنە دەرەوە، بۆ ئەوی لەسەر میللەتەکەیان ببن بە ئەمیر، ئەوەبوو دوازدە پێشەنگ بۆی هاتنە دەرەوە، نۆ لەخەزرەجیان و، سێ لە ئەوسیان).

قارەمانی داستانمان عوبادە (خوا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لەم پێشەنگانە کەوا بەرگری ئەم ڕاسپاردەی گرت و هاوێشتیە سەرشانی خۆی و، پاراستنی و بەند بە بەند و بە ووردی ڕایپەڕاند.

تیشکی هەق بە شادەمارەکانی عوبادەی کوڕی صامت لە ڕەوشت و ڕێبازی ڕەنگی دایەوە، هەموو کات چاوەڕێی چاکەی لێدەکراو، ڕێنمایی ئیسلامی لە فێرکاری مەزنی موحەممەد ﷺ وەردەگرت، پاشان ئەم ڕێنماییە لەگەڵ بیری قارەمانی مەزنمان عوبادەی کوڕی صامت کاری لێك دەکرد و، کەسایەتی عوبادەی گۆڕی بۆ مرۆڤێکی نموونەیی بێوێنە، بەبێ فیز دەڕۆیشت بەسەر زەویدا، پیاوێکی تاکو بڵێیت هێمن و بەهێز و چالاك و زیرەك و تێگەیشتووی لێدەرچوو.

بەڵێ هەر ئەم پیاوەیە پێشوازی دەکات لە ڕێنماییەکانی ڕووناکی پێغەمبەر و پاشان دەینێریت بۆ خەڵك و وەکو دیاری و بە بیر هێنانەوەو ڕێگا نیشان دان، بە یادهێناوەش سوود بە بڕواداران دەگەیەنێت.

عوبادە (خوا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لە کۆڵەکە گرنگەکان کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆمەڵگای نوێ دروستی کرد لە مەدینە، ئەو کۆمەڵگایەی کەوا بوو بە موعجیزەی مرۆڤایەتی و شانازی نادەمیزاد...

عوبادە (خوا لێی ڕازی بێت) پیاوێکی کەڵەگەت و بەشان و شەوکەت و جوان بوو، زۆر ڕەشتاڵە بوو، بەهێز و تێك چەقیوو زۆر چالاك بوو.

هەر لەم ساتەی عوبادە هاتە ناو ئیسلام هیچ کاتێکی بە فیڕۆ نەداو، فێری قورئان بوو و، لە ئاییـن تێگەیشت و، سوور بوو لەسەر یاوەرێتی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێڕایەڵ و هۆشیار بوو، تێدەگەیشت و کاری دەکرد.

هەروەها ئەم کاتەی عوبادە قورئانی لەبەرکرد و بوو بە قورئان خوێن بە خێلی پێنەکرد، بەڵکو خۆی تەنها کرد بە (أهل الصُفَّة)و فێری قورئانی دەکردن لە پێناوی ڕەزامەندی خواو پێغەمبەر لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:-

(خيركم مَن تَعَلَم القرآن وَعَلَمَهُ) ...

واتە :- باشترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان دەبێت و خەڵك فێر دەکات...

پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان عوبادەو ابي مرشد الغنوی لە شاری مەدینە، برایەتی‌یەك بۆ خودا هاوبەش بوون لە خۆشی‌و ناخۆشی... ئەم برایەتیەش بووە هۆی سوودێکی زۆر بە کۆمەڵگای ئیسلامی بگەیەنێت لە مەدینەی ڕووناك.

عوبادە شوێنەوارێکی دیاری هەبوو لە بەشداری لە جەنگی بەدر، ئەوەبوو لە نێوان جەنگاوەران دەهات‌و دەچوو بە بێ‌ئەوەی گوێ بدات بە مردن‌و بە لێدان.

بەڕاستی خۆشترین مردن‌و سەرفرازترین مردن ئەو مردنەیە موسڵمان گیانی خۆی بەخت بکات لە پێناوی خوای گەورە و ئەم هیوایەش هیوای هەموو موسڵمانێکی ئەم کاتە بوو کەوا لە نوێژ و خواپەرستنەکانیان داوایان لە خوا دەکرد.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی بەدر گەڕانەوە، لەبەرئەوەی جولەکەی بەنی قەینوقاع لە مەدینە نزیك بوون، داوای لێکردن بۆ موسڵمان بوون‌و پێی فەرموون:-

(ئەی کۆمەڵی جولەکە، ئاگادار بن لەوەی خوا بۆتان بهێنێتە خوارەوە لە سزا هەروەك ئەوەی بە قورەیشەکانی کرد، موسڵمان بن، بەڕاستی ئێوە دەزانن من پێغەمبەرم نێردراوی خوام، ئەمەش لە کتابەکانی خۆتان بینیووتانەو خوا پەیمانی پێداون).

بەڵام جولەکەی بەنی قەینوقاع وەڵامێکی بێ‌سەرو بەریان داوەو گووتیان:-

( لا يَغُرنك انك لقيت قوماً لا علم لهم بالحرب، فأصبت منهم فرصة، إنا والله لئن حاربناك لتعلمَنّ انا نحن الناس).

واتە:- ئەمە لە خۆبایت نەکات گەیشتی بە میللەتێك نازانن جەنگ بکەن‌و، هەلێکت ڕێکەوت بۆیان، ئێمە سوێند بە خوا ئەگەر جەنگت لەگەڵ بکەین دەزانی ئێمە کێین!!؟..

جولەکەکان بەم وەڵامە ناشیرینە نەوەستان بەڵکو دەست درێژیان کردە سەر ئافرەتێکی موسڵمانان و، کارەکە گەورە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ ترساندنی‌و گەمارۆی دان.

ئینجا لێرەدا پاکی‌و بێ‌گەردی عوبادە دەردەکەوێ‌و دووڕوویی‌و ناپاکی مونافیقانیش بەدیار دەکەوێت بە تایبەتی سەرۆکی مونافیقان عبدالله کوڕی ئەبی کوڕی سەلول، ئەوەبوو ئەم مونافیقە هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگری لە جولەکەکانی بەنی قەینوقاع کردو داوای لێکردن بە مانەوەیان و پاراستنیان‌و، چاکە لەگەڵ کردنیان.

بەڵام تیشکی ئیمان لە عوبادەی کوڕی صامت ڕەنگی‌دایەوە، ئەوەبوو پەیمانێك هەبوو لە نێوان جولەکەو هۆزی خەزرەج، عوبادە بینی جۆرە بەرهەڵستکاری‌و هەڵگەڕانەوەیەك هەیە لە جولەکەی بەنی قەینوقاع بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوە عوبادە بڕیاری‌دا خۆی لێیان بێبەری بکات‌و هەروەك قسەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت:-

(ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو بڕواداران دەکەم بە پشتیوان‌و، لە پەیمانی ئەو بێباوەڕانە بەریمە).

هەروەها دەربارەی هەڵسوکەوتی(عبدالله کوڕی ئەبی سەلول)یش لە سیرەی ئیبن هیشام ئەم دیمەنەمان بۆ دێنێتەوە باسی لێوە دەکات هەروەك دەڵێت:-

کاتێك بەنی قەینوقاع جەنگیان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ (عبدالله کوڕی ئەبی سەلول) بەهانایان چوو لە پێغەمبەر ﷺ هەڵسایەوەو گووتی:-

(ئەی موحەممەد، چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانەکانم، من پیاوێکم لە دەورروبەری خۆم دەترسم).

ئینجا دەربارەی ساغ و بێگەردی عوبادەو عبداللەی موناڧق ئەم ئایەتانەی دابەزی لە سورەتی (المائدة):-

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ۞ فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَى مَا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ ۞ وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَؤُلاَءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ ۞ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لاَئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ۞ إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ۞ وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمْ الْغَالِبُونَ ﴾ (المائدة ٥١-٥٦)

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیکرد بە دەرکردنی بەنی قەینوقاع، عوبادەش (خوا لێی ڕازی بێت) سەرپەرشتی دەرکردنی جولەکەکانی کردو، جولەکەکان پێیان گووت:-

ئەی باوکی وەلید لە نێوان جولەکەو خەزرەج پەیمان هەبوو و ئێمە پشتیوانت بووین، ئەوەت لەگەڵ کردین!).

عوبادەش پێی‌گووتن:- (کاتێك جەنگتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وازم لێتان هێناو پەیمانەکەم هەڵوەشاندنەوە).

ئیتر بەم جۆرە هەموو کاتێك کێشە هەبوو لە نێوان سەربازانی ڕەحمان و سەربازانی شەیتان لە موناڧیقان و هەڵگەڕاوەکان، بەڵام سەرکەوتن هەموو کات لە کۆتاییدا بۆ سەربازانی خوداو هەق بوو هەروەك دەفەرموێت:-

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ۞ إِنَّهُمْ لَهُمْ الْمَنصُورُونَ ۞ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمْ الْغَالِبُونَ ﴾ (الصافات ١٧١-١٧٣)

ئەوەبوو عبداللەی کوڕی ئەبی کوڕی سەلول و کلکەکانی لەگەڵ ڕیسوایی بە هیلاك چوون و، ئەو ئالأیەی پێغەمبەری خوا و ﷺ یاوەرەکانی بڵنیان کردبۆوە سەرکەوتوو و سەرفراز بوو.

عوبادە بەشداری هەموو جەنگەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی بەدر بگرە تاکو کۆتا جەنگ لە جەنگی تەبوك، هەرکە بانگدەر بانگی جیهادی لێدەدا عوبادە دەیگووت:-

(لَبيّك) بەبێ‌ئەوەی چۆك بە زەوی‌دا بداو، مل کەچی ئارەزووەکانی دونیا بێت.

عوبادە و یاوەرەکان بە تەواوی ژیانی دونیایان هەڵدەسەنگاندو نەیان دەزانی فیزو لەخۆبایی مانای چیەو ئارەزووەکانی دونیا نەیاندەتوانی بگەن بە دڵە پاکەکانیان و، هەموو کات ئەم ئایەتەی سورەتی (الحدید) یان لە ئایەتی (٢٠) دووبارە دەکردەوە، کەوا خوای گەورە دەفەرمووێت:-

﴿ اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ (الحدید ٢٠)

بەڵێ ئەمە بوو دونیا بە تێڕوانینی قارەمانمان عوبادەو هاوشانەکانی لەبەر ئەوە ئەمانە تێیدا زاهید بوون و بێ‌بەش بوون لە خۆشی و ئارەزووەکانی و هەوڵی ئەوەیان دەدا بگەن بە ژیای هەتاهەتایی و خوداش سەرکەوتن و سەرفرازی پێ‌بەخشین.

﴿ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (المجادلة ٢٢)

لەبەر ئەمەو سەبارەت بەم سیفەتە بەرزانە عوبادە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشێ و هەندێك پرسیاری لێ‌دەکات، دەقی ئەم گفتوگۆیەش بەم جۆرە بوو:-

عوبادەی کوڕی صامت دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبووینەوەو پێم گووت:- چ یاوەرێکت لەلا خۆشەویستە تاکو خۆشم بوێت؟

فەرمووی:-

ئەبوبەکر صدیق، پاشان ئیمامی عومەر، پاشان ئیمامی عەلی، پاشان بێ‌دەنگ بوو.

گووتم:- پاشان کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

فەرمووی:- بێجگە لەمانە زوبەیرو، طەلحەو، سەعدو، ئەبو عوبەیدەو، موعاذو، ئەبو طەلحەو، ئەبو ئەیوب و، تۆش ئەی عوبادە، ئەبی کوڕی کەعب و، ئەبو دەرداء و،ئیبن مەسعودو، ئیبن عەوف و، ئیبن عەففان و، پاشان ئەم کۆمەڵە ئازاد کراوە:-

(سەلمان و صوهەیب و بیلال و عەممار).

ئیتر بەم دان هێنانە بە خۆشەویستی عوبادە، عوبادە دەچێتە ڕیزی یاوەرە سەرەتا خۆشەویستەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە چینی هەرەبەرزی یاوەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشا دەکرێت.

عوبادەش بەم مزگێنیە بەختەوەرو سەرفراز دەبێت جارێکیتر دەبێت بە دڵسۆزترین یاوەر بۆ خزمەتی ئایینی خوا.

هەروەها لەبەرئەوەی عوبادە قورئان خوێنێکی بێوێنە دەبێت هەڵیدەبژێرن لەناو یاوەرەکان بۆ ئەوەی بەشداری بکات لە کۆکردنەوەی قورئان...

محمدی کوڕی کەعبی قُرَظِي دەڵێت:- پێنج لە ئەنصارەکان قورئانیان کۆکردەوە:- موعاذ و، عوبادەو، أبيّ و، ئەبو ئەیوب و ، ئەبو دەرداء.

عوبادە تەنها بەمە نەوەستا بەڵکو خۆی ئامادەکرد بۆ فێرکردنی قورئان لە وڵاتی شام، فەلەستینی ئازیزیش بوو بە جێگای بۆ ئەوەی لێی نیشتەجێ بێت... ئەمەش لەم کاتەدا بوو یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ ئەمیری بڕواداران- عومەری کوڕی خەطاب-ی (خوا لێی ڕازی بێت) نووسی:-

(خەڵکی شام زۆرن و پێویستیان بە یەکێکە قورئانیان فێر بکات). ئەویش (موعاذ و، عوبادەو، ئەبو دەرداء)ی بۆ ڕەوانە کردن.

عوبادە لەگەڵ جیهادکردن و فێرکردنی قورئان خێرو صەدەقەی کۆدەکردەوە بەسەر موستەحەقان دابەشی دەکرد، ئەم کارەش پێویستی بە دەستپاکی و سابیقە هەبوو..

عوبادە لە ژێر سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراح (خوا لێی ڕازی بێت) بەشداریان کرد لە فەتحی شام، ئەوەبوو عوبادە لە هەموو جەنگەکان لە ڕیزی پێشەوەی جەنگ دابوو، نەیدەزانی دوو دڵی مانای چیەو بە پەرۆش نەبوو بۆ ئەم ژیانە، لەبەرئەوەی لە قوتابیە ژیرەکانی زانکۆی موحەممەد ﷺ پەروەردە کرابوو، لە ئەنجامی جەنگەکەش ئەوەبوو خاچ پەرستە گاورەکان ورەیان بەرداو بە ڕیسوایی و ڕووزەردی وڵاتی شامیان بەجێهێشت و، هیرقلی ڕۆم لە کۆتاییدا ڕووی لە سوریان کردو گووتی:- ((سلام عليك يا سوريا سلاماً لا لقاء بعده)).

واتە:- سەلامەت لێبێت ئەی سوریا، سەلامێك جارێکیتر پێکمان نەگەیێنێتەوە.

ئەوەبوو سەرکردەی گشتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراح عوبادەی کوڕی صامتی لەسەر حمص کرد بە فەرمانڕەوا بەهۆی ئەو زیرەکی و ئازایەتیەی بینی لە کاتی جەنگ دا... بەڵام ئەوەندەی نەبرد دیسان بانگدەری جیهاد بانگی عوبادەی کردەوەو دەرچوون بۆ فەتحی (انطرطوس)و بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە.

دووبارە سوپای ئیسلامی دەستی کرد بە ڕۆیین بۆ فەتحی میسر بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص لە سەردەمی ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەطاب... پێش

ئەوەی میسر فەتح بکرێت عەمری کوڕی عاص پێویستی بە یارمەتی هەبوو داوای لە ئەمیری بڕواداران کرد، ئەویش چوار هەزار سەربازی بۆ ڕەوانەکردو، پێی گووت:-

((إنّي امددتُكَ باربعة آلاف رجل على كل الفٍ رجل منهم مقامُ الف)).

واتە:- من بەڕاستی چوار هەزا پیاوت بۆ دەنێرم لەسەر هەر هەزارێك: پیاوێك لە شوێنی هەزار).

ئەم چوار کەسەش ئەمانە بوون:- ( زوبەیری کوڕی عەوام، میقدادی کوڕی عەمر، عوبادەی کوڕی صامت، مەسلەمەی کوڕی موخەللەد).

فەتحی میسر بە چەند قۆناغێك دا ڕۆیشت، لێرەدا ئیمامی عومەر ئارامی لێبڕاو کاغەزێکی بۆ فەرماندەی گشتی عەمروی کوڕی عاص نووسی و گووتی:-

((بەڕاستی من سەرم سوڕماوە لە سیستیتان لە فەتحی میسر، ئێوە بۆ دوو ساڵ دەچێت جەنگ دەکەن ئەمەش دەبێت هۆی ئەوە بێت دونیات خۆش ویستبێ هەروەك دوژمنەکانتان خۆشیان ویستووە، خوای گەورە میللەتێکی سەرنەخستووە تەنها بە نیاز پاکی نەبێت، من بەڕاستی چوار کەسم بۆ ڕەوانە کردوویت پێم ڕاگەیاندووی هەر پیاوێك لە شوێنی هەزار پیاوە ئەوەی من زانیبم، ئەمەش دەبێت ئەوانیش گۆڕابن هەروەکو ئێوە گۆڕان، ئەگەر ئەم نامەی منت پێگەیشت ووتار بۆ خەڵك بدەو، هانیان بدە لەسەر جەنگی دوژمنەکانیان، ئارامو نیازیان بە یاد بهێنەوە، ئەم چوارە لە پێشەوەی خەڵك دایان بنێ و، فەرمان بکە بە هەموو خەڵکەکە لە خوا بپارێنەوە داوای سەرکەوتنی لێبکەن بەسەر دوژمنەکانیان)).

پاش تەواوبوونی میسر موسڵمانان ڕوویان لە شاری ئەسکەندەریە کرد بۆ ئەوەی فەتحی بکەن، ئەسکەندەریە قەڵایەکی سەخت بوو (مقوقس) لەم شوێنە بوو ماوەیەك گەمارۆیان دا، تاکو ئەویش فەتح کرا لەسەر دەستی سەرکردەی قارەمان عوبادەی کوڕی صامت.

ئەمەش کورتەیەکە لە گفتوگۆی نێوان عوبادەی کوڕی صامت (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ (مقوقس) گەورەی قبطیەکان لە میسر.

(مقوقس) بۆ عەمری کوڕی عاصی نووسی و گووتی:- (نێردراوێکمان بۆ بنێرن لە خۆتان قسەی لەگەڵ بکەین، گفتوگۆی لەگەڵ دەکەین بەڵکو چاك بێت بۆ ئێمەو ئێوە).

عەمری کوڕی عاص دە کەسی بۆ ڕەوانە کرد، عوبادەی کرد بە ئەمیری ئەو دە کەسەو داوای لێکرد بانگی میللەتەکەی بکات بۆ یەکێك لەم سێیە:-

(ئیسلام، جزیە، یان جەنگ).

هەروەکو گووتمان عوبادە زۆر ڕەشتاڵە بوو، کاتێك سواری کەشتی بوون و چوونە لای (مقوقس)، عوبادە بە پێش کەوت (مقوقس) هەڵیکردە سەر عوبادە بە هۆی زۆر ڕەشتاڵەیی و گووتی:-

(ئەم ڕەشەم لەلا لابەن، یەکێکی‌ترم بۆ بێنن قسەی لەگەڵ بکەم).

هەموويان گووتيان:- عوبادەی کوڕی صامت لە هەموومان ژیرترو زاناترەو خۆی گەورەمانە و لە هەموومان چاکترە و لە هەموومان لە پێشترە، هەموومان لە کۆتاییدا دەگەڕێینەوە بۆ قسەو بیروڕای ئەم. گەورەمان عەمروی کوڕی عاص لەسەر ئێمەی کردووە بە ئەمیرو، فەرمانی پێکردووین لە قسەوبیروڕای ئەو دەرنەچین.

مقوقس گووتی:- (چۆن ڕازی بوون ئەم ڕەشە لە هەمووتان چاکتر بێت؟ بەڵکو پێویست بوو لە خوارەوەی هەمووتان بوایە).

گووتیان:- نەخێر ونەخێر، ئەمەی کەوا دەیبینی هەرچەندە ڕەشە، شوێنی لە هەموومان چاکترەو، لە هەموومان ژیرترو سابیقەی زیاترە...

مقوقس بە عوبادەی گووت:- (وەرە پێش و قسەم بە نەرمی لەگەڵ بکە، من لە ڕەشاتیت دەترسم ، وە ئەگەر قسەت لەسەرم توند بێت، هەیبەتت زیاتر دەبێت).

عوبادە پێش کەوت و شێوەیەکی جەنگی دەرروونی لەگەڵ بەکارهێناو پێی گووت:-

بەڕاستی گوێم لە قسەکانت بوو، هەندێك هاوڕێم جێهێشتووە هەزار پیاون لەمن ڕەشترن، ئەگەر بتبینیایە زیاتر لەمن لێیان دەترسایت هەرچی منم بەرەو پاش گەڕایمەوەو بە تەمەن کەوتووم.

منیش لەگەڵ ئەمەشدا سوپاس بۆ خوا سەد پیاو لە دوژمنەکانم ناترسێنێت ئەگەر بەرەنگارم ببنەوە، هاوڕێکانیشم هەروەك منن، ئەمەش لەبەر ئەوە خەوو خۆراکمان تەنها جیهادە لە ڕێگای خوا بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خوا.

هەروەها جیهادیشمان بۆ دونیا نیەو بۆ ماڵ کۆکردنەوە نیە، پێمان گرنگ نیە یەکێکمان بارێك زێڕی هەبێت یان خاوەنی یەك درهەم بێت لەبەرئەوەی هیوامان تەنها ئەوەیە پاروویەك بخۆین برسیەتمیان لاببات و، شتێکمان هەبێت خۆمانی پێ دابپۆشین.

لەبەرئەوەی خۆشی دونیا بەردەوام نیە، بەڵکو خۆشی و ئیسراحەت لە قیامەتەو، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بەم جۆرە فەرمانی پێکردووین.

کاتێك مقوقس ئەمەی لە عوبادە گوێ لێبوو، بە ئەوانەی دەوروەی خۆی گووت:-

((ئایا لە ژیانتان گوێتان لە قسەی وابووە؟ بەڕاستی شێوەی ترساندمی و، قسەکانی لەلای من بە ترس تر بوون لە شێوەی)).

پاشان مقوقس ڕووی لە عوبادە کردو پێی گووت:-

((ئەی پیاوی چاك، گوێم لە ووتەکانت بوو، ئەوەی باست کرد دەربارەی خۆت و هاوڕێکانت، سوێند دەخۆم ئەوەی گەیشتوونێ تەنها بەمەی باست کردو، سەرکەوتنیشتان تەنها بە هەڵبژاردنی ئاخیرەتتانە بەسەر دوونیا)).

بەڕاستی بەرەنگاری جەنگێك دەبنەوە لە کۆمەڵی ڕۆم ناتوانرێت بیانژمێریت، میللەتێك ناسراون بە ئازایەتی بە توندی گوێ نادەن بەمانەی شەڕیان لەگەڵ دەکەن و

بەرەنگاریان دەبنەوە، ئێمە دەزانین ئێوە ناتوانن بەرگەیان بگرن و توانای ئەوەتان نیە لەبەر بێهێزی و کەمی ژمارەتان و، ئەو ماڵە کەمەی لەبەردەستتانە.

ئێمە وا حەز دەکەین لەگەڵتان ڕێك بکەوین بۆ هەر پیاوێك دوو دینار ببڕینەوەو، بۆ ئەمیرەکانتان سەد دینارو، بۆ خەلیفەتان هەزار دینار، وەریگرن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتتان، پێش ئەوەی تووشی شتێك ببن هێزتان بەرامبەریان نەبێت.

عوبادە پێی گووت:- (ئەی فلان نەخۆت و نە هاوڕێکانت لەخۆبایی نەبن، هەرچی کۆمەڵی ڕۆم و ژمارەو زۆریان پێمان دەترسێنیت و کەوا ئێمە هێزی ئەوانمان نیە، سوێند دەخۆم ئەمە نامانترسێنێت.

ئەگەر ئەوەی کە تۆش دەیڵێیت ڕاست بێت سوێند بە خوا حەز دەکەین جەنگیان لەگەڵ بکەین و، بە پەرۆشین بیانگەینێ، بۆ ئەوەی ئەمە ببێت بە پاساو لەلای خوا کاتێك چووین بۆ خزمەتی.

ئەگەر هەموومان بکوژرێن ڕەزامەندی و بەهەشتەکەی خوا ئاسانتر بەجێ دەگەیەنین.

هیچ شتێکیش لەوەی فەرمانمان پێدەکات جێبەجێ بکەین وەکو ئەمە نیە کەوا ئێستا حەزی پێدەکەین، ئینجا لەم کاتەشدا ئەم دوو سەرکەوتنە بەدەست دەهێنین... یان دەسکەوتی دونیا ئەگەر سەرکەوتین، یان دەسکەوتی قیامەت ئەگەر ئێوە سەرکەوتن، ئەمەش باشترین ئارەزووە کە بیگەینێ.

خوای گەورەش لە قورئانەکەی دەفەرمووێت:-

﴿ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾(البقرة ٢٤٩)

هیچ پیاوێکم نیە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك لە خوا نەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی بەخششی شەهادەتی لە ڕێگای خوا پێببەخشێت.

خەمی ئێمەش تەنها ئەوەیە کە لە پێشمانە هیچ کەسێك لە ئێمە نیە خەمی پاشە خۆی هەبێت، هەموومان ماڵ ئاواییمان لە کەس‌وکارو منداڵی خۆمان کردووە.

هەرچی سەبارەت بە قسەی تۆیە کەوا ئێمە لە ناخۆشی ژیانداین، بەڕاستی ئێمە لە خۆشترین ژیانداین ئەگەر دونیا هەمووی بۆ ئێمە بێت، زیاتر تەنها پێویستیمان بەوە هەیە کەوا لەژێر دەستمانە، ئینجا تەماشای ئەوەی بکەو بۆمانی ئاشکرا بکە، لە نێوان ئێمەو تۆ هیچ شتێکی‌تر نیە تەنها شتێك نەبێت لەم سێ شتە، حەز بە کامەیان دەکەیت هەڵیبژێرەو ئارەزووی خۆشت بە شتی پووچەڵ مەدە، بەمانە ئەمیرمان ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمانی پێکردووین و، ئەمەش پەیمانی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەمەو پێش بۆ ئێمە.

یان ئیسلام قەبوڵ دەکەن بەختەوەر دەبن لە دونیاو قیامەت و جەنگتان لەگەڵ ناکەین، ئازارتان حەڵاڵ ناکەین... وەیان (جزیە) دەدەن و دەکەونە ژێر پارێزگاریمان و

بەرگریتان لێ دەکەین و شەڕ لەگەڵ ئەوە دەکەین شەڕتان لەگەڵ دەکا، بەمانە هەڵدەستین تاکو لەژێر چاودێری ئێمە بن و، لەژێر پەیمانی ئێمە بن.

وە ئەگەر ئیسلام و جزیەتان قەبوڵ نەکرد، نێوانی ئێمەو ئێوە تەنها جەنگ دەبێت، ئینجا خۆتان سەرپشك بن.

مقوقس گووتی:- بە هیچ جۆرێك نابێت ئەمە ببێت.

عوبادە گووتی:- چۆنی حەز دەکەیت ئەمە بۆ خۆت هەڵبژێرە.

مقوقس گووتی:- سیفەتێك بێجگە لەم سیفەتانەم پێشنیار ناکەیت؟ عوبادە دەستی بڵند کردو گووتی:-

(نەخێر سوێند بە پەروەردگاری عەردو ئاسمان و پەروەردگاری هەموو شتێك خەسڵەتێکمان ناوێت لە ئێوە بێجگە لەم خەسڵەتانە، بۆ خۆتان هەڵیبژێرن).

مقوقس بە هاوڕێکانی خۆی گووت:-

(گوێڕایەڵیم بکەن و یەکێك لەم سێ خەسڵەتانە قەبوڵ بکەن... سوێند بە خوا توانای ئەمانەتان نیەو، ئەگەر قەبوڵی نەکەن و ملکەچیان نەبن دەبێت بە ناچاری قەبوڵی بکەن).

مقوقس گووتی:- (هەرچی چوونتانە بۆ ناو ئاینێکی‌تر من فەرمانتان پێ‌ناکەم، بەڵام جەنگ لەگەڵ کردنیان ئێوە بەرگەی ئەمانە ناگرن، ئارامی ئەمانەتان نیەو دەبێت سێ‌یەم قەبوڵ بکەن).

گووتیان:- ئێمە کەواتە هەتاهەتایە دەبینە بەندەی ئەوان.

گووتی:- ((بەڵێ... بەندەی زاڵ لەسەر وڵاتەکەیان، لە ماڵ و منداڵ و کەسوکارتان ئامین دەبن، ئەمەش باشترە لەوەی هەمووتان بکوژرێن و ببن بە بەندە، بکڕێن و بفرۆشێن و لە وڵاتان و هەتاهەتایە ببن بە بەندە بە خۆتان و کەسوکارتان و منداڵتان)).

گووتیان:- ((مردن باشترە بۆ ئێمە...)).

بەم جۆرە ئەسکەندەریە فەتح کراو موسڵمانان سەرکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێناو، چۆنی ویستیان ئەوها سەرکەوتنیان هێنا، خودا گەورەترین فەتحی بۆ هێنان.

بەڵێ ئەوەیە عوبادەی کوڕی صامتی موجاهیدو دلێر، پیاوێك عومەری کوڕی خەطاب لە جێی هەزار پیاوی داناو بەشداری فەتحی میسری پێ‌کردو ڕێککەوتنامەی لەگەڵ مقوقس کرد بەوپەڕی هێزو توانایی، پاشان ئەنجامی ئەم ڕێککەوتنامەی پێشنیاری عەمری کوڕی عاص کردو، پاشان ئاڵای سەرکردایەتی جەنگی وەرگرت و بە یارمەتی خوا ئەسکەندەریەی فەتح کرد..

* * *

هەروەك مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە عوبادەی کوڕی صامت بەشداری فەتحی دورگەی (قبرص)ی کرد لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان (خوا لێیان ڕازی بێت)...

بەڵێ عوبادەی فەرماندەو دلێر بەدڵ رازی بوو ببێت بە سەربازێکی جەنگاوەر لە رێگای خودا لەژێر ئەمیرایەتی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، بەڵام کاتێك لە وڵاتی شام لە ژێر ویلایەتی موعاویە جێگیر ببوون هەڵگەڕایەوە لە موعاویە پاش ئەوەی زانی دوورە لە هەق و ڕاستی، نەیتوانی بێدەنگ بێت بەڵکو عوبادە زۆر بە ڕاشکاوی و(ئازایەتیەوە) بیروڕای خۆی ڕاگەیاند، (لێرەدا تووشی بەڵا هات لە لایەن موعاویەو پیاوەکانی)، بەڵام عوبادە بەردەوام بوو لە ئاشکراکردنی هەق و بێجگە لە خوا لە کەس نەترسا.

لەبەرئەوەی بێدەنگی لە ناهەق لە هەموو سەردەمێکدا زیان بە قازانجی گشتی دەگەیەنێت، ئینجا لێرەدا بێدەنگی لە هەق شەیتانی لاڵە.

عوبادەی هەق بێژ بە ئازایەتیەوە ڕازی نەبوو ئەو مەدح کەرانە بە نیفاق و بوختان مەدحی دەسەڵاتدارەکان بکەن، وای تێدەڕوانی گوناهی زیاترە لە قازانجی.

ڕۆژێکیان عوبادە لە مەجلیسی موعاویە دادەنیشێت وتاردەرێك بەسەر موعاویەدا هەڵدەڵێت.

عوبادە بە مستێك خۆڵ لێی هەڵدەستێت و لە ڕووی وتاردەرەکەی دەکات، موعاویە تووڕە دەبێت... عوبادە پێی دەڵێت:-

تۆ لەگەڵ ئێمە نەبوویت کاتێك موبایەعەمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەقەبە لەسەر گوێڕایەڵی خۆشی و ناخۆشی و بوونی و نەبوونیداو، کێشە نەکەینت لەگەڵ ئەمیرەکان و، لە هەر شوێنێك بین هەق بڵێین و نەترسین لە لۆمەی لۆمەکاران. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:-

(اذا رايتم المدّاحين فاحثوا في وجوههم التُراب).

واتە:- ئەگەر مەدحکەرەکانتان بینی خۆڵیان بەدەم و چاو دابکەن.

بەڕاستی مەدح کاران لەم زەمانەدا یەکجار زۆر بوونەو، بۆ بەرژەوەندی و ماڵی هەموو قسەیەك و کردەوەیەك لە دەمی دەسەڵاتداران بێتە دەرەوە ئەوان زیاتر دەیڕازێننەوە لە پێشیان جوانتری دەکەن، ئینجا ئێمەی بڕواداریش پێویستیمان بەم سەرمەشقە یاوەرە بەڕێزە عوبادەی کوڕی صامت هەیە بۆ ئەنجامدانی کردەوەکانمان.

هەتا دەهات ناکۆکی نێوان عوبادەو موعاویە زیاتر دەبوو تاکو عوبادە بە موعاویەی گووت:-

(من لەگەڵ تۆ نابم لە خاکی شام). ڕۆیشتەوە بۆ مەدینە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەطاب و ئەویش پرسیاری لێکرد.

چیڕای لە تۆ کرد شام بەجێبهێڵیت؟

عوبادە گووتی:- (لە نێوان من و موعاویە هەندێك ڕووداو ڕوویدا) مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە.

ئیمامی عومەر پێی گووت:- (بڕۆوە شوێنی خۆت، خوا خاكێك وێران بكات تۆ و نموونەی تۆی لەناو نەبێت، هیچ فەرمانێكی لەسەر تۆ نیە).

عوبادە زۆرجاران ووتاری دەدا بۆ خەڵكو دەیگووت:-

گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو:-

( سيلي أموركم بعدي رجال يَعرِّفونَكم ما تُنكِرون، ويُنكِرونَ عَلَيكُمْ ما تَعْرِفُون، فَلا طاعةَ لِمَن عَصى، ولا تَضلُوا بربِّكمْ).

واتە:- كاروبارتان لەدوای من دەكەوێتە بەردەستی پیاوانێك شتی وادەكەن ئێوە پێتان رەوانیە، وە ئەوەی ئێوە پێتان رەوایە ئەوان پێیان دروست نیە، گوێرایەڵی بۆ كەسێك نیە بێ‌فەرمانی بكات، رێگای پەروەردگارتان بزر مەكەن پاش ئەوەی موعاویە بێزاری خۆی دەربڕیو سكاڵای كرد لە لای ئیمامی عثمانی كوڕی عەففان گوێڕایەڵ بوو بۆ ئەم هەقەی عوبادە بانگی بۆ دەكات، موعاویە ڕۆژێك بانگی خەڵكی كردو گووتی:-

( أيها الناس اقتبسوا من حديث عبادة، فإنه افقه مني).

واتە:- ئەی خەڵكینە وتەكانی عوبادە وەرگرن، ئەو لەمن شارەزاترە...

یاوەری بەڕێز بێ‌ئەندازە لە فیقهی ئیسلامی چوبووە خوارەوەو كاتەكانی جیهادیش خەریكی نەكردووە لە بەدواكەوتنی ئەحكامە فیقهیەكان، لەبەرئەوە لە یاوەرە ناودارەكانو خاوەن فتوادەرەكان دەژمێردرێت.

ئەوەی جێگای تێبینیە لەوانەیە زۆر لە نەخۆشان و دوو دڵان گومان وا ببەن ئەم یاوەرە بەڕێزانە كێشەی كەسایەتیو مەصلەحی لە نێوان هەبووبێ، بەڵام ئەوەی شایەنی باسە بووتریَ ئەوەیە كێشەی نێوانیان زۆربەی سەبارەت بەم كارانە بووە لەوانەیە ئەم یاوەرەی ببێتە هۆی دروست كردنی ئەم كێشەیە ئاگادار نەبووە بەم ئەحكامە ئیسلامیە وەكو ئەوی‌تر ئاگاداری پێی هەبووە، بەڵام پاش ئەوەی ڕاستی بۆ دەركەوتودڵی ئاوی خواردەوە بە ئایەتو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا یەكسەر بێ سێ‌ودوو دانی بە ڕاستیەكە ناوەو بۆلای خوا گەڕاوەتەوە.

هەڵەو لە بیرچوونەوەش كەس تێیدا مەعصوم نیە بێجگە لە خوای گەورە و بەخشندە بێت..

لەكۆتایی خوای گەورە لە یاوەری هەق بێژ و موجاهید عوبادەی كوڕی صامت ڕازی بێت.

(٩٤)

# حوجــــر كوڕی عەدی

## شـەهیـدێـك بە كۆت و زنجـیـرەوە لـە ژێـر خاك نـرا

ئەگەر ئیمانێكی چەسپاو بۆ بانگی هەق و چینی ڕاستگۆو خواپەرستێكی دڵسۆزانە بۆ پەروەردگاری عەردو ئاسمانەكان و، گەڕان بە دوای ژیانێكی سوپاسگوزەرانەو، ئازایەتیەك و لە ڕیزی پێشەوەی مەیدانی بەرخۆدان و پیاوەتی و، چەسپان لەسەر ڕێبازو بیروباوەڕ تاكو مردن، لە مرۆڤێك هاتەجێ، بە تایبەتی ئەم سیفەتانە كەسایەتی بڕوادار جوانتر دەكەن و وای لێدەكەن شیاو بێت بۆ یادكردنەوە...

جا بەڕاستی گەورەی مرۆڤ و جنۆكە موحەممەد ﷺ كەڵەپیاوی وای لە دوای خۆی بەجێهێشت، دەستی پاكیان درێژكرد بۆ سەرخستنی هەق و جەنگ لەگەڵ ناهەق، هەروەها سوكایەتی بە ئایین و دونیایان قەبوڵ نەكردو، بێدەنگ نەبوون لەسەر زۆرداری و، نەدەخەوتن لەسەر ستەم، بەڵكو بە خوێنی ئاڵیان شوێنەواری دوژمنەكانیان پاك دەكردەوە.

یەكێك لەو یاوەرە موجاهیدانە حوجر كوڕی عەدی كوڕی جەبەل كوڕی عەدی كەنەدی كوفیە (خوا لێی ڕازی بێت)، یەكێك بوو لە هۆزی كندەو گەورە پیاوانی خەڵكی كوفە، لەبەرئەوەی ئەوەندە چاكەخواز و خێرمەند بوو پێیان دەگووت:-
(حُجر الخیر)...

حوجر لەگەڵ براكەی هانئ كوڕی عەدی بوون بە نێرداو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (ذهبی) لە پەڕاوی (العبر) دەڵێت:-

(لحِجْر صُحبَةٌ و وِفادَةٌ وجهاد و عبادة)... واتە:- بۆ حوجر یاوەری و نێردراوی جیهادو عیبادەت هەیە...

هەروەها لە پەڕاوی (البدایة و النهایة) ابن كثیر، باس دەكات كەوا حوجر بووە بە نێردراو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ .... .

هەروەها (هانئ) یەكێك بووە لە خواپەرست و دونیا نەویستەكان و، پیاوێكی زۆر نوێژكەرو ڕۆژیگر بوو، هیچ كاتێك نەبوو بێدەستنوێژ بێ و، هەر كاتێكیش دەستنوێژی هەڵگرتبا ئەوا دوو ڕكات نوێژی دەكرد، هەروەها براكەی حوجریش بەم جۆرە بووە، مێژوو باسی لێوە دەكات كەوا ( الذي أخلقت العبادة وجهه) واتە:- شوێنەواری خواپەرستی لە ڕوخسایەوە دیاربوو...

بەم جۆرە ئەم خێزانە بڕوادارە مسوڵمانە لەسەر خێرو چاكەخوازی بەردەوام بوونە، بێجگە لەمەش حوجر فەرموودەی پێغەمبەری لە چینێك یاوەری بەناوبانگ پێكەیشتووە

وەك ئیمامی عەلی‌و عەممارو شراحیبل كوڕی مرة، پاشان لە ئەویشەوە زۆر كەسی‌تر فەرموودەیان لێ‌ی گێڕاوەتەوە، هەروەها متمانەو ڕاستگۆیی‌و دەستپاكی ئەم پاوەرە لەناو خەڵك ناوبانگی هەبوو... هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا سیفەتی چاكەخوازی گشتی پێوەدیار بوو وای تەماشا دەكرد كەوا پێویستە بەرەكەتی خوا بگات بە هەموو ئادەمیزادێك‌و، دادوەری كۆمەڵایەتیش پێویستە ئاڵای ڕەسەن بێت بۆ كۆمەڵگای ئیسلامی مەزن، هەروەكو لێ‌ی دەگێڕنەوە كەوا موعاویە دەنوسی بۆ-موغەیرەی كوڕی شوعبە- داینابوو بە فەرمانڕەوا لەسەر كوفە ئەوەبوو كۆمەڵێك ماڵی بۆ ڕەوانە دەكات لە- بیت المال-، جا موغەیرە كاروانێكی لە وڵاخ بۆ ڕەوانە دەكات بۆ ئەوەی ماڵەكە بهێنن، حوجر دەچێتە پێش كاروانەكەو سەری وڵاخی پێشەوە دەگرێت‌و، هاوار دەكاو دەڵێت:-

( لا والله، یوفی كُلّ ذي حق حقـه)...

واتە:- سوێند بە خوا ئەمە نابێت تاكو هەموو خاوەن مانێك مافی خۆی نەدرێتێ...

ئەگەر مێژوو باسی ئەوەمان بۆ بكات كەوا حوجر بەشداری جەنگەكانی نەكردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرئەوەی هێزو دەسەڵاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درەنگ گەیشت پێیان‌و، چەند هۆیەك كەوتە نێوان ئەم‌و ئەوان، جا بەڕاستی ئەمەی قەرەبوو كردەوە بە بەشداری لە جەنگی (قادسیە) كەوا دەورێكی دیاری بینی‌و، خوای گەورەش لەم جەنگە موسڵمانانی سەرفراز كردو، دوژمنە ستەمكارەكانیشی ڕیسوا كرد، هەروەها حوجر كوڕی عەدی یەكێك بوو لە قارەمانانی سوپای ئیسلامی موجاهید بۆ وڵاتی شام، حوجر لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوڕێیە چەكدارو موجاهیدەكانی هەڵسان بە گێڕانەوەی گوندی (عـذراء) لە دەست داگیركەرە پەلاماردەرەكان، (عذراء) گوندێكە لە دۆڵی دیمەشق لە هەرێمی (خەولان)و، منارەیەكی لێیە لەم شوێنە حوجر (خوا لێ‌ی ڕازی بێت) شەهید دەكرێ‌و، گۆڕەكەشی هەر لەم شوێنەیە، هەروەكو دەڵێن بە سەركردایەتی ئەو ئەم شوێنە فەتح كراوەو، وە ڕیوایەتیش دەكەن كەوا خۆی بە تەنها (بورجی عذارء)ی فەتح كردووە، لێرەدا ئازایەتی‌و غیرەتی ئەم پیاوە بەدیار دەكەوێت...

* * *

هەروەها حوجر هەردوو جەنگی جەمەل‌و صەفەینی بینیوە لە تەك ئیمامی عەلی كوڕی ابو طالب (خوا لێ‌ی ڕازی بێت)، حوجر بەڕاستی ئیمامی عەلی خۆشدەویست و لایەنگیری دەكردو بەرگری لێ‌دەكردو، دژی ئەوانەش ڕادەوەستا بەرهەڵستیان دەكردو ڕەخنەیان لێ‌ی دەگرت، ئیتر ئیمامی لە پێش چاو زۆر بە گەورە دەزانی، لەبەرئەوەی كوڕە مامی پێغەمبەری خوا ﷺ و، زاوایەتی‌و، قارەمانی جەنگ‌و داستانەو،

بەرگری لە مافێکی وون بووی ئەو دەکاو، پڕە لە سیفەتی ئیمان وتەقوا، لەبەرئەوە حوجر وێنەیەکی بە شیعر بۆ قسەکانی خۆی کێشاوە لە چەند وێنەیەکی بەهادارو بەنرخ دەربارەی ئیمامی عەلی دەڵێ و بەسەریدا هەڵدەڵێت :-

| | |
|---|---|
| یـارب، ســـلّم لَنـا عليـًّا | لا خـــطـلَ الـرأي-ولا غويـّا |
| بل هـاديـاً، موفَقـاً، مهديـا | واحفظـه ربّـي، واحفظ النبيّـا |
| فــيـه فـقـد كــان لـه وليـاً | ثُـم ارتضـــــاه بعـده وصـيا |

ئەو سەرچاوانەی کەوا باسی ئیمامی عەلی دەکەن و ڕیوایەت دەکەن حوجر کوڕی عەدی و چینێك لە خەڵك نەفرەت و بەرائەت لەو خەڵکانە دەکەن کەوا لەژێر گوێڕایەڵی ئیمام دەرچوونە لە شام، کاتێك ئیمامی عەلی قەدەغەی ئەم کارەی لێکردن و حوجرو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون گووتیان:- ئەی ئەمیری بڕواداران ئایا ئێمە لەسەر ڕاستی نین؟

گووتی:- بەڵێ....

حوجرو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون گووتیان:- ئایا ئەوان لەسەر ناهەق نین؟

ئیمام گووتی:- بەڵێ....

حوجرو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون گووتیان:- جا بۆچی لە جوێن دانیان قەدەغەمان دەکەیت؟

ئیمام پێی گووتن:- (حەز ناکەم ئێوە نەفرەت چی و جوێن فرۆش بن، جوێن بدەن و خۆتان لێ بەری بکەن، بەڵام ئەگەر باسی کردەوە خراپەکانیان بکەن، جا دەربارەی سیرەیان بڵێن و، بڵێن ئەمەو ئەمە کردەوەیانە، ئەوە لەم کردەوە باشترەو، بۆتان دەبێتە بەهانە.... ئەگەر هاتوو شوێنی ئەم نەفرەت و بەرائەتە بڵێن:-

(اللهم احقن دمائنا و دمائهم، واصلح ذات بيننا و بينهم، واهدهم من ضلالتهم. واتە:- خودایە نە خوێنی ئەمان و نە خوێنی ئێمەش بڕێ و، نێوان ئێمەو ئەوان چاك بکەیت و، لەم ڕێگا بزربوونە هیدایەتمان بدەیت... تاکو هەق دەناسن و واز لە نەزانی دەهێنن و، دەگەڕێنەوە لە دوژمنداری و ئەو ستەمەی گرتوویانە، ئەمەیان لەلای من خۆشەویسترە و بۆ ئێوە باشترە...).

جا هاوڕێکەی حوجر (عەمری کوڕی الحمق) گووتی- ئەی ئەمیری بڕواداران تۆم خۆشویستووەو موبایەعەم کردوویت نە لەبەر نزیکی تۆ بووەو، نە لەبەر ویستی ماڵ بووەو، نە لەبەر ئەوەە بووە پلەم بەرزبێتەوەو باسم بکرێت، بەڵکو لەبەر ئەم پێنج سیفەتە بووە خۆشم ویستیت:-

بەراستی تۆ کوڕە مامی پێغەمبەری خوایت ﷺ و یەکەم کەس بوویت بڕوات پێی هێناوەو، وە مێردی گەورەی ئافرەتانیت فاطمەی کچی موحەممەد ﷺ و، وە ئەو نەوەیت لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێماویت، وە گەورەترین بەشت هەبووە لە جیهاد لە موهاجیرەکان و، جا ئەگەر داوام لێ بکەیت چیای سەرکەش بگوازمەوەو دەریای بێبن لەبن بهێنم، تەنها بۆ ئەوەی یەك ڕۆژی تۆ بەهێز بکەمو، دوژمنت سووك و ڕیسوا بکەم، وادەڕوانم کە ئەم مافەی تۆ لەسەر منت داناوە هێشتا بە تەواوی بەجێم نەهێناوە...).

جا ئەمیری بڕواداران ئیمامی عەلی پێی گووت:-

اللهم نوّر قلبه بالتقى، واهده الى صراط مستقيم، ليت أن في جندي مائة مثلك... واتە:- خودایە دڵی ڕووناك بکەیتەوە بە لەخواترسان و، هیدایەتی بدەیت بۆ ڕێگای ڕاست، خۆزگە سەد سەربازی وەکو تۆم هەبووایە.

حوجر گووتی:- کەواتە سوێند بە خوا ئەی ئەمیری بڕواداران سەربازەکانت ڕاست دەبوون و ئەوانەی فێڵت لێدەکەن کەم دەبوون.

پاشان حوجر هەڵسایەوەو گووتی:- ئەی ئەمیری بڕواداران، ئێمە ئەوەی جەنگ و شەڕین کەوا جەنگ لەبن دەهێنین و سەرکەوتن بەدەست دەهێنین، بەراستی جەنگ ئێمەی هاڕیوەو ئێمەش ئەومان هاڕیوە، پشتیوانی باوەڕپێکراو هۆزی گەورەو بیروڕای تاقیکراو هێزی پتەوو مل کەچین بۆ فەرمانەکانت، جا ئەگەر ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکەیت ڕوو لە ڕۆژهەڵات دەکەین و، ئەگەر ڕوو لە ڕۆژئاوا بکەیت ڕوو لە ڕۆژئاوا دەکەین، هەر فەرمانێکمان پێ بکەیت جێبەجێی دەکەین.

جا ئیمام گووتی:- ئایا هەموو نەتەوەکەت بیروڕایان وەکو تۆیە؟

حوجر گووتی:- لە چاکە زیاتر هیچم لێیان نەبینیووە، ئەمەش دەستی منە لە جیاتی ئەوان بۆ فەرمانبەریت و گوێڕایەڵی.

جا ئیمام پێی گووت:- چاکە.

بەم جۆرە حوجر هەموو هێزو توانایەکی بەکارهێنا بۆ سەرخستنی ئیمامی عەلی، تاکو ئیمام تامی شەهادەتی چێشت لە ڕێگای پەروەردگاری، هەروەکو بڵێیت ئەم شەهادەتە زیاتر خۆشەویستی بۆ ئیمامی عەلی کوڕی مامی پێغەمبەر پەیداکردو، زیاتر هانیدا بۆ ئەوەی دژی دوژمنەکانی ڕابوەستێت و، لێرەدا حوجر بەرامبەر دوژمنە ستەمکارەکان وەستاو، کاتێك دوژمنەکانی نائومێد بوون لە هەڵگێڕانەوەی حوجر بۆ لای خۆیان، ژمارەیەکی زۆر دەورەیان گرت و دیلیان کردو، بەستایانەوە بە کۆت و زنجیرو، بردیان بۆ لای گەورەکەیان و بۆ ئەوەی تۆڵەی لێبکەنەوە لە دونیای گوناهو زۆرداری.

*          *          *

ڕیوایەت دەکەن کاتێك حوجریان گرتو بردیان لە ڕێگادا کچەکانی بینیانو گریان، بەڵام حوجر زیاتر ئازایەتیو غیرەت گرتیو، پێی گووتن:-

((ڕۆڵەکانم ئەو کەسەی بەرگتان دەکاو خواردنتان دەدا خوای گەورەیەو، ئەو لە دوای من بۆ ئێوە بەجێ دەمێنێو، جا پێویستە لەسەرتان لە خوا بترسنو بیپەرستن، بەڕاستی من لە ڕێگای خوا دەکوژرێمو شەهید دەبم، یان بە گەورەیی بۆ لاتان دەگەڕێمەوە، خوا دابینکەرە بۆ ئێوە)).

بەم جۆرە دەبینی حوجری کوڕی عەدی لەم کاتە ناخۆشو دڵتەزێنە کەوا چاو بڵند نابێت لە بەرامبەریو، پێ ناتوانێت هەنگاو بنێتو، دڵ بۆی دەکەوێتە لەرزە، حوجر (خوا لێی ڕازی بێت) خوای لە یادەو، لەبەرئەوەی کارەکانی تەنها بۆ خودایەو، لە خواترسانیش چاکترین زریێە:-

﴿ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِي يَاأُولِي الأَلْبَابِ ﴾ (البقرة ١٩٧)

بەم جۆرە حوجر بە هیچ جۆرێك سەری شۆڕ نەکرد بۆ ستەمکارانو، نێوچەوانی خۆی دانەنا بۆ ئەوەی تەنازول بکات لەسەر ڕێبازەکەیو، یاخود لە پاش ئەمیرەکەی واز لە جیهاد بهێنێت.

حوجری کوڕی عەدی هەتا ڕۆژی شەهیدبوونی شەوانە خوایەپەرستو، تاکو بۆ شەوی کۆتایی ستەمکارە بێدینەکان کاتێك بەیانیدا پەلاماریان دا بۆ ئەوەی شەهیدی بکەن، جا پێی گووتن:-

وازم لێبهێنن تاکو دەستنوێژ دەشۆمو، دوو ڕکات نوێژ دەکەم، کاتێك دەستی بە نوێژکردن کرد نوێژەکەی بە خێرایی کرد، پاشان پێیانی گووت:-

ئەگەر هاتوو پێیان نەگوتبامایە دەترسێی لە مردن نوێژەکەم درێژ دەکردەوە.

قارەمانمان ڕادەپێچن بۆ جێگای شەهیدکردن، لە دواشی چەند هاوڕێیەکی لەگەڵ دەبێت، حوجر لەم ساتەدا زانی لە کۆتایی ژیانیدایە، ترسێکی مردنی بە مێشکیدا هات هەروەکو سوفیانی ثەوری بە یادی داهات، جا پێیان گووت:-

ئایا ناچی بۆ لای ئەوەی دەیپەرستیو، بۆ ئایینەکەی ئەو ناچیت؟

جا وەڵامی دانەوەو گووتی:- خاکتان بەسەر، بەڕاستی من ڕێگایەك دەگرم پێشتر نەمناسیوەو، دەچم بۆ لای پەروەردگارێك نەمبینیوە.

جارێکیتر لەرز بەرۆکی حوجری گرت، ئەمەیان پێی گوتەوە، جا وەڵامی دانەوە:-

چۆن نەترسمو من گۆڕێکی هەڵکەندراو و کفنێکی ئامادەکراو دەبینمو، شمشێرێکی بە ئاشکرا دەبینم؟

هەروەکو مێژوو بۆمان ڕیوایەت دەکات دەڵێت ئەوانەی حوجرو هاوڕێکانیان شەهید کرد، گۆڕیان بۆ هەڵکەندو کفنیان بۆ ئامادەکردنو، شمشێریان لێهەڵکێشانو، شەهیدیان کردن.

بەم جۆرە قارەمانمان چاوەڕێی مردنی دەکرد بەڵام تکای لە بکوژەکانی کرد بە کۆت و زنجیرەوە کفنی بکەن، ئەوانیش بەڵێنی ئەوەیان پێدا، پاشان بەڵێنەکەیان بەجێگەیاند ترسان لەوەی کۆت و زنجیری لێبکەنەوە هەروەکو بڵێیت لەبەرئەوەی نەوەکو جارێکیتر لە گۆڕ لێیان هەڵسێتەوە و کورسی ستەم و زۆرداریان لێ بهەژێنێت.

حوجر لە ساڵی پەنجای کۆچی نیعمەتی شەهادەتی چەشت، حوجر شەهادەتی هەڵبژارد لە جیاتی ئەوەی بیروڕای خۆی بگۆڕێ و، یان بۆ ئەوەی دونیای لەخۆ ڕازی بکات، بەڵێ ئەگەر خۆشی دونیای هەڵبژاردبایەو، خۆی بدابایە دەستیان و، داوای لێبووردنی بکردبا و بە دوای ڕێگا ناهەقەکەیان بکەوتبا ئەوا هەر لە ژیان دەمایەوە.

قسەی ئیمامی عەلی هاتەجێ کەوا لە ژیانیدا دەیکووت:-

(یا أهل العراق، سیقتل منکم سبعة نفر بعذارء، مثلهم کمثل اهل الأخدود)...واتە:- ئەی خەڵکی عێراق، بەم زوانە حەفت کەس لە ئێوە دەکوژرێ لە (عذارء)، نموونەیان وەکو نموونەی (اهل الأخدود)ـە، واتە ئارام دەگرن لەسەر ئیمانەکەیان و، گیانی خۆیان بە قوربانی ئایینەکەیان دەکەن هەروەک قورئانی پیرۆز ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموویێت:-

﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ۞ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ۞ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۞ قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ ۞ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ۞ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ۞ وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ۞ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ۞ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ۞ إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ ﴾(البروج ١-١٠)

ڕیوایەت دەکەن کەوا حوسەینی کوڕی عەلی کاتێک گوێبیستی شەهیدبوونی حوجر بوو بە کۆتەوە لەخاک نراوە گووتی:-

(ادفنوه في قیوده؟ حجهم والله) واتە:- ئایا بە کۆت و زنجیرەوە نێژرا؟ سوێند بە خوا ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەریان بەرامبەر خوای گەورە.

(عبدالله‌ی کوڕی عومەر) دانیشتبوو و ڕاکشابوو، جا کاتێک گوێبیستی شەهیدبوونی حوجر بوو تاساو لە تاوان هەڵسایەوە، لە هۆڕەی گریانیدا...

هەروەها دایکی بڕواداران عائیشەش دەڵێت:-

(بلغني انه سیقتل بعذراء اناس یغضب الله لهم واهل السماء).

واتە:- بەڕاستی بەم زووانە پێمگەیشتووە کەوا خەڵکانێک لە (عذارء) دەکوژرێن خوا بۆیان تووڕە دەبێ لەگەڵ خەڵکی ئاسمان.

ڕەزای خودا لە حوجری کوڕی عەدی ئەو شەهیدەی کەوا بە کۆت و زنجیرەوە لەژێر خاک نرا.



# رەملەی کچی ئەبوسوفیان

( أم حبیبە ) خواو پێغەمبەری لەسەر هەموو شتێك هەڵبژارد، حەزی نەدەكرد بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی هەروەك مرۆڤ حەز ناكات فڕێ بدرێتە ناو ئاگر

مێژوونوسان

# (٩٥)
# ڕەملـەی کچـی ئەبوسـوفیان

## (أم حبیـبە) خـواو پێغـەمـبەری لەسەر هەموو شـتێك هەڵبـژارد، حەزی نەدەکـرد بگەڕێتـەوە بۆ بێباوەڕی هەروەك مـرۆڤ حەز ناکـات فـڕێ بدرێتــە ناو ئاگــر

(مێژوو نووسان)

هیچ ڕۆژێك ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بەخەیاڵیدا نەدەهات، کە یەکێك لە قوڕەیش جورئەت بکـات لـە فـەرمانی دەربچێـت، یـان سـەرپێچی فەرمانەکـەی بکـات. ئـەو ئـەبو سوفیانەی کە یەکێکە لە گەورەی مەککەیییان و سـەرۆکێکە هـەموو خـەڵکی بە گوێی دەکەن و لە قسـەی دەرناچن.

بەڵام هەرچی ڕەملەی کچی بوو بە (أمّ حبیبـة) ناسرابوو، سـنووری ئـەو گەوراتیـەی باوکی شـکاندو، بـەخۆیو مێردەکـەی (عبیـداللّٰەی کـوڕی جـەحش) بڕوایـان بـە تـاكو تەنهایی خوادو پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ هێناو خوا دەستکردەکانی باوکی بە پوچەڵ دانا.

ئەبوسوفیان بە هـەموو هـێزو تەقەللایەکیـەوە هـەوڵیدا، کـەوا کچەکـەیو زاواکـەی پاشگەز بکاتەوە بۆ ئایینی خۆیو باوكو باپیرانی.

بەڵام لەم کارەی سـەرکەوتوو نەبوو. لەبەرئەوەی ئەو ئیمانو بیروباوەڕەی کە لە دڵو دەروونی(ڕەملـە)دا چەقی بوو زۆر بەهێزترو قـایم تربـوو لـەوەی تۆفـانی ئەبوسـوفیان بتوانێ هەڵیکێشێو هەڕەشەکانی ساردی بکاتەوە لە ئایینەکەی.

ئیتر بەم جۆرە خەمو پەژارە ئەبوسوفیانی داگرتو نەیدەزانی بە چ ڕوێك بچێتە پێش قوڕەیش دوای ئەوەی کە نائومێد بوو لەملکەچ کردنی کچەکەی بۆ ئارەزووەکانی.

ئینجا دەسـتی کـرد بـە بەربەسـت خسـتنە سـەر ڕێگاکـەی لـە پاشـگەزکردنەوەی کچەکەیو زاواکەی لە شوێنکەوتنی موحەممەد ﷺ، وە هـەر کاتێك قوڕەیش زانیـان کـە ئەبوسوفیان زۆر توڕەبووە لە ڕەملەو پیاوەکە، هەستان بە دەست درێژکردنە سەریانو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دانو بێتاقەتیان کردن تا وایان لێهات، ئۆقرەیان لەبەر بڕاو نەیانتوانی لە مەککە ژیان بەرنەسەرو بمێننەوە.

وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای بە موسڵمانان دا کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە بۆ ژێر داڵدەی نەجاشی، ڕەملەی کچی ئەبوسوفیان و کچە بچوکەکەی حبیـبە و پیاوەکەی (عبیداللّٰەی کوڕی جەحش) لە پێشـەنگەکانی ئەم کۆچ کردنە بوون بۆ خودا بۆ پارێزگاری لە ئایینەکەیان.

بەلأم ئەبوسوفیانی کوڕی حەرپ و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون لە سەرانی قورەیش زۆر پێیان ناخۆش بوو ئەو کۆمەڵە موسڵمانە لە دەستیان دەربچن و، تامی خۆشی بچێژن و کۆچ بکەن بۆ وڵاتی حەبەشە.

جا نێردراوەکانی خۆیان نارده لای نەجاشی بۆ هاندانی لەسەریان، داوایان لێکردن بیاندەنەوە دەستیان، وە پێیان گووتن ئەوانە بە خراپە باسی مەسیح و مەریم ی دایکی دەکەن.

ئەوبوو نەجاشی ناردیە دوای ئەمیرەکەیان کە جەعفەری کوڕی أبو طالب بوو پرسیاری لێکرد سەبارەی بەڕاستی ئایینەکەیان و ئەو قسەی دەکەن سەبارەت مەسیح و دایکی، (جەعفەری کوڕی أبو طالب) داوای لێکرد کە گوێ بداتە هەندێك لە قورئان کەوا دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرەکەیان.

ئەویش هەواڵی راستی ئیسلامی تێگەیاندو چەند ئایەتێکی لە سەرەتای سورەتی (مریم) بۆ خوێندەوە، نەجاشی دەستی بە گریان کردو تا ڕیشی تەڕبوو و گووتی:-

ئەوەی بۆ پێغەمبەرەکەتان موحەممەد دابەزیوە، لەگەڵ ئەوەی بۆ عیسای کوڕی مەریم هاتووە هەردوکیان لەیەك سەرچاوەی ڕووناکییەوە هاتوون.

پاشان بڕواهێنانی بە خوای تاك و بێهاوەڵ و پێغەمبەرایەتی موحەممەدی ﷺ ئاشکرا کرد.

هەروەها بڕیاریشیدا پارێزگاری لەو موسڵمانانە بکات کەوا کۆچیان کردووە بۆ خاکەکەی.

(أمّ حبیبة) وا گومانی برد ئیتر لەپاش ئەوە، ڕۆژگار بۆی خۆشبوو لە دەست ئەم هەموو ناخۆشیانەی بەسەریان هاتبوو رزگاری بوو، هەروەها وایزانی ژیانی ناسۆری و ماندوبوون کۆتایی هات کەوتە مێرگی خۆشی و ئیسراحەت...

لە کاتێکدا نەیدەزانی قودرەت و نەخشەی خوای بەدوادا دێت.

بەڕاستی حیکمەت و دانایی خوا وا حەزی کرد(أمّ حبیبة) تاقیبکاتەوە بە جۆرێك هۆش و بیری پیاوی زانا ڕابگرێ، خاوەن بیروهۆشی بکەوێتە لەقەلەق و، پاشان ئەویش ڕزگار بکات لەم بەڵایە گەورەو سەرکەوتووی بکات و لەسەر لووتکەی سەرکەوتن دابنیشێت.

شەوێك لە شەوان (أمّ حبیبة) دەچێتە سەر پێخەفەکەی، خەونێك دەبینێ هەروەك نووستوو خەون دەبینێت کەوامێردەکەی (عبیداللهی کوڕی جەحش) دەکەوێتە ناو دەریایەکی شەپۆلاوی، و چەند تاریکاییەك لەسەر یەکتر دەیپێچنەوە بە خراپترین شێوە...

بە ترس و لەرزەوە لەخەو هەڵدەستێت...

(أمّ حبيبة) حەز ناكان خەونەكە بۆ پیاوەكەی‌و نە غەیری پیاوەكەی بگێڕێتەوە، بەڵام ئەوەندەی نەبرد خەونەكەی هاتەجێ‌و شەوێكی بەسەر ئەو شەوە بەدیۆمە تاكو (عبیداللهی كوڕی جەحش) ، لە ئاینەكەی خۆی هەڵگەڕایەوە بوو بە گاور (خوا پەنامان بدات).

پاشان لەبەردەمی دوكانی عەرەق فرۆشەكان‌و بەسەرخۆشی دەمایەوە بەبێ ئەوەی لێی تێر بخواتەوە.

ئینجا ئەوەبوو (أمّ حبيبة)ی خێزانی لەسەر دوو شتان سەرپشكی كرد یەك لەویتر تاڵتر:-

یان ئەوەتا طەلاق بدرێت...

یان ببێت بە گاور و لە ئایینەكەی پاشگەز بێتەوە.

لێرەدا (أمّ حبيبة) خۆی لە نێوان سێ شتی خێرا بینیەوە:-

-جا یان بە گوێی مێردەكەی بكات كەوا زۆری لێدەكات ببێت بە گاور، بەمەش لە ئایینەكەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە-والعیاذ باللە- دەبێتە ڕیسواو سەرشۆڕی دونیاو سزای ڕۆژی دوایی.

ئەمەش كارێكە نایكات ئەگەر گۆشتی بە شانەی ئاسن لە لەشی بكەنەوە...

-یاخود بگەڕێتەوە ماڵی باوكی لە مەككە كە تا ئەوكاتە قەڵای هاوبەش پەیداكەرانە، بە سەرشۆڕی بژی‌و ئایینەكەی لەدەست بدات.

-یاخود لە وڵاتی حەبەشە بە تەنهایی لە غوربەتی بمێنێتەوە، بەبێ‌كەس‌وكارو نیشتمان‌و بەبێ‌پشتیوان.

ئەو ئافرەتە بڕوادارو خاوەن هەڵوێستە لە كۆتاییدا ڕەزامەندی خوای گەورەی بەسەر هەموو ئەم شتانە هەڵبژارد...

بڕیاریدا لە حەبەشە بمێنێتەوە تاكو خوایَ گەورە دەرگای خێری لێدەكاتەوە...

چاوەڕوانی (أمّ حبيبة) زۆری نەخایاند...

هەر لەو كاتەی ماوەی عیددەی طەلاقی تەواو بوو لە پاشان كاتێكی زۆری نەبرد خوای گەورە دەرگای ڕزگاری لێكردەوە...

ئەوەبوو مزگێنی دەرێك هەردوو باڵە سەوزەكانی لەسەر ئەم ماڵە خەمگینە لێكداو نیشتەوە... لەكاتی بەیانیدا هەواڵهێنەرەكان بە ڕوەكی خۆشەوە لە دەرگایان دا، كاتێك (أمّ حبيبة) دەرگای كردەوە بینی ئەبرەهەی خزمەتكاری تایبەتی نەجاشی‌یە، لە لایەن پادشای حەبەشە هاتووە.

بەڕووخۆشی‌و ئەدەبەوە سڵاوی لێكرد، داوای ڕوخسەتی لێكرد بچێتە ژوورەوەو گووتی:-

پادشا سەلامت لێدەكاو پێت دەڵێت:-

موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خوازبێنیت لێدەکات بۆ خۆی‌و ... هەروەها نامەیەکی بۆ ڕەوانە کردووی‌و کردوویەتی بە دابین کەر (وکیل) کەوا عەقدی بۆ بنووسێت..

جا حەزدەکەی کێ بکەیت بە دابنکەر بیکە.

(اُمّ حبیبة) لە کیف خۆشیان باڵی گرت‌و، هاواری کرد:-

بَشَّرَكِ اللهُ بالخير... بَشَّرَكِ اللهُ بالخير...

واتە:- خوا بە خێر مزگێنیت بداتێ، خوا بە خێر مزگێنیت بداتێ...

ئینجا دەستی بۆ خشڵ‌و، بازنەکانی بردو پێشکەش بە ئەبرەهەی‌کرد.

پاشان ئەوانی‌تریشی (بە خڕخاڵ و گوراەو ئەنگوستیلەی دەستی) لە خۆکردەوە.

لەم ساتەدا ئەگەر ماڵی دونیا هەمووی موڵکی ئەوبا ئەوا لە خۆشیان هەمووی دەبەخشی...

پاشان (اُمّ حبیبة) پێ‌ی گووت:-

من خالیدی کوڕی سەعید کوڕی عاصم دەکەم بە دابینکەری (وکیل)ی خۆم، ئەمە بەڕاستی لە هەموو کەس نزیکترە لەمن...

ئینجا لە کۆشکی نەجاشی لەسەر بەرزاییەکی پڕ دار و سەوزایی کەوا خۆشترین شوێن‌و باخچەی حەبەشە بوو، هەروەها لە یەکێك لە هۆڵە فرەوانەانی ڕازاوە بە نەخش و گڵۆپی ئەم سەردەمە و داپۆشراو بە باشترین ڕایەخ، یاوەرە مەزنەکانی ئەوانەی لە حەبەشە جێنشین بوون تێیدا کۆبوونەوە، لە سەرەوەی هەموویان جەعفەری کوڕی ئەبو طالب و، خالیدی کوڕی سەعید کوڕی عاص‌و عبداللەی کوڕی حوذافەی سەهمی و ئیتر، بۆ ئەوەی عەقدی مارەکردنی (اُمّ حبیبة) ی کچی ئەبو سوفیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببینن.

ئینجا نەجاشی سەرۆکایەتی کۆڕەکەی وەرگرت‌و وتاری بۆ دان‌و گووتی:-

(اَحْمَدُ اللهَ القُدُوس المُؤمِنَ الجبّار، واشْهَدُ ان لا الـه إلاّ الله وانَّ محمـداً عَبـدُهُ وَ رَسولُهُ، وانَّـهُ هُوَ الـذي بُشّـرَ بِهِ عيسى بن مَرَيَم ).

اما بعـد/

بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لەمن کردووە کەوا (اُمّ حبیبة) کچی ئەبو سوفیانی بۆ بخوازم، ئەوەی داوای کرد بۆ بوو، منیش لە جیاتی ئەو چوارسەد دینار زێڕ دەکەمە دیاری بۆ مارەیی..

لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەی...

پاشان دینارەکانی لەژێر دەستی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص هەڵڕشت.

لێرەدا خالید هەڵساو گووتی:-

(الحَمدُلله احمَدُهُ واستعنُهُ، واستَغفِرُهُ ، واتوبُ إليه، واشهَدُ انَّ محمداً عَبدُهُ وَ رَسولُهُ، ارسَلَهُ بدِين الهُدى والحقّ ليُظهِرَهُ على الدّين كُلِهِ ولَو كَرِهَ الكافِرونَ.
اما بعد/
بەڕاستی داواکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەجێو، منی بە وەکیل (امّ حبیبة ی کچی ئەبوسوفیان )م لە پێغەمبەری خوا مارەکرد.
جا خودا ئەم ژن هێنانە لە پێغەمبەرەکەی پیرۆز بکات.
وە پیرۆزباییش لە (امّ حبیبة) بێت بەوەی خوای گەورە ئەم چاکەیەی لەگەڵ دا کرد....
پاشان ماڵەکەی هەڵگرتو بۆ (امّ حبیبة)، یاوەرەکانیش بە هەڵسانی ئەو هەڵسانو ویستیان برۆن.
جا نەجاشی بۆیان هەڵسایەوەو گووتی:-
دانیشن بەڕاستی سوننەتی پێغەمبەران ئەوەیە ئەگەر ژنیان هێنا نان بدەن.
داوایکرد خواردنیان بۆ بێت خواردنیان بۆ هێنان پاشان ڕۆیشتن.
(امّ حبیبة) گووتی:-
کاتێك ماڵەکەم پێگەیشت ناردمە دوای ئەبرەهە ئەو کەسەی مزگێنی پێدامو ئەنجا پەنجا میثقال زێڕم پێداو پێم گووت:-
بەڕاستی ئەوەی پێمدای ئەوە پێمدایت کاتێك مزگێنیت پێدام، من لەم کاتەدا ئەوەندە ماڵم نەبوو...
نۆری پێنەچوو ئەبرەهە ماڵەکی بۆ گێڕامەوەو، جۆرکە بۆنداره خشڵەکەی دەرهێنا کە پێم دابوو، جا بۆی گەڕاندمەوەو گووتی:-
پادشا لە سەری کردوومە هیچ شتێکت لێوەرنەگرمو، فەرمانیشی بە ئافرەتەکانی کردوە، ئەو بۆنەی لە لایتیان هەمووت بۆ بهێنن.
جا بۆ بەیانی هاتەوە بۆنی بخور و عەنبەرو دارێکی زەردی بۆنداری بۆ هێنامو، پاشان پێی گووتم واتە ئەبرەهە بە امّ حبیبة ی گووت:-
من پێویستیەکم بە تۆ هەیە...
جا پێم گووت:- ئەم پێویستیە چییە؟!
گووتی:- من بووم بە موسڵمان، بە دوای ئایینی موحەممەد کەوتوومو جا سەلامی من بە پێغەمبەر ﷺ ڕابگەیەنەو پێی بڵێ من بڕوام بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، هەرگیز ئەمە لەیاد نەکەیت.
ئینجا جیهازی بوکێنی بۆ ئامادەکردم.
پاشان من گوازرامەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

جا کاتێك پـێی گەیشـتم، هـەواڵی مەسـەلەی خوازبێنییەکـەم پێـدا، لەگـەڵ ئـەوەی ئەبرەهە لەگەڵی کردووم‌و پاشان سەلامی ئەوم پێگەیاند.

ئەویش دڵخۆش بوو بەم هەواڵەو فەرمووی:-

وعليها السلامُ ورحمةُ اللهِ وبركاتُهُ .

کاتی گەڕانەوەی (أمّ حبيبة) بۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ ساڵی شـەش یـان حـەوتی کۆچی بوو، ئـەوەبوو لەگـەڵ جەعفەری کوڕی ئەبو طـالب لـە فـەتحی خەیبـەر بـە یەکـەوە گەڕانەوە، جا پێغەمبەر ﷺ دەرهەقیان فەرمووی:-

((بِمـاذا افْـرح؟ بِفَتـحِ خَيـبَر او بِقـدومِ جَعفـَر))؟

واتـە:- نـازانم بـە کامیان کـەیف خۆش بم؟ بـە فـەتحی خەیبـەر یـان بـە هاتنـەوەی جەعفـەر؟

لەم کاتەدا (أمّ حبيبة) تەمەنی پیرۆزی لە چل ساڵی‌دابوو، بـوو بـە دایکی بڕواداران (خوا لـێی ڕازی بێت).

(أمّ حبيبة) (خـوا لـێی ڕازی بێت) ڕەزامـەندی خـوا و پێغەمبەرەکـەی لـە پێشـەوەی هـەموو خۆشـەویسـت‌و بەرژەوەندی‌یـەکی خـۆی دانـا، گـوێی نـەدا بـە هیـچ بـەڵاو کارەسـاتێك تەنها ئەوە نـەبێت ئیمانەکـەی سـاغ‌و سـەلامەت بێت، خـوا و پێغەمبەرەکـەی لەسـەر مـێردو خـزم‌و هـەموو کـەس‌وکارێکی خـۆی هـەڵبژارد، نموونـەیان بـۆ ئـەو هەڵوێستەش ئەوەیە کاتێك باوکی ئەبو سوفیان هاتە لای‌و بۆ مەبەستی ڕێککەوتنامەی حودەیبیـە نـوێ بکاتـەوە بـە هـۆی ئـەوەی هاوبـەش پەیداکـەران ناپاکیـان لەگـەڵ ڕێکەوتنەکەدا کردبوو، بەو نیازەی (أمّ حبيبة) کچـی‌و خـێزانی پێغەمبـەر ﷺ بیکاتـە واسیـطـە و هاندەر لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ... ئەبو سوفیان ویسـتی لەسەر جێگای پێغەمبـەر ﷺ دابنیشـێت، ڕایەخەکـەی لەبـەردەمی لـوول داو، هـەڵیگرت. بـە سەرسوڕمانەوە ئەبوسوفیان پێی گووت:-

- ئەی ڕۆڵەم، نازانم منـت بەسەر ئەم ڕایەخـە هەڵبـژارد...، یاخود ڕایەخەکەت پـێ لەمن باشتر بوو؟

جا ئـەویش بـە نازایـەتی‌و هێمنـی‌و لەسـەرەخۆوە پـێی گـووت: (بـەبێ ئـەوەی لـە پلەوپایەی باوکی بترسێت):-

بەڵکو ئەمە ڕایەخی پێغەمبەری خوایەو ﷺ، تۆش پیاوێکی هاوبەش پەیداکـەری پیسی، حەزم نەکرد لەسەر ڕایەخی پێغەمبەری خوا ﷺ دابنیشیت.

ئەویش پێی گووت:- سوێند بە خوا لە دوای من تووشی خراپە هاتوویت.

ئەویش لە قووڵایی دڵی‌و متمانە لەسەر دەروونی خۆی گووتی:-

- بەڵکو خوا هیدایەتی دام بۆ ئیسلام، تۆ ئەی باوکە گـەورەی قوڕەیشـیت چـۆن ئیسلامت لە دەست خۆت داوە، تۆ بەردێك دەپەرستی نە دەبینێ‌و نە دەبیستێت!!

پاشان بارکی به تووڕەیی و نادڵی ڕۆیشت...

ئینجا بەڕاستی پێویستە هەموو ڕێزو گەورەییەك بدرێت بە دایکی بڕواداران (أمّ حبیبة) (خوا لێی ڕازی بێت) ببێت بە سەرمەشقی ئافرەتانی جیهان.

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پەروەردگار (أمّ حبیبة) لەماڵ نەهاتە دەرەوە تەنها بۆ مەبەستی نوێژو حەج نەبێت، تاکو لەم شارە خۆشەویستەی مەدینەی منەوەرە لە تەمەنی حەفتاکان گیانی پاکی بەرەو فیردەوسی هەرەبەرز بەڕێکەوت، پاش ئەوەی بەرزترین ڕەوشتی ئیسلامی پێشکەش بە کۆمەڵگای ئیسلامی کرد، لە کۆتاییدا لە خوا دەپاڕێینەوە ئافرەتانی ئێمەش (أمّ حبیبة) بکەن بە سەرمەشقی خۆیان لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ژیانیاندا...

پیاوە بڕوادارو لە خوا ترسەکانیان نەگۆڕنەوە بە موڵکی دونیاو ، ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرو پیاوە بڕوادارەکانیان لە سەرەوەی هەموو شتێك بێ و، بارگرانی وا نەخەنە سەر پیاوەکانیان کە لە هێزو توانای ئەوان نەبێت.



# أم سليم كچى مەلحان

چوومە بەهەشت گوێم لە دەنگى
پێیەك بوو، گووتم ئەمە كێيە؟
گووتيان: ئەمە رميصاء كچى مەلحان
دايكى ئەنەسى كوڕى ماليكە
پێغەمبەرى خوا(موسليم ريوايەتى كردووە)

# (٩٦)
# أمّ سُلَيم كچی مەلحـــان

**چـوومە بەهەشـــت گوێـم لە دەنگـی پێیـەك بوو، گووتـم ئەمە كـێیە؟**
**گووتیـان: ئەمـە رمیصاء كچـی مەلـحان دایكی ئەنەسـی كوڕی مالیكـە**
پێغەمبەری خوا(موسلیم ریوایەتی كردووە)

رمیصـاء دایكی سولەیم، كچی مەلحان، كوڕی خالید، كـوڕی حەرام، كوڕی جونـدب، كوڕی عامر، كوڕی عنـم، كوڕی نەجاری، ئەنصاری خەزرەجی‌یە.

خاوەنی سـیفەتی ئافرەتان‌و جوانی‌و زیرەكـی پێـوە دیـار بـوو، لەگـەڵ بیرتیژی‌و، ڕەوشتی جوان‌و ڕەسەنایەتی، تاكو وای لێهات سیفەتە جوان‌و پاكـەكانی لـەناو خـەڵكدا ناوبانگی پەیدا بكات، هەمو زمانێك بە باشی باسی بكات.

لەبەر ئەم سیفەتە بەرزانە كوڕی مامی (مالك كوڕی نضـر) دەست پێشـخەری كردو خواستی، ئەوەبوو ئەنەسی لێ‌بوو.

هەركە ڕووناكی پێغەمبەرایەتی هـەڵات‌و، بانگـهێشی بـۆ یەكتاپەرسـی پەرەیسـەند ئەوەبوو خاوەن بیرە هۆشـمەندەكان و سروشـتە پاك‌و بێگەردەكان پێشبڕكێیان كرد لە هاتنیان بۆ ناو ئیسلام، (أمّ سُلَیم) یەكێك بوو لە ئەنصارە پێشـەنگەكان‌و، گوێی نەدا بە هیچ كۆسپێك كەوا دێتە پێشی لە كۆمەڵگای جاهیلی بتپەرسـتی بەبێ دوو دڵی.

(أمّ سُلَیم) یـەكێك بوو لەوانەی وەسـتا بەرامبـەر پیاوەكـەی مالـك كـاتێك لـە دەرەوە گەڕایـەوەو بـە مسـوڵمان بوونـی زانـی تووڕەیـی نێوچـەوانی گرتبـوو، بـە تووڕەییـەكی بێ‌ئەندازە پێی‌گووت:- ئایا ئایینی خۆت گۆڕیوە؟

ئەوەبوو (ئەنەس)ی فێر دەكرد دەیگووت بڵێ:-

لا الـه الاّ الله. بڵێ:- اشـهَدُ انّ محمـداً رسول الله... ئەویش دەیگووت.

جا باوكی پێی دەگووت:- كوڕەكەم تێك مەدە... ئەویش دەیگووت:-

بەڕاستی من تێكی نادەم بەڵكو فێری دەكەم.

لێرەدا هەسـتی مـالك كـوڕی نضـــر بەرامبــەر ئـەم گوناهانــەو هەڵوێســتی ڕەقــی خێزانەكەی بزواو، بە تایبەتی خۆڕاگری بەرامبەر ئەم بیروڕایە نوێیە ئەوەبوو مالك هیچ چارەیەكی نەما تەنها ئەوە نەبێت دەربچێت لەماڵەوەو كەس بە هەواڵی نەزانێت لە پێش چاوی خێزانەكـی وون ببێت‌و، ئینجا نەگەڕێتـەوە ماڵـەوە تـاكو ئـەو دەگەڕێتـەوە سـەر ئایینی ئەم.

كـاتێك مـالك گوێی لـە قسـەی خێزانەكەی بـوو جـارێكی‌تر وەكـو شـاخ بەرامبـەری وەسـتاو گووتی:-

لا الـه الاّ الله، اشـهَدُ انّ محمـداً رسـول الله...

مالك له ماڵ به تووڕەیی دەرچوو جا دوژمنەکانی پێگەیشتن و کوشتیان.

(امّ سُلَیم) کاتێك به کوشتنی مێردەکەی زانی بڕیاریداو گووتی:- گوناهم لەسەر نەبێ و، ئەنەسی له شیر نەکەمەوه تاکو خۆی واز له شیر دەهێنێ، مێردیش ناکەمەوه تاکو ئەنەس فەرمانم پێدەکاتەوه.

(امّ انس) چووه لای خۆشەویستمان ﷺ زۆر به شەرمەوه، پێشنیاری ئەوەی لێکرد کەوا ڕۆڵەکەی ئەنەس ببێت به خزمەتکار له لای ئەو، پێغەمبەریش ﷺ بەخێرهاتنێکی گەرمی کردو زۆر دڵی پێخۆش بوو.

ئەوەبوو خەڵك ناوی ام انس و ئەنەسی کوڕی مالیکیان دەهێنا زۆر به ڕێزو ئیحترام، ئەبوطەلحە گوێی لەم هەواڵە بوو دڵی پڕ بوو له سەرسوڕمان و خۆشەویستی، چووه پێشەوه بۆ خوازبێنی (امّ سُلَیم)، مارەییەکی زۆری پێشنیار کرد، بەڵام ئەوەبوو (امّ سُلَیم) به عیززەت و بڕوا بەخۆبوونەوه پێشنیارەکەی ڕەت کردەوه و گووتی:-

بەڕاستی نابێت من مێرد به هاوبەش پەیداکەرێك بکەم، ئایا نازانی ئەی ئەبو طەلحە ئەو خوایەی که بەندەیەك له بەندەکانی دروست دەکات، ئەگەر هاتوو ئاگرێکی تێبەر بدەیت ئەوا دەسوتێت.

ئەوەبوو ئەبو طەلحە زۆر دڵتەنگ بوو و ڕۆیشت و بڕوای نەدەکرد تووشی ئەم هەڵوێستە ببێتەوه، بەڵام خۆشەویستیه ڕاستەکەی وای لێکرد بۆ ڕۆژی دواتر بگەڕێتەوه بۆ ئەوەی پێشنیارێکی تری ئاراستە بکات و مارەییەکی زۆرترو ژیانێکی دەوڵەمەندی پێشنیار بکات بۆ ئەوەی ڕازی بێت.

بەڵام (امّ سُلَیم)ی بانگهێژی ژێر-وای دەڕوانیه دونیا هەروەکو بڵێت له بەرامبەر شتێکی زۆر بێنرخەو گوێ نادات به ماڵ و سامان و پلەو پایەو گەنجێتی- وا هەستی دەکرد کەوا قەڵای ئیسلام له دڵیدا بەهێزتره له هەموو خۆشی دونیا، جا به ڕەوشتێکی بەرزەوه گووتی:- پیاوی وەکو تۆ قسەی ڕەت ناکرێتەوه، بەڵام تۆ پیاوێکی بێباوەڕی و من ئافرەتێکی موسڵمانم بۆ من ناشێت مێرد به تۆ بکەم، ئەبو طەلحە گووتی:-

چیت پێشنیار بکەم، ئەویش گووتی:- چیم پێشنیار دەکەیت؟

ئەبو طەلحە گووتی:- زەردو سپی (زێڕو زیو).

(امّ سُلَیم) گووتی:- بەڕاستی من زەردو سپیم ناوێت، ئیسلامم لەتۆ دەوێت، ئەویش گووتی:- کێ ئەمەم بۆ دەکات؟

(امّ سُلَیم) پێی گووت:- پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەت بۆ دەکات... ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر کەوا لەنێو یارەرەکانی دانیشتبوو، جا هەرکە بینی فەرمووی:-

((جاءكم أبو طلحة غرة الاسلام في عينه)) واته:- ئەبو طەلحە هات ڕوناکی ئیسلامی به نێوچەوانیەوه دیاره، جا هاته لای پێغەمبەر و ئەم هەواڵەی پێدا کەوا (امّ سُلَیم) لەگەڵی کردووه بەم جۆره ئەبو طەلحە موسڵمان بوو ئەویش مێردی پێکرد.

ڕیوایەتێکی تر دەڵێت:- (سوێند بە خوا شایەنی ئەوە نیت قسەت ڕەت بکرێتەوە، بەڵام تۆ پیاوێکی بێباوەڕی‌و من ئافرەتێکی موسڵمان، ناشێت بۆ من مێردت پێبکەم، جا ئەگەر موسڵمان بیت ئەمە دەبێتە مارەییم‌و هیچی‌ترت لێ داوا ناکەم).

جا بەڕاستی ئەم ووشانە دڵ‌و دەروونی ئەبو طـەلحـەی لـەرزاندەوە‌و ویژدانـی بـە ئاگـا هێنا، (امّ سُلَیم) توانـی زاڵ بێـت بەسـەر دڵیداو، سەلماندی کەوا ئافـرەت جێگـای گەمەو گاڵتە نی‌یە بەرامبـەر هەڵپەرستان بڕۆخێت، جا ئەم ئافرەتـە ژیـرە توانـی بوونـی خۆی فەرز بکا، جا ئایا لەمە چاکتر هەیە ئافرەتێکی ئاوەها ببێت بە خێزانی؟؟!

پاش ئەوەی هەسـتی بە ڕاستی کرد ئەبو طـەلحـەش لەگەڵ ئەو شـاهێدی هێنـاو شاهێدی (اشـهَدُ لا الـه الاّ الله، اشـهَدُ انّ محمـداً رسـول الله)...

جا (امّ سُلَیم) ئـاوڕی لـە کوڕەکـەی (انـس) دایـەوە بـە دڵنیاییـەوە گووتـی:- کـەوا هیدایەتی ئەبو طـەلحـە لەسەر دەسـتی ئـەو هیدایـەت دراوە:- هەڵسـە ئـەی ئەنـەس ژن بدە بە ئەبو طـەلحـە جا پێیداو مارەییەکەشـی ئیسلام بوو.

بەمە ثابت ئەم قسـەیەی لە (ئەنەس) ڕیوایەت کردووە دەڵێت:-

(فما سـمعت بامراۃٍ قـط کانـت اکـرم مهـراً مـن (امّ سـُلَیم) کـان مهرهـا الاسـلام).

واتـە:- هـەرگیز گوێم لـە بـەڕێزترین مـارەیی ئافرەتێك نـەبووە وەکـو مـارەیی (امّ سـُلَیم) مارەیی ئیسلام بوو.

ئەوەبوو (امّ سُلَیم) لەگەڵ ئەبو طـەلحە ژیانی خێزانداری بردە سەر، لەسەر هـەموو مانایەکی ئیسلامی کەوا ژیانی بەختەوەری‌و هێمنانەی گرتبووە خۆ.

* * *

(امّ سُلَیم) بوو بە نموونەو سەرمەشقێکی ئافرەتی چاك کەوا لەسەر بنچینـەی مـافی مێردایەتی دروست ببوو، هەروەها ئافرەتی بانگهێزو دایکێکی بەسۆزو پەروەردکار.

بەم جۆرە ئەبو طـەلحـە بە قوتابخانەی ئیمان لەسەر دەسـتی ژنێکی بـەڕێزی وەك (امّ سُلَیم)، ئیتـر ئەم پیاوە تێر ئاوی خواردەوە لـە کانیاوی پێغەمبەرایـەتی تـاکو وایلێهات ببێت بە هاوشانی (امّ سُلَیم).

جا بە گوێ بدەینە ئەنـەس (خـوا لـێ‌ی ڕازی بێـت) هـەروەك ڕیوایـەت دەکـات بزانـین چۆن ئەبوطـەلحە لەگەڵ کتابی خوا تێکەڵ دەبێ‌و پابەندی ڕێبازو ڕەوشتەکانی دەبێت، ئەنەس دەڵێت:-

ئـەبو طـەلحـە لـە هـەموو ماڵـە ئەنصاریـەکان دەوڵەمـەندتر بـوو، هـەروەها خۆشەویسـترین مـاڵ‌و شـت لـە لای بیـری-بیـرحا- بـوو کـەوا بەرامبـەر مزگـەوت هەڵکەوتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە ناوی ئاوە شیـرینەکەی دەخواردەوە و، جا کاتێك ئایەت دابەزی:

﴿ لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ﴾
(آل عمران ٩٢)

واته:- ناگەونە پلەی چاکەکاران تا ئەو شتەی لاتان زۆر خۆشەویستە نەیبەخشن، ئەبو طـەلحە هاتە لای پێغەمبەری خـوا ﷺ و گووتـی:- خـوای گـەورە لـە کتابەکـەی دەفەرموێ:-

﴿ لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ﴾
(آل عمران ٩٢)

بەڕاستی خۆشەویسترین ماڵ لەلام (بیـرحا)یەو منیش لە ڕێگای خوا دەیبەخشم، تکاکارم خوای گەورە لێم قبوڵ بکات، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنی دادەنـێی دایبنێ:-

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

(بـخٍ بـخٍ ذلـك مـال رابـح، وذلـك مـال رابـح، قد سمعـت ما قلـت فيها وإنـي أرى أن يجعلها في الأقربيـن).

واته:- ئای لەبەر، ئـای لەبەر ئەم ماڵـە قازانجەو، ئەم ماڵـە قازانجە، بەڕاستی گوێم لـێبوو چیـت گووت دەربارەی‌و من بەڕاستی وای دەبینم لە ماڵـە نزیکـەکان دابەشـی بکەیت ئەبو طـەلحە بەسەر خزم‌و نزیکەکانی خۆی دابەشی‌کرد.

ئەوەبوو خوای گەورە دڵی ئەم ژن‌ومێردەی ڕۆشـن کرد بە کوڕێك کەوا زۆر پـێی کەیف خۆش بوون‌و هـەموو کـات چاویـان لـە هەڵس‌وکـەوت‌و جوڵانـەوەی ئـەم منداڵـە چاوگەشـە بـوو، ناویـان لـێنابوو (ابـا عمیـر). ئـەم منداڵـە باڵندەیـەکی هـەبوو یـاری پێدەکـرد، جـا ئـەم باڵندەیـە مـردو زۆر بـۆی گریـا، پێغەمبـەر ﷺ بـەلایدا تێپـەڕی بـۆ دڵخۆشـیی پـێی فەرموو:-

((یا أبا عمیر ما فعل النُغیرُ)) واته:- ئەی ابا عمیر چۆلەکە چی‌بەسەر هات.

خوای گـەورە ئـەم دایك‌و باوکـەی تـاقیکردەوە بەم منداڵـە خوێنشـیرینە، ابـو عمیـر نەخۆش دەکەوێت‌و ئەم دایك‌و باوکە پێیوە خەریك دەبن، خووی باوکی وابوو هەرکە لە بازاڕ دەگەڕایەوە یەکەم جار ڕووی لە ماڵەکەی دەکردو هـەواڵی تەندروستی منداڵەکـەی دەپرسی‌و دڵی دانەدەکەوت تاکو نەیدیبایە.

جارێکیان ئەبو طـەلحە دەڕوا بۆ مزگەوت، منداڵەکە گیانی دەردەچێ... بەڵام دیاکی ئارامگرو بڕوادار بەم تاقیکردنەوەیە ڕازی دەبێ‌و، منداڵەکە لە شوێنێك لە ماڵەکە درێژ دەکاو شتێکی پێدادەداو بەردەوام دەڵێ:-

(إنا لله و إنا راجعون)... بە کەس کارەکەی دەڵێت:-

ئەمە لەلای ئەبو طـەلحە مەدرکێنن تاکو خۆم پێی دەڵێم.

کـاتێك ئـەبو طـەلحـە دەگەڕێتـەوە (امّ سُلَیم) فرمێسـکی بـەزەیی دەسـڕێتەوە لـە چاوەکانی‌دا خۆی ئامادە دەکات بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەی پیاوەکـەی لـێی

دەكات دەربارەی كوڕەكی، ئەبو طـەلحـە ڕوی لە خێزانەكەی كردو گووتـی:- كوڕەكەم چۆنە؟ ئەویش پێ ی گووت:- باشـتـرە لە جاران.

جا وادەزانێ ابا عمیری كوڕی لە نەخۆشـی‌یەكەی چاك بۆتەوە، بێ‌ئاگا لەوەی خوای پەروەردگار ئەمانەتەكەی لێ‌سـەندۆتەوە. زۆر كـەیف خۆش دەبێت‌و لە منداڵەكە نزیك نابێتەوە بۆ ئەوەی لە خەو هەڵنەسـتێت، پاشان (امّ سُلَیم) لـێ ی نزیك بۆوەو خواردنـی عیشـای ئامـادەكردو، كـە خـواردان‌و خواردنـەوە تـەواو بـوو پاشـان هـەروەكو كـاری ژنۆمێردایەتی خۆی بە جوانتـرین شـێوە خۆی بـۆ ڕازانـدەوە، جوانتـریـن جل‌وبەرگـی لەبەركردو خۆی بۆن خۆش كرد و ئینجا لە یەكتر نزیك بوونەوە.

جا كاتێك بینی بەڕاستی پیاوەكی تێری خواردو لـێ ی نزیك بۆوەو، هێمنی كردەوە لەسەر كوڕەكەی‌و سـوپاسی خوای كرد لەسـەر ئەوەی هـەواڵی دڵتـەزێنی نەدایێ وازی لێهێنا تاكو خەوی لـێ‌كەوت.

جا كاتێك بووە كۆتایی شـەو (امّ سُلَیم) پـێ ی گووت:-

ئەی ئـەبو طـەلحـە، ئەگـەر بینیت یـەكێك ڕاسپاردەیەكی لـەلای مـاڵێك دانـابێت جـا داوای ڕاسپاردەكە بكەنەوە ئایا بۆیان هەیە پێیان نەدەنەوە؟

گووتی:- نەخێر، نابێت.

(امّ سُلَیم) پـێ ی گووت:- ئایـا چـی دەڵێـت ئەگـەر لـە دڵیـان گـران بێـت داوای ئـەم ڕاسپاردەیە بكەنەوە، پاش ئەوەی سوودیشیان لێ‌وەرگرتبێت.

گووتی:- ڕاستیان نەكردووە.

(امّ سـُلَیم) گووتـی:- بەڕاسـتی كوڕەكـەت ڕاسـپاردە بـوو لەلایـەن خـواو بـۆ خـۆی بردەوە، پاداشت لە لای خوا وەربگرەوە، ئەبو طـەلحـە خۆی پێ‌نەگیراو بە تووڕەییەوە گووتی:-

وازت لێنەهێنام تاكو كەیف‌و بەزمم كرد پاشان هەواڵی كوڕەكەم دەدەیتێ؟!!

جا پاشان تۆزێك هێمن بۆوە بە خۆیدا هاتـەوەو سوپاس‌و ستایشـی خـوای كردو، دڵی‌دامركایەوە.

كاتێك بەیانی كردەوە ئەم بەیانی‌یە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی پێدا كەوا ڕوویداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ی فەرموو:-

((بارك الله لكما في ليلتكما)) واتە- خودا ئەم شـەوەتان پیرۆز بكات.

جا لـەم شـەوە سـكی بوو بە عبدالله ی كوڕی ئـەبو طـەلحـە، وە ئـەو كاتـەی كـەوا عبدالله لە دایك بوو بە ئەنەسی كوڕی مالك منداڵەكەیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شـەو (امّ سُلَیم) منداڵی بووە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك خورمای لە دەمی پیـرۆزی خۆی تـەڕكردو پاشـان لـەدەمی منداڵەكـەی ناو جا ئەنەس گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ناوی لـێ‌بنێ... فەرمووی:- ناوی عبدالله بێت.

(عبابە) یەکێك بوو لە پیاوەکانی ئەم باسەو دەڵێت جا بەڕاستی بینیم ئەم کوڕە حەوت نەوەی لێبوو و هەر هەموویان شارەزا بوون لە قورئان.

هەروەها یەکێك لە کردەوە چاکەکانی ئەم ئافرەتە بەڕێزەو پیاوە بڕوادارە ئەوەبوو (خوا لێی ڕازی بێت) قورئانی دەرهەقیان ناردە خوارەوە بۆ ئەوەی خەڵك پەندیان لێوەرگرن.

ئەبو هریرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:-

(پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گووتی:- ماندوو برسیم، جا ناردیە لای خێزانێکی بۆ ئەوەی خواردنێك پەیدا بکات بۆ ئەم میوانە، بەڵام گووتی:- بەو خوایەی تۆی ناردووە بە هەق، هیچمان لا نیە جگە لە ئاو نەبێت، پاشان ناردیە لای خێزانێکی‌تر، ئەویش وەکو ئەوی‌تر وەڵامی دایەوە، ئینجا ناردیە لای ئەوانی‌تر ئەوانیش هەمان وەڵامیان هەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

((مَن یضیفه یرحمهُ الله))... واتە:- کێ هەیە میوانداری بکات خوا رەحمی پێبکات، جا پیاوێك لە ئەنصارەکان هەڵسایەو پێیان دەگووت:- ئەبو طەلحە، جا گووتی:- من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەبوو لەگەڵ خۆی بردیەوە ماڵەوە بە خێزانەکەی (امّ سُلَیم)ی گووت:- ئایا هیچت لەلا هەیە؟

گووتی:- نەخێر، تەنها خواردنی منداڵەکانم نەبێت، ئەویش گووتی:-

بەشتێك بیانخافڵێنە، تا دەخەون، جا ئەگەر میوانەکەمان هاتە ژوورەوە وا بزانێت ئێمەش خواردن دەخۆین، کاتێك ئەو خواردنەکەی بە دەستەوە گرت بڕۆ چراکە بکوژێنەوە، وا هەست بکات کە چاکی دەکەیتەوە، (امّ سُلَیم)ش ئەم کارەی کرد، جا دانیشتن میوانەکە دەستی بەخواردن کردو، تا تێری خوارد ئینجا خەوتن، بەیانی ئەبو طەلحە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

((لقد عجب الله-أو ضحك الله-من فلان و فلانة).

واتە:- خوا سەرسوڕما- یان پێکەنی- بە فڵان پیاوو فڵانە ئافرەت.

لە ڕیوایەتێکی‌تر دەڵێت:- ((قد عجب الله صنیعکما بضیفکما اللیلة)).

واتە:- بەڕاستی خوا سەرسوڕما بەم کردەوەتان کەوا بە شەو بە میوانەکەتان کرد.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:-

﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾ (الحشر ٩)

ئەبو طەلحە نەیتوانی لە خۆشیان خۆی ڕابگرێ، بۆیە بە خێرایی ڕۆیشتەوە ئەم مزگێنیەی بە خێزانەکەی‌دا کەوا خوای گەورە دەرهەقیان ئایەتی هێناوەتە خوارەوە.

(امّ سُلَیم) بەمە وازی نەهێنا تەنها دەوری هەبێت لە بانگێشی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی بەشداری جیهاد بکات وەکو پاڵەوانێك...ئەوەبوو لە جەنگی حونەین دەورێکی باڵای گێڕا لە هاندانی موجاهیدانو

تیمارکردنی بریندارەکان، بەڵکو ئامادەبوو لە بەرگریکردن و ڕووبەڕوو بوونەوە ئەو کەسەی نزیکی بێتەوە... موسلیم لە صەحیحەکەی و ئیبن سەعد لە (الطبقات) بە سەنەدێکی صەحیح دەگێڕنەوە:-

(أمّ سُلَیم) خەنجەرێکی هەڵگرتبوو لە ڕۆژی حونەین جا ئەبو طەلحە گووتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هاوبەش پەیداکەرێك لێم نزیك بێتەوە بەمە زگی هەڵدەدڕم.

پێغەمبەری خوا ﷺ جیهادی دەکرد (أمّ سُلَیم)و چەند ئافرەتێکی ئەنصاری کاتێك غەزا دەستی پێدەکرد ئاویان دەگێڕاو بریندارییان تیمار دەکرد.

بەم جۆرە (أمّ سُلَیم) پلەیەکی تایبەتی هەبوو لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەچووە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵی (أمّ سُلَیم) نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ مژگێنی داوەتێ بە بەهەشت هەروەك دەفەرمووێت:-

((دخلت الجنّة فسمعت خشفةً، فَقُلْتُ مَن هذا، قالوا هذه الرميصاء بنت ملحان أم انس بن مالك)) موسلیم ریوایەتی کردووە...

واتە:- چوومە بەهەشت گوێم لە دەنگی پێیەك بوو و گووتم ئەمە کێیە؟ گووتیان:- ئەمە ڕمیصاء کچی مەلحان دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە.

جا بەهەشتت لێ پیرۆز بێت (أمّ سُلَیم) بەڕاستی تۆ موستەحەقی ئەم شوێنەی، تۆ ئافرەتێکی چالاك و ئامۆژگاریکەر و بانگخوازو زیرەك و سەرمەشقی ئافرەتانی موسڵمانان بوویت، بەڕاستی کوڕەکەت خستە مەزنترین قوتابخانە کە دونیا بە خۆیناسیوە ئەم قوتابخانەیش قوتابخانەی پێغەمبەر بوو کاتێك تەمەنی گەیشتە دەساڵان.... پاشان کوڕەکەت بوو مامۆستایەك لە مامۆستایانی ئیسلام... جا لێت پیرۆز بێت...

لە کۆتاییدا لەخوا دەپاڕێینەوە خوشکانی ئێمەش دەرس و پەند لەم ئافرەتە یاوەرە بەڕێزە وەربگرن و بیکەن بە سەرمەشقی خۆیان لە هەموو کارێکیان لە دەرەوە و ماڵەوە.

لە خواش دەپاڕێینەوە لە گوناهەکانمان خۆش بێت و شادمان بکات بەم یاوەرە بەڕێزانە و لە ئاوی کەوسەر بە دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئاوی کەوسەر بخۆینەوە... آمین.

(٩٧)

## ( عوف و معاذ و معوّذ ) كوڕەكانی عفراء

## بكوژەكانی فیرعەونی ئومەت

لە لایەن هەندێك خەڵكەوە جۆرێك لە داب‌ونەریت هەیە كەوا ئەگەر بیانەوێت یەكێك سووك بكەن بە چاوی كەم تەماشای بكەن و لە پلەوپایەی كەم بكەنەوە، ئەوا بەناوی دایكی بانگی دەكەن و گاڵتەی پێدەكەن ئەمەش بەوەی كەوا ئەم پیاوە كوڕی دایكیەتی یان پەروەردەی دایكیەتی، لەگەڵ ئەوەی هەموو كەسێك لە ئێمە گەورەو بچووك كوڕی ئافرەتێكین و، ئافرەتێك پەروەردەی كردووین، جا بەڕاستی لە هەندێك جێگادا ئافرەتانی وا هەن بەهۆی زیرەكی و ژیری‌وبڕواداری‌و بڕوا بە خۆیان لە زۆر لە پیاوان باشترن! بەڵێ ئەم جۆرە ئافرەتانە بە ئیسلام پەروەدە بوون، دەرچووی قوتابخانەی موحەممەدن ﷺ.

پیاوی وایان پەروەردە كردووە بەڕاستی كەڵەپیاو بن و مێژوو هەتاهەتایە شانازیان پێوە بكاو لە لاپەڕە زێڕینەكانی خۆی ناویان تۆمار دەكات.

یەكێك لەم ئافرەتانە( عفراء كچی عُبَید كوڕی ثَعْلَبـەیە، لە نەوەی مالیكی كوڕی نەجارە، خوای گەورە سێ كوڕی پێبەخشی لە پیاوەكەی كە (حارث كوڕی سەواد كوڕی مالیك كوڕی غنم كوڕی مالیك كوڕی نەجار) ئەم كوڕانەش بریتین لە (عوف و معاذو معوذ).

ئەوەی جێگای سەرنج و سەرسوڕمانە هەر یەكێك لەم برایانە كاتێك لە پەڕاوەكانی سیرەو مێژوو ناویان دێت پێیان دەڵێن:- ئەمە كوڕی (عفراء)ە، ئەگەر بە كۆمەڵ ناویان بێت دەڵێن:- ئەمانە كوڕی (عفراء)ن، بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنا بین لە ژیانی ئەو قارەمانانە دەتوانین سود لە پەڕتوكی (الدر في اختصار المغزي والسير) دانراوی امام حافظ یوسف كوڕی عبدالبری نمری بكەیت، بۆ ئەوەی چاوت بكەوێت بە باسی ئەم برایانەو، هەر یەكێك لەمانە بناسێت.

عەوفی كوڕی عفراء یەكێكە لەم شەش كەسانەی خەڵكی مەدینە، موبایەعەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیعەی عەقەبی یەكەمو، یەكێك بوو لەم دوازدە پیاوە موبایەعەدەرەكان دا لە بەیعەی عەقەبەی دووەم، لەم بەیعەیەدا موعاذی براشی لەگەڵدا بوو، پاشان هەر سێ برا عوف و معاذ و معوّذ بەشداریان كرد لە موبایەعەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیعەی عەقەبەی سێیەم، ئەمانەش لەگەڵ ئەم حەفتا پیاوە بوون لە ئەنصار كەوا پەروەردگار كردوونی بە پێشەنگی بڕواداران لە مەدینەی منەوەرە.

موعاذی كوڕی عفراء چاودێری‌و سەرپەرشتی كاروباری ئەم دوو منداڵە بێباوكەی لە ئەستۆ گرتبوو كەوا خاوەنی دوو جۆخینی خورما بوون لە مەدینە، ئەم شوێنە بوو

کەوا لە کاتی کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی لەم شوێنە پاڵکەوت، پێغەمبەر ﷺ ئەم شوێنەی کڕی و مزگەوتێکی لەسەر دروست کرد، ئەو مزگەوتەی لەو سەردەمەدا بوو بە سەرکردایەتی دەوڵەتی ئیسلام .

پاش کۆچکردن پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان معاذی کوڕی عفراء و عومەری کوڕی خەطاب، چۆن ئەو برایەتیە گەشە نەکات و پتەوتر نابێت لە کاتێکدا لە نێوان موهاجیرو ئەنصار بێ، وە ژمارەی ئەوانەی کە بوون بە برا لە ئەنصاریەکان پەنجا کەس و لە موهاجیرەکان پەنجا کەس، ئەم برایەتیەش لەسەر بنچینەی هەق و یەکسانی و میرات بوو، بەم شێوەیە مانەوە تاکو بە ئایەتی خوا سڕایەوە کەوا دەفەرمووێت:-

﴿ وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾
(الانفال ٧٥)

پێش ئەمە برایەتی تەنها لە نێوان موهاجیرەکان بوو لەسەر هەق و یەکسانی بەبێ میرات لە یەکتر گرتن.

ئینجا جەنگی بەدری گەورە هاتە پێشەوە...

ئافرەتی بڕواداری موسڵمان شێرەژنی ئیسلام (عفراء) بە خۆ و سێ کوڕەکەی هاتنە مەیدان و گۆڕەپانی جیهاد لە سەرەتای جەنگەکە سێ کەس لە پاڵەوانی بێباوەڕان سەری مەیدانیان گرت، سێ کەسیان هاتە مەیدان و داوایان کرد بێنە بەرامبەریان، جا کوڕەکانی (عفراء) بۆی دەرچوون، هەروەها دەڵێن دووانیان دەرچوون، سێیەمیان عبدالله ی کوڕی ڕەواحە بوو، خوا لە هەموویان ڕازی بێت، بێباوەڕەکان ئەم دەرچوونەیان قەبوڵ نەکردو، بەڵکو داوایان کرد زۆرانبازی لەگەڵ پیاوە موهاجیرەکان بکەن.

هەروەك ڕیوایەت کراوە بێباوەڕکان بەم سێ کەسەیان گووت:- ئێوە کێن؟ وەڵامیان دانەوە:- ئێمە کۆمەڵێکین لە ئەنصار، سێ بێباوەڕ پاڵەوانەکان پێیان گووتن:- ئێمە پێویستیمان بە ئێوە نیە، ئێوە هاوشانی ئێمە نین، ئێمە هاوشانی میللەتەکەی خۆمانمان دەوێت.

ئەنجامەکەشی بەوە گەیشت سێ موهاجیریان بۆ دەرچوون، هەر سێ بێباوەڕیان بەرەو دۆزەخ بردو بە هیلاك چوون.

جەنگی بەدر گەرم بوو، حیلەی ئەسپ و شەقەشەقی شمشێرو تەکبیری الله اکبر و تۆز بەری ئاسمانی گرتبوو، موسڵمانان نموونەیەکی بێوێنەیان لە ئازایەتی و خۆڕاگری و نیشان دا، هەروەك عبدالرحمن کوڕی عەوف یادگاری ڕۆژی بەدرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە هەردوو پەڕاوە صەحیحەکان هاتووە:-

دەڵێ:- (من لە ڕۆژی بەدر لە ڕیزی جیهاد وەستابووم، تەماشای ئەولاو ئەملای خۆمم دەکرد، بینیم دوو مێردمنداڵی ئەنصاری (کە بە تەمەن تازە پێڕادەگەیشتن) لە

لای ڕاستو چەپم وەستاون، کەچی من حەزم دەکرد لە نێوان دوو کەسی بەهێز بومایە، یەکێکیان هاتە بن گوێمو گووتی:-

ئەی مامە، ئەبوجەهل دەناسی؟ گووتم:- بەڵێ کوڕم.

گووتی:- دەی توخوا پێم نیشان بدە.

گووتم:- چ کارت پێیەتی ئەی برازا؟

گووتی:- زانیومەو بیستوومە جوێنی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، جا بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ببینم نابێت لە دەستم ڕزگاری ببێ، یاخود دەمکوژێ.

ئەوەی تریش لەولاوە هاتە پێشەوەو هەمان قسەی پێگووتم.

عبدالرحمن کوڕی عەوف چاوی گێڕا تا ئەبوجەهلی بینی، ئینجا بەم دوو مێردمنداڵەی نیشان دا، ئەوانیش بە خێرایی هێرشیان بۆ برد، هەردوو شمشێر کەوتنە سەری، لێیان داو خستیان، ئەبوجەهل لە سەرەمەرگ دابوو، پاشان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەواڵی ئەوەیان پێدا کە کردوویانە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون:- کامەتان کوشتتان؟

هەردووکیان گووتیان:- من کوشتوومە.

پێغەمبەر ﷺ هێمنی کردنەوەو پێی گووتن:- ئایا شمشێرەکانتان پاك کردۆتەوە؟

گووتیان:- نەخێر .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای شمشێرەکانی کردوون بینی خوێن لە هەردوو شمشێرەکە دەتکێ و پاشان فەرمووی:- هەردوکتان کوشتوتانە!

ئەم دوو مێردمنداڵەش عوفو معاذ کوڕەکانی (عفراء) بوون، لە سەرچاوەیەکی تریش بوخاری ریوایەت دەکات دەڵێن عبدالرحمن کوڕی عەوف دەڵێت:-

من لە ڕیزی جەنگاوەران بووم ڕۆژی بەدر، ئاوڕم دایەوە لە ڕاستو چەپی خۆم دوو گەنجی تازە پێگەیشتووم بینی، هەروەکو بڵێیت لە خۆڕاگریان دڵنیا بووم، یەکێکیان لە پەنهانی بەمنی گووت:-

ئەی مامە، ئەبوجەهلم پێنیشان بدە.

گووتم:- ئەی برازام، چ کارت پێیەتی؟

گووتی:- پەیمانم داوە بەخودا ئەگەر بینینم، یان دەیکوژم یان دەمکوژێت.

ئەویتریشیان بە پەنهانیەوە وەکو ئەویتر پێگووتم:- پاش ئەمە بەڕاستی حەزم لە نێوانیان کرد، جا ئەبوجەهلم پێنیشان دان، وەکو دوو هەڵۆ بۆی دەرچوون تاکو لێیان دا ئەمانەش دوو کوڕەکەی (عفراء) بوون.

لە هەردوو صەحیحەکان باس دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ پاش جەنگی بەدر فەرمووی:-

کێ دەڕوا بزانێت ئەبوجەهل چی بەسەر هاتووە؟

ئیبـن مەسـعود گووتی:-

من ئەی پێغەمبەری خوا ، بۆی دەرچوو بینی هەردوو کوڕەکەی (عفراء) لێیان دابوو تاکو ساردیان کردبۆوەو لە سەرەمەرگ دابوو، ئەوەبوو ئەویش بە تەواوی هەناسـەی تەواو کردو بەرەو دۆزەخ بەڕێ‌ی کرد.

هەروەها ڕیوایەت دەکەن کەوا موعاذی کوڕی عفراء کاتێك لە ئەبوجەهلی‌دا کوڕەکەی ئەبوجـەهل بـەرەو ڕووی هـاتوو بـە شمشـێرەکەی لـە دەسـتی موعـاذی داو، بـەڵام بـە پیستەکەیەوە دەستی بە لەشی مابۆوە، جا ئارامی گرت‌و، دەستە بڕایەکەی خستە بن پێ‌ی خۆی‌و لە لەشی خۆی پچڕاندی و پاشان لە جیهاد کردن هەر بەردەوام بوو.

هەردوو کوڕەکەی (عفراء)ی بڕوادار جیهادیان کرد لەم جەنگەداو کۆڵیان نەداو تاکو هـەردووکیان نیعمـەتی شـەهادەتیان لـە پێنـاوی خـوادا پێ‌بەخشـرا، جا بـەم کارەیـان مەزنـترین سـەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەندێك ڕیوایـەت دەکـەن دەڵێن (عفـراء) حـەوت کوڕی خۆی هێنابوو بۆ جەنگی بێ‌باوەڕان، لەبەرئـەوەی (عفـراء) (خـوا لـێ‌ی ڕازی بێـت) دوو مێردی کردبوو، کوڕەکانی هەردوو مێردی لەگەڵ خۆی هێنـابوو، ئەم حـەوت کوڕە هـەموویان جـەنگی بـەدریان بینـی، لەوانـە سـێ‌یانیان لـە حـارث کـوڕی ڕەفاعـە بـوون ئەوانیش (معوذ و معاذ و عوف) بوون، وە چوارەکـەی تریـان لـە بەکر کوڕی عبد یالیل بوون ئەوانیش (خالد و اساس و عاقل و عـامر) بوون، لەمان (معوذ و معاذ و عاقل) لە جەنگی بەدر شـەهیدکران.

پێغەمبـەری خوا ﷺ کاتێك بیسـتی ئەبوجـەهل (نـەفرەتی خـوای لێبێـت) کـوژراوە فەرمووی:-

(هــەر ئومــەتێك فیــرعەونێکی هەیــە، بەڕاســتی فیــرعەونی ئــەم ئوممەتــەش (ئەبوجـەهل)ە، خـوا بـە خراپتریـن شـێوە کوشـتی، کوڕەکـانی (عفـراء) کوشـتیان، فریشتەکان کوشتیان‌و، ئیبـن مەسـعود تەواوی کرد).

وا ڕیوایـەت دەکـەن کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەستی لەسـەر لاشـەی دوو کورەکـی (عفراء) داناو پاشان فەرمووی:-

(رحم الله ابني عفـراء في قتل فرعون هـذه الامة، ورأس الأمة الكفر)...

واتە:- (ڕەحمەتی خوا لەسـەر دوو کوڕەکـەی (عفراء) بێـت، ئەم دوانـە هاوبەشـن لـە کوشـتنی فیرعەونی ئەم ئوممەتەو ، سـەری سـەرانی کوفر).

فەرمووی:- فریشـتەکان‌و، کوڕی مەسعود بەڕاستی هاوبەش بوون لە کوشتنی).

ئەوەی جێگای گومان نیە فریشـتەکان بەشداریان کردووە لە جەنگی بەدر، بۆ ئـەوەی دڵی بڕواداران زیاتر دڵنیا بکەنەوەو، زیاتر خۆڕگریان بکـەن، بەم جۆرە بڕواداران زیـاتر بڕواییان بە تین دەبوو، زیاتر هێرشیان دەبرد بۆ سـەر دوژمن، بیسـت کـەس بەرامبـەر دووسەد لە دوژمنان جەنگیان دەکرد، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت:-

﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ ﴾
(الانفال ٦٥)

خواى گەورە بە ئاشكرا لە قورئانى پيرۆز ڕوونى كردۆتەوە بە بەشداريكردنى فريشتەكان لە جەنگى بەدر، هەروەك لە سورەتى (الانفال) دەفەرموويت:-

﴿ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ (الانفال ١٢)

يەكيك لەم شتە سەرسورهينەرانە ئەوەيە عەوف كوڕى (عفراء)- لە جەنگى بەدر- ديتە لاى پيغەمبەرى خوا ﷺ پرسيارى ليكردو گووتى:-

ئەى پيغەمبەرى خوا، بەندە بە چ شتيك پەروەردگار بە پيكەنين دينيت؟

پيكەنين بۆ خواى گەورە ئاماژە بۆ ڕەزامەندى خوا دەكات، وا ڕيوايەت دەكەن پيغەمبەرى خوا ﷺ لەسەر گۆڕى طەلحەى كوڕى براءى كوڕى عومەيرى بلوى ئەنصارى وەستابوو و فەرمووى:-

((اللهم ألق طلحه وانت تضحك اليه، وهو يضحك اليك))..

واتە:- خودايە بگە بە طەلحە و تۆ پێى پيبكەنە ئەويش پيت پيبكەنێ)... واتە چۆن دوو خۆشەويست دەگەن بە يەك و پيك پيدەكەنن بە هۆى لە يەكتر ڕازى بوونيان و يەكتر خۆشويستنيان.

پيغەمبەر ﷺ دەفەرموويت:- (( ثلاثة يضحك الله تعالى إليهم يوم القيامة: رجل قام من الليل، والقوم إذا صفُّوا للقتال، والقوم اذا صفوا للصلاة)).

واتە:- سێ كەس خواى گەورە ڕۆژى قيامەت پێيان پێ دەكەنيت: (پياويك هەلسيت بۆ شەونويژ، كۆمەليك ڕيز بن بۆ جەنگ، كۆمەليك ڕيز بن بۆ نويژ). هەروەها دەفەرموويت:- ((إن الله يضحك الى إثنين: رجل قام من جوف الليل فتوضا وصلى، ورجل كان مع قوم فلقوا العدو فانهزموا، وحمل عليهم، فالله يضحك اليه)

واتە:- خودا گەورە بە دوو كەس پيدەكەنيت، پياويك لە نيوەشەو هەلسيتەوەو دەستنويژ بشواو نويژ بكات، وە پياويك لەگەل كۆمەليك بيت بە دوژمن بگەن و بشكين، ئەويش بەرەنگاريان ببيتەوە، جا خوا پێى پيدەكەنيت).

بە پيغەمبەريان گووت ﷺ: چ شەهيديك لە هەموو شەهيدان باشترە؟ ئەويش فەرمووى:-

((الذين يُلقون في الصف، ولا يلفتون وجوهم حتى يُقتلوا، اولئك الذين يتلبطون في الغرف العُلى من الجنّة، يضحك إليهم ربّك، وإذا ضحك ربّك الى عبد في موطن فلا حساب عليه)).

واتە:- (ئەوانەن دەگەن بەڕیزی دوژمنان، ئاوڕ لە دواوەی خۆیان نادەنەوە تاکو دەکوژرێن، ئەوانە لە ژوورە بەرزەکانی بەهەشت درێژ دەبن و خۆیان هەڵگێڕو وەرگێر دەکەن، پەروەردگاریان پێیان پێدەکەنێت، ئەگەر پەروەردگاریش بە بەندەیەك پێبکەنێت لە جێگایەك ئەوا لێپرسینەوەیان لەسەر نیە).

کاتێك سەعدی کوڕی موعاذ مرد دایکی هاواری لێهەڵسا، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:- ((الا یرقأ دمعك، ویذهب حزنك، فإم إبنك أول من یضحك الله الیه)).

واتە:- ئایا فرمێسکت ووشك نابێتەوەو، خەمت ناڕوا، ئەگەر خوا یەکەم کەس بە کوڕەکەت پێبکەنێت.

ئینجا با بێینەوە سەر پرسیارەکەی عەوف کەوا لە پێغەمبەری کرد :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەندە بەچ شێك وادەکات پەروەردگار بە پێکەنین بێنێت؟

پێغەمبەر وەڵامی عەوف دەداتەوەو دەفەرموویت:-

((غمسه یده في العدو حساراً))...

واتە:- چوونە ناو ڕیزی دوژمنان بەبێ‌زرێ.

ئەوەبوو عەوف هەروەکو بڵێیت هۆشی لەسەرخۆ نەما بێت بە خێرایی زرێیەکەی لەبەرەخۆی کردەوەو هەروەکو بڵێیت پەرۆش بێت بۆئەوەی ئەم شەهادەتەی لەدەست نەچێت، پاشان پێشکەوت و جەنگی کرد تاکو بەخشسشی شەهادەتی پێبەخشرا (خوا لێی ڕازی بێت) .

ڕیوایەت دەکەن معوذ کوڕی عفراء کچێکی دەبێت بەناوی (الرّبَیّع) غەزای کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك دەڵێیت:- ئێمە غەزامان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ جا ئاومان دەدا بە موجاهیدان و خزمەتمان دەکردن و، کوژراو بریندارەکانمان دەگواستەوە بۆ مەدینە ئیتر بەم جۆرە کوڕەکانی (عفراء) گەورە بوون و پەروەردە بوون و بە قوربانی، ئیسلام و موسڵمانان هەتاهەتایە شانازیان پێوە دەکەن و دەیانکەن بە سەرمەشقی خۆیان هەروەها ئەم نەوانە پەندو دەرسێکی زۆریان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان جێهێشت.

ڕەزای خودا لە (عفراء) و لە کوڕەکانی (عفراء)، خوای گەورە بە یەکەوە لە بەهەشت کۆمانبکاتەوە آمین.




# سەلەمەی کوڕی هیشامی مەخرومی

## شەهیدی کۆچکردو

(٩٨)

# سەلەمەی کوڕی هیشامی مەخزومی

## شەهیدی کۆچکردو

بەڕاستی گەورەترین نیعمەتی خودای بەخشەر لەگەڵ بەندەکانی خۆی دەکات بریتیە لە نیعمەتی هیدایەت بۆ سەر ڕێگای هەق ڕێگای ئیسلام، ئەو ڕێگایەی سەرکەوتنی دونیاو قیامەتی تیایە هەروەکو خوای کاربەجێ دەفەرمووێت:

﴿ فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ (البقرة ٣٨)

وە هەروەها دەفەرمووێت:

﴿ فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ يَضِلُّ وَلاَ يَشْقَى ﴾ (طه ١٢٣)

هەر کاتێك تەزووی ئیمانیش ڕووی لە مرۆڤێك کرد ئەوا ئەم مرۆڤە پەیوەست دەکات بە گوێڕایەڵی پەروەردگارەکەی‌و، پاککردنەوەی دڵی‌و، دوورکەوتنەوە لە خراپەو، ئیتر لە دوای ئەم ساتەوە هەروەکو دوو جەمسەری موگناتیسی لە یەك چوو لەگەڵ گوناهـ ئاشنا نابێ‌و لێی دوور دەکەوێتەوە لەبەرئەوەی بەڕاستی ئەم مرۆڤە ڕووناکی دۆزیتەوە، ڕێگای خۆی ناسیوە، جارێکی‌تر مەحاڵە بەدوای کوێرە ڕێ‌و ڕێچکەکانی شەیتانەکان بکەوێت، ئیتر وەکو پەپولە چۆن بەدوای ڕوناکی دەکەوێت ئەگەر خۆشی لەسەر دانابێت ئەوا واز لەم ڕووناکیە ناهێنێت:- ((فماذا بعد الحق الا الضلال))؟!

هەروەها مافی خودا لەسەر هەموو مافێکە، هەروەك گەورەی ئادەمیزاد موحەممەد ﷺ دەفەرمووێ:- (( سێ شت هەر کەسێك لێی بێتەجێ ئەوا تامی ئیمان دەچێژێ: خوا و پێغەمبەرەکەی لە هەموو شتێك لەلا خۆشەویستتر بێت‌و، یەکێکی خۆش نەوێت تەنها بۆ خوا نەبێت، حەز نەکات بگەڕێتەوە بۆ سەر بێباوەڕی چۆن حەز ناکات فڕێ بدرێتەناو ئاگر)).

ئەڵبەتە مێژووش لە سەرەتای ئیسلام شاهیدە لەسەر ئەوەی ئەو کەسانەی لە دەوری پێغەمبەر ﷺ بوون، ئەوانەی خوای گەورە دڵی ڕووناك کردنەوە بە هیدایەت‌و، دەروونی ڕازاندنەوە بە تەقوا، بۆ خوا خەڵکیان خۆشویست، بۆ خوا ڕقیان لە خەڵك بووەو، هەروەها مافی بیروباوەڕیان لەسەر پەیوەندی خزمایەتی دانا، تاکو وای لێهات ئەی وا هەبوو دوژمنایەتی نزیکترین خۆشەویست‌و کەسوکاری خۆی دەکرد لە پێناوی پەروەردگارەکەی، لەبەرئەوەی مافی خوا لەسەر هەموو شتێکە.

هەروەها ئەو بڕوادارانە چەسپاو بوون لەسەر ڕێگای پەروەردگاریان و بە یەکەوە دەپاڕانەوە هەروەك فێرکرابوون:-

﴿ رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴾ (آل عمران ٨)

بەڵێ ئەم پیاوانە بە پاکی لەسەر پەیمانەکەیان مانەوەو، بۆ بەڵێنەکانیان بە وەفا بوون، تاکو بەڕێزو حورمەت بە پەروەردگاریان گەیشتن، بێباوەڕی دوورو نزیك کاری لێنەکردن هەروەکو پەروەردگار دەفەرموێ:-

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ﴾

(المائدة ١٠٥)

یەکێك لەم یاوەرە بەڕێزانە، تێکۆشەری کۆچکردووی ئارامگری شەهید:- باوکی هاشم سەلەمەی کوڕی هیشامی کوڕی موغەیرەی مەخزومی، ئەم یاوەرە کوڕە مامی قارەمانی مەزن و شمشێری خوا خالیدی کوڕی وەلید بوو -خوا لێیان ڕازی بێت-

* * *

مێژوو دەڵێت (سەلەمە لە چینی بەرزی یاوەرەکان و هەڵبژاردەکانە)، یەکێکە لە موسڵمانە سەرەتاکان، و هەروەها کوڕی مامیشی (خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغەیرە) لە یەك ساتدا بە یەکەوە بۆ ناو ئیسلام هاتن، هەروەها خوا کۆمەڵێکی تری لەگەڵ هیدایەت دان، لەگەڵ ئەمەشدا سەلەمە لە هۆزی نەوەی مەخزوم بوو-ئەم هۆزە هۆزێکی گەورە بوو شوێنێکی بەرزو ساماندای هەبوو-ئەم یاوەرە ئازارو ئەشکەنجەی لە پێناوی خوا هەڵبژارد بەسەر خۆشی و ڕابواردن لە پەنای هۆزو بنەماڵەکەی، بەم شێوەیە ئیمان دروست دەبێ و دەروونی لە دەروونە پاك و بێگەردەکان.

کاتێك ئازار لەسەری زۆر توند بوو لەگەڵ هاوڕێیە موسڵمانەکەی ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کۆچی کرد بۆ حەبەشە، پاش ماوەیەك گەڕایەوە بۆ مەککە لەگەڵ گەڕاوەکان، وا گومانیان بردبوو کەوا بارودۆخ موسڵمانان ڕەخساوە، جا هاوبەش پەیداکەرانی مەککە ئەوەبوو پەلاماریان بۆ ئەم گەڕاوە بێچارانە هێناو، بەندیان کردن و جۆرەها ئازاریان دان.

بەم جۆرە سەلەمەی کوڕی هیشام بۆ ماوەیەکی درێژ لە تاریکایی بەندیخانەی حکومەتە نەفامەکەی ئەبوجەهل مایەوە، ئیتر ئەمە حاڵیان بوو تاکو لەگەڵ موسڵمانان کۆچی کرد لە مەککە بۆ مەدینە.

پێغەمبەری خوا ﷺ -هەروەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیم هاتووە- لە قنوتەکانی نوێژ دوعای بۆ هیشام و هاوەڵە بەندکراوە بێچارەکانی دەکردو دەیفەرموو:- ((اللهم انج الوليد، وسلمة بن هشام، وعياش بن أبي ربيعة، والمستضعفين من المؤمنين، اللهم اشدد وطأتك على مُضَر، واجعلها عليهم سنين كسنيّ يوسف)).

واتە:- خودایە وەلیدی کوڕی وەلیدو سەلەمەی کوڕی هیشام، و عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعەو، بێچارەکان لە بڕواداران ڕزگار بکەیت، خودایە مەضەر بگریت بە توندی خۆت (واتە ریسوایان بکەیت)، قات و قڕیەکیان تووش بکەیت وەکو قاتوقڕی یوسف).

سەلەمە لەسەر ئەو ئازارانەی پێی دەگەیشت لە لایەن هاوبەش پەیداکەران ئارامی گرتو، بە هەموو ڕێگایەك هەوڵی ئەوەیان دا بیگێڕنەوە سەر ئاییني پێشووی لە ئیسلام پاشگەزی بکەنەوە، بەلاّم بۆ ئەم نیازە هیچ ڕێگایەکیان نەدۆزیەوە، هەرچەندە زۆر شتی دنیاییان پێشنیار کرد، بەلاّم سەلەمە ڕازی نەبو و وەرینەگرت، ئەوەبوو خزمایەتی و مافی هۆزایەتی و ڕێزی بنەماڵەیان بەیاد دەهێنایەوە، هەرچی سەلەمە بوو برایەتی ئیمان و مافی خودای بەسەر ئەمانە هەڵبژارد، هەروەکو بڵێیت بڵێ:-

أبي الاسلام ، لا أبَ لـي سـواه إذا إفْتَخـروا بِقَيـس او تَمـيـم

واتە:- باوکم تەنها ئیسلامە هیچ باوکی ترم نیە جگە لەو، ئەگەر شانازیش بکەن بە قەیس و تەمیم.

پاشان خوای گەورە دەرفەتی بۆ سەلەمە ڕەخساندو ڕزگاری بوو لە بەندیخانەو لەژێر دەستی ئەم ستەمکارانە، جا بە خێرایی دەستی بە کۆچکردن کرد بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەرەکەی، ئەمەش پاش جەنگی خەندەق بوو.

جا بەڕاستی پەلەی سەلەمە بۆ کۆچکردن بۆخواردنو خواردنەوەو، ڕابواردنو ڕمبازی نەبوو، بەڵکو بۆ هەڵگرتني چەك بوو، بوو بە موجاهید لە ڕێگای خوای گەورەو، پاش ماوەیەك دەرچوو بۆ جەنگی (مؤتە) ئەم جەنگەش لە جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتی کۆچی بوو، ئەم جەنگەش بە سەرکردایەتی سێ سەرکردە بوو کەوا یەك لە دوای یەك گیانی خۆیان لەسەر داناو شەهید دەبوون:- جەعفەری کوڕی ئەبو گالبو، زەیدی کوڕی حارپە و عبداللەی کوڕی ڕەواحە -خوا لێیان ڕازی بێت-، ئەم جەنگەی دەنگی یەکێك لەم شەهیدانەی تیا بەرز بۆوەو گووتی:-

يا حَبّذا الجنّةُ واقتـرابُها طَيّـبَـةً و بـارِداً شَرابُهـا

سەلەمەی کوڕی هیشام هەروەکو هاوەڵەکەی ئەوەی چەشتی ئەوەبوو چەشتی لە ماندووبوونو ناخۆشی، پاشان گەڕایەوە لەگەڵ ئەوانەی خالیدی کوڕی وەلید شمشێری خوا ڕزگاریکردن، بەلاّم نەك گەڕانەوەیەك بۆ حەسانەوەو پاڵدانەوە بەڵکو بۆ ئەوەی لە هەوڵو تێکۆشان بەردەوام بێت.

سەلەمە لەسەر ئەم حاڵە مایەوە تاکو پێغەمبەر ﷺ گەیشت بە پەروەردگاری، جاوەکو موجاهیدێك دەرچوو بۆشام لەم کاتەی ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) ڕووی سوپای ئیسلامی لە شام کرد، بۆ پاککردنەوەی خاکی ئیسلامی لە ستەمکارو گاغوتەکانیان.

سەلەمە جەنگی (اجنادین)ی بینی کەوا دوازدە شەوی خایاند لە جەمادی یەکەمی ساڵی سێزدەی کۆچی.

(اجنادين) شوێنێكی بەناوبانگە لە شام، لە ناوچەكانی فەلەستین، لەم شوێنەدا جەنگێكی بەناوبانگ لە نێوان موسڵمانان و ڕۆم ڕوویداوە، ڕۆم تێیدا سەد هەزار جەنگاوەر بوون، ئەوەبوو جەنگێكی یەكجار توند لە نێوانیان ڕوویدا، بەڵام خوای بەهێز موسڵمانانی سەرخستو، ژمارەیەكی زۆریان لە دوژمنەكانیان كوشتو ڕەوانەی دۆزەخیان كرد...

* * *

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت:- (هیرقل) پاشای ڕۆم كاتێك بە هەواڵی شكستی زانی ترس دایگرتو ڕایكرد.

(یاقوت) دەڵێت:- ( وانتهى خبر الواقعة الى هرقل، فَنُخِبَ قلبُهُ، و مُلىء رعباً، فَهَرَبَ من حمص الى انطاكية).

واتە:- (هەواڵی ئەم جەنگە گەیشت بە هیرقەل، جا دڵی ڕاچڵەكیو پڕبوو لە ترسو، لە (حمص) ڕایكرد بۆ انطاكیه).

پاش ئەوەی سەلەمەی كوڕی هیشام بەشداری جەنگی (اجنادین)ی كرد ئەوەی تووشی بوو لە ئازار تووشی بوو، پاشان لە دوای چەند مانگێك بەشداری جەنگی (مَرجَ الصُّفَر)ی كرد شەهید كرا دەیگووت:-

هل فارسٌ كَرِهَ النزالَ يُعيرُني رِمُحاً إذا نَزَلوا بِمَرجَ الصُّفَر

واتە:- ئایا سوارچاكێك هەیە شەڕ نەكاو چەكەكەی خۆی بدا بە من ئەگەر دوژمن گەیشت بە(مَرجَ الصُّفَر).

قارەمانمان سەلەمەی كوڕی هیشام لەم جەنگەدا شەڕێكی بێوێنەی كرد، تێیدا ئارامێكی مەزنی گرت، خوای گەورەش وا حەزی كرد ئەم یاوەرە هەڵبژاردەیە لە ڕیزی (رجال صدقوا ما عاهدوا الله.....) هەڵبژێرێ، بەوەی نیعمەتی شەهادەتی پێ ببەخشێ، لە مانگی موحەڕەمی ساڵی چواردەمینی كۆچی شەهید كراو، پاش ئەوەی ناوی تۆمار كرا لە لیستی وەفادارانو گیانبازان-خوای گەورە لە هەمووان ڕازی بێت-.

* * *

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەپاش ئەم هەموو شتە ئەوەیە دەبێت بزانین سەلەمەی كوڕی هیشامی مەخزومی، یاوەری بڕوادارو موجاهیدی قارەمانو كۆچكردووی بە ئارامو تێكۆشەری موجاهید برای ئەبوجەهل عەمری كوڕی هیشامی كوڕی موغەیرەی مەخزومی‌یە-نەفرەتی خوای لێ بێت-...

ئەو ئەبوجەهلەی کونیەی لە جاهیلیەت (ابو الحکم) بوو بەلام پێغەمبەر ﷺ ئەم کونیەی گۆڕی بە نازناوێك لە دوای ئەمە ناوبانگی پێ دەرکرد، ئەمەش (ئەبوجەهل) بوو، ئەو بێباوەڕی لە هەموو خەڵك زیاتر دوژمنایەتی ئیسلامی دەکردو ئازارو ئەشکەنجەی موسڵمانانی دەدا.

ئەبوجەهلی نەفرەت لێکراو لە جەنگی بەدر بەبێباوەڕی ڕەوانەی دۆزەخ کرا ئەمەش خراپترین چارەنووسی بوو.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەبوجەهلی بە کوژراوی بینی فەمووی:-

(قتل فرعون هذه الامة)!...

واتە:- فیرعەونی ئەم ئوممەتە کوژرا!...

جا برای موسڵمان تەماشا بکەو پەند وەربگرە...

تەماشا بکە چۆن ئەم دوو برایە یەکێکیان ڕێگای هەق و هیدایەتی گرتو، جا سەرکەوتوو ڕزگاری بوو، بەلام براکەیتر بە ملهوڕی مایەوە لەسەر بێباوەڕی، خوای گەورەش بە گرتنی خۆی گرتیو، هەتاهەتایە ڕیسوای کرد.

خوای گەورە ڕاستی فەرمووە:-

﴿ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ ﴾ (الشوری ٧)

بەلام نێوانی ئەمو ئەو وەکو ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوایە:-

﴿ فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلاَلَةُ ﴾ (الاعراف ٣٠)

﴿ أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًا لاَ يَسْتَوُونَ ۞ أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلاً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۞ وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ ۞ وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ۞ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ ﴾

(السجدة ١٨-٢٢)

ئینجا برای موسڵمانم جوانترین ڕێگا بریتیە لە ڕێگای ئیمان، لەمەش جوانتر ئەوەیە ئەم ئیمانە بە کردەوەیەك بڕازێنەوە دڵسۆزیو چاکەی لەناو بێت، تاکو ئیمانێك دروست بێت: بە بیروباوەڕێکی پتەوو، کردەوەی چاكو، جیهادێك لە پێناوی خواو

﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (العنکبوت ٦٩)

لە کۆتاییدا لە خوا دەپاڕێینەوە ئیمانێکی پتەومان پێ ببەخشێ لە چەشنی ئیمانی سەلەمەو خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت لە بەهەشتی فیردەوس بەم شەهیدە کۆچکردووە سەربەرزەمان شاد بکات آمین والحمدلله رب العالمین.

(٩٩)

# ضـــراری کوڕی ئەزوەر

## شـەهیدێک کـــەوا هەڵبـــژاردەی موجاهیـــدان بوو

هەروەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان ماوەتەوە ((الجهاد ماض الی یـوم القیامـة)) واتـە:- جیـهاد دەمێنـێ تـاکو ڕۆژی قیامـەت، کەواتـە جیـهاد فـەرزێکی بەردەوامـەو نـابێت موسـڵمان سسـتی لـێبکات، هـەروەها موسـڵمانان شـێوەی کارپێکردنیان بە جیهاد جیاوازە، ئی وایان هەیە کاتێك بانگ دەکرێت بۆ جیهاد بێ سێ و دوو وەڵام دەداتەوەو کاتێك دەکەوێتە ناو جەنگ ڕاست دەکاو، بەڵام شتێك لەناو دەروونی خۆی دەمێنێتەوە کەوا دەفەرمووێت:

﴿ وَلاَ تُلقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (البقرة ١٩٥)

جۆرێکی‌تر لە موجاهیدان کاتێك دەچێتە ناو جەنگ، بەڕاستی ژیان‌و مردنی لەلا یەکسان دەبێت بە پاڵپشتی فەرموودەی خوا :

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ (البقرة ٢٠٧)

لەبەرئەوە کاتێك دەکەوتە ناو جەنگ خۆیان دەهاوێنە شوێنێك کە تیایدا گوللەو تۆپ بە یەکتـر دەکەونـەوە یـاخود بـە اصطلاحی کۆن شـمشـێر بە یەکتـری دەکەون‌و تـا لـە ئەنجامدا ئاگر لە شوێنی خۆیان بەجێدەهێڵن.

ئینجا یاوەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر هەموویان لە چینی سێهەمن‌و لەبەرئەوەی پێشـەوای موجاهیدان پێغەمبەری خوا ﷺ پێشـەوایەتی دەکردن، ژینی ئاخیرەتیان بە پێش ژیانی دونیا خستبوو، یاوەری موجاهیدی ماندوونەناسانەو قارەمانە بێوێنانە، ئەو جەنگاوەرە ئازایەی لە جاهیلیەت‌و ئیسلام، بەڕاستی مرۆڤیش ماددەیەکی خاوەو، هەڵبـژاردەمان لـە جاهیلیـەت هەڵبژاردیـە لـە ئیسـلام، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی.

بەڵکو ئەم یاوەرە هەڵبژاردەی ئەم بنەماڵەیە بوو کەوا خووی بە جەنگ‌و تێکۆشانەوە گرتبوو، باوك‌و باپیـری لـە گۆڕەپـان مـردن‌و، ئـەم یـاوەرە شاعیـرێکی وابـو دەیتوانـی ئازایـەتی‌و سوارچاکیەکەی خۆی بە شـیعر بهۆنێتـەوە، لەگەڵ ئـەوەی قارەمـان بـوو لـە بەکارهێنانی شـمشێرەکەی، قارەمانیش بوو لە دەربڕین‌و قسـەکردن.

تـا گەیشتـە پلەیـەکی وا شـمشـێری خـوا (خـالیدی کـوڕی وەلیـد) لەسـەر خۆڕاگـری (ضیـراری کوڕی ئەزوەر) ویسامێکی ئازایەتی پێببەخشێت ئەم ووتە بەهێزەی دەرهەق فەرموو:-

(إني اعرف رجلاً لا يَخافُ الموتَ، خبيراً بلقاء الرّجال، هو ضرار إبن الأزور).
واته:- بەڕاستی من پیاوێك دەناسم لە مردن ناترسێ، بلیمەتە لە گەیشتنی بە پیاوان، ئەویش(ضیراری کوڕی ئەزوەر)ە.

* * *

کاتێك شەڕو ناکۆکی و بەیەکدادان لە نێوان موسڵمانان و ڕۆم توندتر بوو لە (اجنادين)و، خالیدیش خەریكو سەرقاڵی جەنگێکیتر بوو، ئەوەبوو بۆ ئەو مەبەستە (ضیراری کوڕی ئەزوەر)ی بۆ ئەم بەیەکدادانە لە جێگای خۆی داناو، پێی گووت:-
(إنني أريد ان أقدمك على خمسة الآف باعوا انفسهم لله عزّ وجل، واختاروا دار البقاء والآخرة على الاولى).
واتە:- بەڕاستی من دەمەوێت سەرکردایەتی پێنج هەزار کەست پێبسپێرم کە خۆیان فرۆشتووە بە خوای گەورە، ژیانی هەمیشەیی و ئاخیرەتیان هەڵبژاردووە بەسەر ژیانی دنیا.
(ضیراری کوڕی ئەزوەر) زۆر کەیف خۆش بوو بەم ووتەیە، بۆیە پەلەی کرد بۆ دەرچوون بە گەیشتنی بە دوژمنان، ئینجا بە خالیدی گوت:- (دَعْني أسْرِ وَحدي).
واتە:- لێم گەڕێ با بە تەنها بۆیان دەربچم.
بەڵام خالید دوایخست تاکو ئەو کەسانە کۆبکاتەوە بزانێت کێ لەگەڵی دەردەچێت، هەرچی (ضیراری کوڕی ئەزوەر)یش بوو تەماشای دەکرد سستی و دوو دڵی کاری ئەو نییە، هەروەها تامەزرۆی جیهادو خولیای عەشقی شەهیدی بە تەواوی خۆی چەسپاندبوو بەسەر دەروونیداو، خۆ خەریك کردنو چاوەڕێکردن نەیدەتوانی ئەو ببەستێتەوە هەروەك هەندێك کەس پێوەی بەند ببوون.
ئەوەبوو (ضیراری کوڕی ئەزوەر) بە تەنها ڕێگای مەیدانی گرتو دەیگووت:-
(مَنْ علم الله فيه خيراً ادرَكَني).. واتە:- ئەوەی خوای گەورە خێری پێوە ببینێت دەمگاتێ... هەروەکو بڵێیت ئەم ووتەیە نهێنیەکی سەرسوڕهێنەرو غەریبی بەخۆوە گرتبێت، جا موجاهیدە گیان لەسەردەستەکانیش ئەوانی ئیسلام چاوەڕێی نەکردنو هیوای دواڕۆژ بوون بە پەلەو بە خێرایی بەدوایدا ڕۆیشتن تاکو لە ڕێگا لە(بیت لهيا) پێك گەیشتن.
کاتێك موجاهیدان زۆر ژمارەی دوژمنیان بینی هەندێکیان ترسانو دوودڵ بوونو، بیریان لە گەڕانەوە کرد، بەڵام هەرچی سەرکردەی قارەمانی سوپا ضیرار بوو کەوا نەیدەزانی ترس مانای چییە ئەمەی ڕەت کردەوەو، بە چەسپاوی و خۆڕاگری بە دەنگێکی زوڵاڵ هاواری کردو گووتی:-

(والله لا ازال اضرب بسيفي في سبيل ربّي واتبع سبيل مَن اناب الى الله تعالى، ولا يراني الله مهزوماً، ولا اولّي الدبر).

واته:- سوێند بە خوا بەردەوام شمشێر دەوەشێنم لە ڕێگای پەروەردگارم، شوێنکەوتەی ڕێگای ئەوانە دەبم کەوا شوێنکەوتەی ڕێگای خوای گەورە، خواش نە بە شکستی دەمبینیو، نە بە پشت هەڵکردن، ضیرار ئەم ووشانەی دەربڕی (والله لا ازال اضرب بسيفي في سبيل ربّي...) بەرامبەر بە فەرموودەی خوای گەورە:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الانفال ٤٥)

هەروەکو بڵێی لە کاتی گوتنی ئەم ڕستەیەش:-

﴿ وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (لقمان ١٥)

ئەم ئایەتەمان بەیاد دەهێنێتەوە:

﴿ وَكَأَيِّنْ مِنْ نَبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ۞ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلاَّ أَنْ قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ۞ فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (ال عمران ١٤٦- ١٤٨)

هەروەکو بڵێت بەرامبەر ڕستەی: (ولا يراني الله مهزوماً، ولا اولّي الدبر).

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ ۞ وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴾ (الانفال ١٥-١٦)

ئەوەندەی نەبرد (ضیراری کوڕی ئەزوەر) ئەو ووشە هەقانەی وەك بروسکەنامە ئاشکرا کرد، بەبێ دوودڵیکردنو هاندەر بۆ خۆ بەکوشتدان، تاکو هاوڕێیەکی بوو بە پاڵپشتی بیروڕاکەی ئەمیش:- ڕافیعی کوڕی طائي بوو، لە دوای ئەمیش زۆر کەسیتریش پاڵپشتیان کردن، جا سینەی ضیرار جۆش دراو، ورەی هێناوەبەر موجاهیدانو، ڕوویان لە جەنگ کرد، لە ڕیزی هەرە پێشەوەشیان ضیرار بوو کەوا هاواری دەکرد بە تەکبیر لێدان، موجاهیدەکانیش بە یەك دەنگ لە دوای ئەو وەڵامیان دەدایەوەو، ڕابوون بەرەو گۆڕەپانی بەرخۆدانو بە مەبەستی ئەم دوو سەرکەوتنە:- یان سەرکەوتن یان شەهادەت.

ضیرار لە دەروونی خۆیدا بڕیاری دابوو سەرکردەی ڕۆم بکوژێت، کە ناوی (وَردان) بوو ئەگەر بە هەر ئەنجامێك بکات، جا ضیرار بەرەو ڕوو پەلاماریدا، هەر کەسێك

دەهاتە ڕێگای بە زەوی‌دا دەداو، ئەم ئایەتەی خوای گەورەی دەگووتەوە کەوا هاندەر بوو بۆ خۆڕاگری لە جیهاد:-
﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنيَانٌ مَرْصُوصٌ ﴾ (الصف ٤)
پاشان ئەم دوو دێرە شیعرەی دەگووتەوە:-

الموت حق، أين لي منه المفر | و جنّة الفردوس خير المستقر
هذا قتالي، فاشهدوا يا من حضر | وكل هذا في رضا ربّ البشر

ضیرار گەیشت بە هیوای خۆی‌و، بە ئامانج گەیشت، ئەوەبوو بە ڕمەکەی دەستی لێدانێکی وای بۆ سەرۆك (وَردان) کرد لە سینگی‌دا لە ئێسکی پشتی هاتە دەرەوەو، سەری ڕمەکە بە ئێسکەکانی شۆڕ بۆوە، کاتێك ضیرار هەوڵی دەرهێنانی ڕمەکەی‌دا لە لەشی دوژمنەکەی، کۆمەڵێك لە دوژمنەکانی پەلاماریان داو گرتیان‌و دیلیان کرد، پاش ئەم بەدیل گرتنە پشێوی کەوتە ناو ڕیزی مسوڵمانان تاکو وایان لێهات بیر لە پاشەکشە بکەنەوە.
بەڵام ڕافعی کوڕی عمیرەی طائي بە دەنگێکی بەرز گووتی:- ئەی خاوەنەکانی قورئان دەتانەوێت بۆ کوێ بچن؟ ئایا نەتانزانیوە هەر کەسێك پشت هەڵبکات لە دوژمن دەکەوێتە بەر تووڕەیی خوداو، هەروەها بەهەشت چەند دەرگایەکی هەیە ناکرێتەوە تەنها بۆ موجاهیدان نەبێت!! ئارام گرتن ئارام گرتن، بەهەشت بەهەشت... ئەی خاوەنەکانی قورئان، هێرش بەرنە سەر گاورە بەندەی بتەکان ئەوا ئێستامنیش پێشتان دەکەوم، ئەگەر هاتو هاوڕێکەتان بەدیل گیرا یان کوژرا خوا زیندووەو نامرێت خودا بە چاوی خۆی دەتانبینێ کەوا ناخەوێت).
هەروەکو بڵێت لەم کاتەدا قسەی ئیمامی ئەبوبەکری (خوا لێی ڕازی بێت) بەیاد هاتەوە دوای مردنی پێغەمبەر کاتێك موسڵمانان بەم کارەساتە تاسان:-
((ايها النّاس، مَنْ كانَ يَعْبُدُ محمداً فإن محمداً قد مات، وَمَن كانَ يَعْبُدُ فإنّ الله حي لا يَموت، وَما مَحمّد الاّ رسول قَدْ خَلَت مِن قَبْلِه الرسل، أفإن مات او قُتِلَ إنْقَلَبْتُم عَلى اعقابِكُمْ؟ وَمَنْ يَنْقَلِبْ على عَقبَيه فَلَنْ يَضرّ الله شَيئاً، وسيَجزي الشاكرين).
ئینجا موجاهیدان یەکیان گرتەوەو، گەڕانەوە بۆ جیهاد، پەلاماری دوژمنیان داو توانیان ضیرار ئازاد بکەن‌و لە دیلی ڕزگاری بکەن....

* * *

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە ضیرار خوشکێکی موجاهیدەی دەبێت بەناوی (خەولەی کچی ئەزوەر) ، ئەم ئافرەتە لە ئافرەتە ئازاکانی سەردەمی خۆی بوو، تاکو وای لێهاتبوو

نمونەی ئەو بە خالیدی کوڕی وەلید بهێننەوە، لە هێرش بردنی بۆ سەر دوژمنان، هەروەها زۆر داستانی هەیە سەبارەت بە فەتحی شام لەگەڵ شیعری بە پێز، ئەوەبوو لە کۆتایی خەلافەتی ئیمامی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) لە ساڵی سی و پێنج کۆچیدوایی کرد.

کاتێك (خەولە) زانی کە براکەی (ضیرار) گیراوەو دیلە لای بێباوەڕەکان، خۆی ئامادەکردو لەگەڵ کەتیبەیەك دەرچوو بۆ ئازادکردنی ضیرار لە دەستی دوژمن، ئەم کەتیبەیە بە سەرکردایەتی رافعی کوڕی عومەیرەی موجاهیدی مەزن بوو، خەولەش لەم جەنگە بەشداری کردو، پەلاماری دوژمنیدا، چەندەها بێباوەڕی کوشت، تاکو هەندێك لە موجاهیدان وا گومانیان دەبرد کە ئەوە ئەو نییەو یەکێکە لەم پیاوە قارەمانانەی کە پێشتر لەوێ بوون، بۆیە کە گەڕایەوە سوێندیان خوارد دەبێ، دەمامکی خۆی بۆیان بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەم قارەمانە کێیە، ئینجا پێی گووتن:- من خەولەی کچی ئەزوەرم، بەوەم زانیوە کە براکەم بە دیل گیراوە، بۆیە بە ئەسپەکەم هاتمە دەرەوەو، شمشێرم بە دەستەوەیە بۆ سەرکەوتنی ئاینی پەروەردگارم و، ئازادکردنی براکەم لە دیلی.

ئەم کەتیبە توانیان قارەمانی بە دیل گیراو لە دیلی ڕزگار بکەن بۆ ئەوەی دووبارە بگەڕێتەوە گۆڕەپانی جیهاد.

ضیرار ئامادەی جەنگی یەرموك بوو تێیدا قارەمانێکی بێوێنە بوو، هەروەها ئامادەی جەنگی یەمامە بوو دوبارە نموونەی بەرخۆدان و ئازایەتی بوو، تاکو لەم جەنگە قاچی بڕایەوە، لەگەڵ ئەمەش وازی لە جەنگ نەهێنا، وایلیهات لەسەر چۆك شەڕی دەکردو جیهادی دەکرد لە ڕێگای خوا، ولاغەکان بە سەریدا بازیان ئەداو ئەمیش گوێی پێنەدەدا، تاکو بە هۆی ئێشی زامداری لە ساڵی یازدەی کۆچی بە شەهیدی گەیشتە پەروەردگاری، پاش ئەوەی بە خوێنی پاکی ئاڵی مەزنترین لاپەڕەی لە ئازایەتی و سوارچاکی تۆمارکردو، بۆ ئەوەی شانازی پێوە بکات بەرامبەر پەروەردگاری کە دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴾ (الحجرات ١٥).

سەلامی خوا لە هەڵبژاردەی موجاهیدان و سەرکردەی قارەمان و دڵسۆز (ضیراری کوڕی ئەزوەر) لە کۆتاییدا لە خوا دەپاڕێینەوە حەشرمان لەگەڵ ئەم موجاهیدانە بێ و خودا هەندێك لە ئازایەتی و دڵسۆزی ئەم یاوەرەمان پێ ببەخشێت ... آمین.

(١٠٠)

# ئەسـەدی کوڕی زوراره

## یەکـەم کەس لە ئەنصـار کە موسـڵمان بوو

پێش هاتنی پێغەمبەر بۆ (یەثریب) بوو بە شانۆگەریەك لە شانۆگەریەکانی تەمسیلی جولەکە، هەر یەکێك لـە هۆزەکانی ئـەوس‌و خـەزرەج هەڵدەسـتا بـە گـێڕانی ئەورێکـی تەمسیلی کەوا بیـری جولەکەی فێڵبـاز نەخشـەی بۆ دەکێشـاو لەسەر داری شـانۆکە پێشکەشی دەکرد.

هەروەها هەردوو هۆزی ئەوس‌و خەزەرج گەورەترین ڕێژەیان پێك دەهێنا لەبارەی زۆری دانیشتوانەوە، هەرچی جولەکەی (بني النضير) و (بنی قريظة) و (بني قينقاع) بوو ژمارەیەکی کەمیان پێك دەهێنا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زەویان پڕکردبوو لە موڵك‌و ماڵ.

ئینجا جولەکە لە یەکڕیزی و تەبایی ئەوس‌و خەزرەج دەترسـاو هەموو کاتێك تۆی ناکۆکی‌و دوژمنایەتی لە نێوان هەردوو چیـن دەچاندو ناکۆکی دەخسـتە نێوانیـان‌و، پاڵی پێوەدەنان بۆ ئەوەی جەنگی یەکتر بکەن.

بەم جۆرە شەڕێکی یەکجار زۆر لە نێوانیان ڕوویدەدا کە ببووە هۆی زۆر ئەوە لەناو ببات‌و دەست بەسەر موڵك‌و ماڵی یەکتردا بگرن.

جولەکـە شـانازیان بەسـەر ئـەوس‌و خـەزرەج دەکـرد خۆیـان بـە گـەورەتر دەزانـی لەبەرئەوەی ئەوان خاوەنی نامەی ئاسمانین‌و، هەرچی ئەوان تا ئەو کاتە بەندەی بت‌و شوێنکەوتووی ئەم خوا دەستکردانەن....

بەڕاستی ئەم بیروباوەڕەش سەبارەت بە ڕاستی‌و ناڕاستی جێگای خەمێکی گەورە بوو لە لایەن ئەوس‌و خەزرەجەوە...

هەر کە (ئەسـعەدی کوڕی زوراره)ی خەزرەجی گوێبیسـت بوو بـە پێغەمبەرایەتی خۆشەویستمان موحەممەد ﷺ لە شاری مەککەی پیـرۆز، لەم کاتەشدا نیازی وابوو بڕوات بۆ لای (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە) یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی قوڕەیش بۆ ئەوە هەندێك کاری لەگەڵ یەکلا بکاتەوە، بەڵام ئەوی جێهێشت‌و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە بڕوادارو موسڵمان.

هەروەکو بڵێیت دەروونی خۆی بینیبێتەوەو، پاش هـەژاری دەوڵەمەند بووبێ‌و، پاش ڕێگا لێ‌بزربوون ڕێگای ڕاستی دۆزیبێتەوە.

هەرکە گەڕایەوە (یەثریب) گۆڕانکاریەکی مەزن ڕوویدا لە ژیان‌و داهـاتوویدا چ لە ڕەنگ‌و چ لەڕوویدا...

بنەماڵەی ئەم یاوەرە بەرێزە (ئەسـعەدی کوڕی زورارەی کوڕی عودەسی کوڕی عوبەیدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی غەنەمی کوڕی مالیکی کوڕی نەججار) .

نازناوی:- باوکی ئامامە بوو.

دایکی ناوی فورەیعەی کچی رافع کوڕی موعاویەی خەزرەجی بوو.

کوڕی خاڵی-سەعدی کوڕی موعاذ- بوو (خوا لێی ڕازی بێت)...

ئەسعەد سێ کچی هەبوو بە ناوی:- (حبیبة و کبشة و فریعة) بوون هیچ کوڕێکی لەدوا بەجێنەما، هەر سێ کچیشی لە ئافرەتە موبایەعەدەرەکان بوون.

ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی میللەت و هۆزەکەی و بیروڕا پەسندو قسە ڕۆیشتوو بووو، بەرێزو بە هەیبەت بوو، لە لایەن هەموو کەس بە پێش دەیەخراو ڕێزی لێدەگیرا...

(خوبەیب کوڕی یساف) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

-ئەسـعەدی کوڕی زورارە و ذکوانی کوڕی عـەبدقیس ڕۆیشـتنە مەککە بۆ لای عوتبەی کوڕی ڕەبیعە.

-بۆ مەبەستی ئەوەی کارێکیان بۆ جێبەجێ بکات بە هۆی گەورەیی و جێگاو شوێنی و بیروڕا پەسندی.

جا گوێیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئەویش ئیسلامی پێشنیار کردن و قورئانی بۆ خوێندنەوە-ئەوەبوو نزیکی (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە) نەبوونەوە.

هەردووکیان گەڕانەوە مەدینە، جا ئەمانە بوون بە یەکەم کەس ئیسلامیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ مەدینە.

ئینجا بەڕاستی موسڵمان بوونی (ئەسـعەدی کوڕی زورارە) (خوا لێی ڕازی بێت) بەم جۆرە وامان لێدەکات بۆی بوەستین و بیری لێبکەینەوە... ئەمەش دەناسرێتەوە بە سێ سیفەتی دیار:- پاکی و ساکاری و خێرایی.

ئەوەبوو هاتنی ئەسعەد بۆ ناو ئیسلام کاتێکی درێژی نەبردو پێویستی نەکرد بە گفتوگۆ و هێنان و بردن یاخود لێکۆڵینەوەی مەنطقی و فەلسـەفی، بەڵکو ئیسلام هەروەکو چەقۆیەکی تیژ دڵی لەت کرد بەبێ ئەوەی تووشی کۆسپ و تەگەرە ببێت.

بەم جۆرە حاڵی زۆربەی موسڵمانانی تریش وەکو ئەم بوون.. جا دەبێت چ شتێك وابکات بەم شێوەیە بڕوا بهێنن بە پیر ئەم بانگەوە بێن؟؟

بێگومان ئەمە سروشتی ئادەمیزادە... سروشتی و عەقڵی و ویژدانی کەوا خوای گەورە مرۆڤی لەسەر بە سروش هێناوە.

ئەم سروشتەی یەکتاپەرستی وەردەگرێ، لەبەرئەوەی یەکەی یاسای گەونی بەڵگەیە لەسەر یەکەی ویستی هەڵسوڕێنەری ڕاستەوخۆ.

ئەم سروشتەی دادوەری وەردەگرێو ستەم وەرناگرێ، بڕواشی هەیە بە هەقو پوچەڵی ڕەفز دەکاتەوە، چاکە بە خۆوە دەگرێو گەمارۆی خراپە دەدات...

هەروەها ئەوەی لەیاد ناچێتو چاوپۆشی لێناکرێت ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) ئەوەیە پلەوپایەی لەناو موسڵمانان ، خۆی یەکەم کەس بوو میوانداری لە موصعەبی کوڕی عومەیر (خوا لێی ڕازی بێت) کرد کاتێك پێی نایە ناو مەدینەو خەڵکی بۆ لای خوا بانگ کرد، خەڵك چاویان ڕوون بۆوە بە بانگکردنیان بۆ سەر ئیسلام و، ئایینی نوێ.

بەڵێ ئەمە بوو لاپەڕەی یەکەمی ژیانی ئیسلامی ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) کەوا لە کەسیتر ئەم سیفەتانە نەدەهاتە جێ.

* * *

ئەمەش شتێکی بەڵگەنەویستە (ئەسعەدی کوڕی زورارە) پاش ئەوەی موسڵمان بوو، گەڕایەوە مەدینە دەبێت باسی ئەوە بکات بۆ خەڵك بەوەی گوێی لێبووە لە مەککە بە چاوی خۆی بینیویەتیو، داوایان لێبکات ئیمان بهێنن بەوەی خۆی ئیمانی پێهێناوە.

جا خەڵکانێکی کەم لە خەڵکی مەدینە بڕوایان پێکرد.

* * *

کاتێك ساڵێکی بەسەرداچوو (ئەسعەد) لەگەڵ یازدە کەس لەوانەی بڕوایان پێکردبوو موسڵمان ببوون ئەمانە بریتی بوون:- لە (عوف کوڕی حارث، و موعاذی کوڕی حارث، و دوو کوڕەکەی عفراء و، رافع کوڕی مالك کوڕی عەجلان و، ذکران کوڕی عەبدوقیس هاوڕێی لە دیداری یەکەمو، عوبادەی کوڕی صامت و، یەزیدی کوڕی ثەعلەبەو، عەباس کوڕی عوبادەو کوڕی نضلە، و عقبة کوڕی عامرو، قطبة کوڕی عامر و، أبو الهیثم کوڕی تیّهان و ، عوەیم کوڕی ساعدە).

عوبادەی کوڕی صامت (خوا لێی ڕازی بێت) قسە دەکاو دەڵێت:-

-من یەکێك بووم ئامادەبووم لە عەقەبەی یەکەمو، دوازدە پیاو بووین، موبایەعەمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەیعەی ئافرەتان، ئەمەش پێش ئەوەی جەنگ فەرز بکرێت، لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەینو، دزی نەکەینو، داوێن پیسی نەکەینو، منداڵەکانمان نەکوژینو، هەڵنەستین بە قسە هەڵبەستانێك لە نێو پێودەستەکانمانو، دەرگا لە چاکە نەگرین پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:-

-ئەگەر بەوەفا بن بۆی بەهەشت بۆ ئێوەیە، وە ئەگەر لەم کارەتان لابدەن ئەوا کارتان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، ئەگەر حەز بکات ئازارتان دەداو ئەگەر حەز بکات لێتان خۆش دەبێت- لە ڕیوایەتێکیتردا دەفەرموێت:-

- ئەگەر لەمە ترسان لە دونیا سنووورتان بۆ داناو تۆڵەتان بۆ کردەوە ئەمە دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانتان، ئەگەر شاردتانەوەش بۆ ڕۆژی دوایی کارتان بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە گەر حەز بکات لێتان خۆش دەبێت.

لەم کاتەدا (ئەسعەدی کوڕی زورارە) (خوا لێی ڕازی بێت) هەڵساو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ گرت و گووتی:-

ئەی خەڵکینە:- ئایا دەزانن لەسەر چی موبایەعەی موحەممەد دەکەن؟

ئێوە موبایەعەی دەکەن لەسەر ئەوەی جەنگ لەگەڵ عەرەب و عەجەم و جنۆکەو مرۆڤ و بە گشتی بکەن.

جا گوتیان:-

- ئێمە جەنگ لەگەڵ ئەوە دەکەین لەگەڵ بکاو، ئاشتیش لەگەڵ ئەوە دەکەین ئاشتی لەگەڵ بکات.

جا (ئەسعەدی کوڕی زورارە) گووتی:-

- ئەی پێغەمبەری خوا مەرجمان لەسەر دابنێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

- موبایەعەم دەدەن لەسەر ئەوەی شایەدی بدەن بێجگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نیەو، منیش پێغەمبەری خوام و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و فەرمانبەری گوێڕایەڵیشتان هەبێت و، کێشە مەکەن لەگەڵ کاربەدەستی لێهاتوو، بمپارێزن لەوەی ماڵ و منداڵی خۆتان لێ دەپارێزن.

گووتیان :-

- بەڵێ-ئەمە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ... جا بۆ ئێمە چی هەیە؟؟

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

- بەهەشت یان سەرکەوتن.

ئینجا لێرەدا دوو شتمان بەیاد دێتەوە:-

یەکەمیان:- ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) خەڵکەکەی لەگەڵیدان جۆشیان دەداو پێیان دەڵێت:- ئەی خەڵکینە، دەزانن لەسەر چی موبایەعە دەدەنە موحەممەد؟

جا (خوا لێی ڕازی بێت) هانیان دەدا لەسەر ئیمان هێنان بە خواو پێغەمبەرەکەی و، دووەم موبایەعەدان و، سێیەم جیهاد.

دووەمیان:- پاش ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکانی موبایەعەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێغەمبەری گووت:-

هذا لك يا رسولَ الله... فما لَنا؟

واتە:- ئەمە بۆ تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا ... ئەی چی بۆ ئێمە هەیە؟

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون:- الجنة أو النصر...

واتە:- بەهەشت یان بەختەوەری...

ئیتر بەم جۆرە ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) بە یەکێك لەم دوو سەرکەوتنە بێدەنگ بوو...

پێغەمبەری خوا ﷺ موصعەبی کوڕی عومەیری یەکەم بانگهێژ لە ئیسلام- لەگەڵ ئەم کۆمەڵە خەڵکە ناردو، فەرمانی پێکرد ئیسلامیان فێر بکاتو، قورئانیان بۆ بخوێنێو شارەزایان بکات لە ئایین لێرەدا (موصعەب) لە میوانداری (ئەسعەدی کوڕی زورارە) (خوا لێیان ڕازی بێت) دابەزی.

میوانداریش لەم ڕۆژگارەدا پێویستی بە گرانی ماددی بوو، ئەمانەش هەر هەموویان لەبەر چاوی ئەسعەد (خوا لێی ڕازی بێت) گچکە بوو، سەرکەوتن گەیشتن بە ئامانج بوو.

وە بە تایبەتی لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای مەدینە کەوا تێیدا عەشیرەت پەرستی حوکمی دەکرد سەرخستنی هۆزایەتی نێوان ئەوس‌و خەزرەج و ئەو جەنگە ماڵوێرانیەی کە لە نێوانیان دروست ببوو، هەر کاتێك شەیتان هەلی بۆ ڕەخسا بایە قۆچی تۆڵەی خۆی تیادا بەدیار دەخست. هەروەها لە ناوەندی کۆمەڵگایەك بازرگانی نیفاق تیایدا باوبوو لەگەڵ پیسیو فرتوفێڵی خراپترین ئادەمیزاد:- جولەکەی نەفرەت لێکراو.

جا میوانداری لەم کەشە پڕ بە ئاژاوەیە، وا چاوەڕوان دەکرێت لە خاوەنەکەی بەرگەی ئەم ماندووبوونە لێپرسراوەتیە بکات، بەڕاستی پیاوێکی وەکو ئەسعەدیش شایەنی ئەم کارە بوو.

موصعەب ساڵێکی تەواو لە مەدینە مایەوە خەڵکی فێر دەکردو بانگی دەکردن بۆ سەر ئیسلامو شارەزای دەکردن لە ئایین و بەڵگەی بۆ دەهێنایەوە، کاتێك ساڵێك بەسەریدا سوڕایەوە گەڕایەوە مەککە، مزگێنیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا ئەم کارەی پێی سپاردبوو لە مەدینە بەخێر و بەرەکەت تەواو بوو.

(ئەسعەدی کوڕی زورارە) ئەركو لێپرسراوەتی موصعەبی دەگرتە دەست، ئەگەر موصعەب نوێژی بە کۆمەڵی بۆ نەکردبان، هەندێکیان پێیان ناخۆش بوو یەکێکیتر پێشنوێژیان بۆ بکات بەڵام بۆ (ئەسعەدی کوڕی زورارە) هەموویان ڕازی دەبوونو ناکۆکی نەدەکەوتە نێوانیان.

(عبدالرحمن کوڕی کەعبی کوڕی مالك) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

-من چاوساغی باوکم بوو(واتە کەعبی کوڕی مالك)-کاتێك چاوەکانی لەدەست دابوو، کاتێك بچووبا بۆ جومعە لەگەڵی دەردەچووم، جا کاتێك گوێی لە بانگ دەبوو، دوعای لێخۆشبوونی بۆ (ئەسعەدی کوڕی زورارە) دەکرد.

(عبدالرحمن) دەڵێت:-

- ماوەیەك بەم شێوەیە مامەوە، هەركە گوێی لە بانگی جومعە دەبوو دوعای بۆ دەكردو، داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكرد، لە دڵی خۆما گووتم:- سوێند بە خوا ئەمە بەڕاستی بۆ ئێمە نەنگە، ئایا پرسیاری لێنەكەم؟:-
بۆچی كاتێك گوێی لە بانگی جومعە دەبێت دوعا بۆ باوكی ئومامە (ئەسعەدی كوڕی زورارە) دەكات؟
جا ڕۆژێكیان دەرچووین بۆ ڕۆژی جومعە هەروەك دەردەچووین، كاتێك گوێی لە بانگی جومعە بوو دوعاو داوای لێخۆشبوونی بۆ كرد، پێم گووت:-
- ئەی باوكە چیتە هەر كە گوێت لە بانگی جومعە بوو دوعا بۆ باوكی ئومامە دەكەیت؟
ئەویش گووتی:-
- ئەی كوڕم، (ئەسعەدی كوڕی زورارە) یەكەم كەس بوو كۆیكردینەوە لە مەدینە (واتە نوێژی جومعەی بۆ كردین) لە (هَـزْم النبیت) لە زورگی (بنی بیاضـه) پێیان دەگووت:- نقیـع الخضـمات.
(عبدالرحمن) پێی گووت:-
- ئەم ڕۆژگارە ئێوە چەند بوون؟
كەعب گووتی:- چل پیاو بووین.
(ئەسعەدی كوڕی زورارە) (خوا لێی ڕازی بێت) دوو برادەری خۆشەویستی هەبوو لەگەڵی بوون بە موسڵمان و شوێنی ڕێگای موسڵمانان كەوتبوون ئەمانەش(عمارة كوڕی حزم)و (عوف كوڕی عفراء) بوون، لەگەڵیان كۆمەڵێكی دروست كردبوو، بە شەو دەرچوون پەلاماری بتەكانی بەنی مالك كوڕی نەجاریان دەدا جا دەیانشكاند، یان سەرنخوونیان دەكردەوە، یان ناشیرینیان دەكردن.
پاشان ئەم كارانەیان بە ڕۆژ هەڵدەقۆستەوەو دەبووە جێگای نوكتەو گاڵتە بە خواكانیان كەوا ناتوانن ئەم ئازارە لەسەرخۆیان لابدەن، ئەمەش كاری دەكردە سەری بیری خەڵكو دەرونیان، بتو سەنەمەكانیان لەپێش چاو سووك دەكردن.
لەگەڵ ئەوەی (خوا لێی ڕازی بێت) لەكاتی ئامادە نەبووانی موصعەب پێشنوێژی دەكرد بۆ خەڵكی مەدینە لە موسڵمانان، بانگهێژی سەركەوتوو و شارەزا ئایینێكی چاك بوو.
(النّوار) دایكی (زەید كوڕی ثابت) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:-
بینیم (ئەسعەدی كوڕی زورارە) پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا پێ بنێتە مەدینە، نوێژە فەرزەكانی بۆ خەڵك دەكرد لە مزگەوتەكەی كەوا دروستی كردبوو لە (مـربەد) لە دەشتایی (ابني رافع) لە نەوەی مالك كوڕی نەجاڕ.
نەوار دەڵێت:-

دەڕوانمە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك هاتە ناو مەدینە، نوێژی لەناو ئەم مزگەوتە کردو دایمەزراند، جا ئەم مزگەوتە مزگەوتەکەی ئەمڕۆیە.

کەواتە ئەم مزگەوتە ئەو مزگەوتەیە خوا دەرهەقی فەرموویەتی:-

﴿ لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ ﴾ (التوبة ١٠٨)

(ئەسعەدی کوڕی زوراره) (خوا لێی ڕازی بێت) بەشداری دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ کرد، هەروەها لە دارشتنی کۆمەڵایەتی بۆ خەڵکی مەدینەو، بە یەکگەیاندنەوەی هەردوو هۆزە گەورەکەو، برایەتی خستنە نێوان موهاجیرو ئەنصار.

جا (ئەسعەدی کوڕی زوراره) جەنگی شمشێری نەکرد بەڵکو جەنگی ووشەو بەڵگەو مەنطیق، هەروەها جەنگی ویژدانی زیندووو دەروونی بە ئاگای کرد، دەستی لەناو چاوی بێباوەڕیو هاوبەشپەیداکەران و ستەم دەنا!!

بەڵام پاش ئەوەی گەورەترین کاری ئەنجامدا لە مێژووی بانگهێژی ئیسلامی، خودا حەزی کرد بە دیدارو خۆشەویستەکەی بگات و ئەسعەدی سوارچاك لەسەر وڵاغەکەی کەوتە خوارەوە... یاوەری قارەمان بوو بە دیلی نەخۆشیو کەوتە سەر جێگا، برینێك لە قوڕگی پیرۆزی پەیدابوو و دەنگی کەوت، جا جولەکەی نەوەی مەیمون گاڵتەیان دەکردو دەیانگووت:-

- کوانێ موحەممەد ئەم کارەساتە لەسەر باوکی ئومامە لابدات؟

پێغەمبەری خوا ﷺ هات سەردانی باوکی ئومامە بکات لە ماڵی، ئەوەبوو پێیان گووت:-

- خوا جولەکەکان بکوژێت، دەڵێن بۆ ئەوەی لەسەر لانادات، لە کاتێك نە بۆ خۆیو نە بۆ ئەویش هیچی پێناکرێت، دەربارەی باوکی ئومامە لۆمەم نەکەن.

پاشان فەرمانی کرد برینەکە داغ بکەن، ئینجا قورگیان داغ کرد.

لێرەدا باوکی ئومامە هەستی بە نزیك بوونەوەی مەرگ کرد، جا وەسیەتی کچەکانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ڕەوانەی کردن بۆ ناو خێزانەکانی لەگەڵ خێزانەکانی پێغەمبەر دەسوڕانەوە لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ، خشڵیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا کە زێڕو مرواری تیابوو پێی دەگوترا:- گوارە، جا لەم گوارانە هەندێکی پێدان.

لە مانگی نۆی کۆچی (ئەسعەدی کوڕی زوراره) (خوا لێی ڕازی بێت) کۆچی دوایی کرد، ئەوەی نەجار هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گووتیان:-

- ئەی پێغەمبەری خوا ، پێشەنگمان کۆچی دواییکرد، جا پێشەنگێکمان بۆ دابنێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

- انا نقیبُکُمْ ... واتە:- من پێشەنگێکتانم.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی باوکی ئومامە ئامادەبوو و شوشتی و لە سێ کفنان کفنی کردو، نوێژی لەسەر کرد، لەگەڵ تەرمەکەی ڕۆیشت و لە بەقیع بە خاکیان سپارد.

هەروەك دەڵێت:- یەکەم کەسە لە ئەنصارەکان لە بەقیع بە خاك دەسپێردرێ هەروەها ( عثمان کوڕی مظعون) یەکەم کەس بوو لە موهاجیران لە بەقیع بە خاك سپێردرا.

ڕەزای خـــــودا لە یارەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەسعەدی کوڕی زورارە) قارەمانی گۆڕەپانی ورشەو بەڵگە ...

* * *

# نـــاوەڕۆك



**تاکو بەشی شەشەمی داستانی یاوەران بە خواتان دەسپێرم**


ژمارەی سـپاردنی ( ٣٥١ ) ی سـاڵی ١٩٩٧ ی دراوەتێ